# تەفسیری خاڵ



بە قەڵەمی

## شێخ محمدی خاڵ

جزمی بیستو حەوتەم

چاپی یەکەم

ساڵی ١٤١١ك - ١٩٩٠ ز

لە سەر ئەرکی خاوەنی کتێبخانەی ( هدی )
لە سلێمانی ، لە چاپ دراوە

# تەفسیری خاڵ

## بەقەڵەمی

## شێخ محمدی خاڵ

جزمی بیست و حەوتەم

چاپی یەکەم

ساڵی ١٤١١ك ـ ١٩٩٠ ز

لە سەر ئەرکی خاوەنی کتێبخانەی ( هدی )
لە سلێمانی ، لە چاپ دراوە



چاپخانەی: الحوادث.

# جزمی بیست‌و حەوتەم

## سوورەی (ذاریات)ە ،

## مەککی‌یە ، (٦٠) ئایەتە

## بسم الله الرحمن الرحيم

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

خوای گەورە لە زۆر شوێن سوێند ئەخوات بە هێندێ لە دروست کراوانی خۆی لە بەر ئەو هۆیانەی کە باسمان کردوون لە سوورەی «قەڵەم»و «نازعات»و «عادیات»دا •

خوا سوێندی خوارد بە قەڵەم لە سوورەی قەڵەمدا تا نیشان بدات کە قەڵەم گەورەترین بەهرەی خوایە بە سەر ئادەمی‌یەوە لە دوای بەهرەی زبان‌و کردن ، وە هەر کەسێك بە ڕاستی قەڵەم بە دەست بێ لە هەموو ئیش‌و کارێکیا لە پێشەوە ئەبێ •

سوێندی خوارد بە ئەستێرەکان لە سوورەی «نازعات»دا ، تا نیشان بدات کە هەڵاتن‌و ئاوابوون‌و هاتن‌و چوونیان بە سەر چەمەرەی خۆیانا بۆ قازانج‌و سوودی ئادەمی‌یە ، وە بۆ ئەوە دروست کراوون نەك بۆ ئەوەی کە بە خوایان بزانن‌و بیان‌پەرستن •

سوێندی خوارد بە بای ڕەوانەکراوی یەك لە سەر یەکی توندی قایمی بە هێز لە سوورەی «مرسلات»دا ، تا نیشان بدات کە ئەم جۆرە بـا بە هێزانە ـ با وەڕسیشتان بکەن ـ وە زەرەرو زیانیشتان لێ بدەن هێشتا بە جۆرێـکی تێـکرایی گەورەترین خزمەت ئەکەن لـە بڵاوکردنەوەی هەورو ، ناردنو ڕەوانە کردنی باران بۆ سەر وولاتانو ، متربە کردنی هەورو گیاو دارو درەخت لە یەکتریو ، بڵاوکردنەوەی تۆوی دەغڵو دانو گوڵو شینایی بە سەر زەویدا ، کـــە واتە ڕەوا نی‌یە کە بە پەیدا بوونی ئەو با بەهێزانە تووڕە بنو جنێوی پێ بدەن •

★ ★ ★

# سورة الذاريات

## بسم الله الرحمن الرحيم

وَالذَّارِيَاتِ ذَرْواً (١) فَالحَامِلاتِ وِقْراً (٢)

## سوورەی «ذاریات»ە ،

**مەککی‌یە ، (٦٠) ئایەتە**

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بەو بایانەی کە گەلێ شت بڵاو ئەکەنەوە بە بڵاو کردنەوە(١) ئنجا بە هەڵگرانی باری قورس‌و گران (٢)

---

ئنجا هەر وەك سوێندی خوارد بەم جۆرە بایانە لە سوورەی «مرسلات»دا کە ئەوی بەڵێنتان پێ دراوە ، لە هاتنی ڕۆژی دوایی‌و پاداش‌و تۆڵە دێتە دی ، لەم سوورەتەشدا هەر بەو جۆرە بایانە سوێند ئەخوات کە ئەوی بەڵێنتان پێ دراوە ، ڕاست‌و دروستەو دێتە ڕێتان ، فەرمووی (والذاريات ذروا) سوێند بەو بایانەی کە دانەوێڵەو تۆوو گەلێ شتی تر بڵاو ئەکەنەوە ، لە پاشا ئەوەندەی پێ ناچێ دوو شتی گرنگ پەیدا ئەبێ لە هەڵکردنی ئەو بایەدا :

یەکەم : ئەو هەورانەی کە بە ئاسمانەوە باری قورس‌و گرانی باران هەڵئەگرن ، وەکو ئەفەرموێ ( فالحاملات وقرا ) ئنجا سوێند بە هەڵگرانی باری گران ، واتە ئەو بایانە هەورێك پەیدا ئەکەن‌و ئەیخەنە

فَالجارِياتِ يُسْراً (٣) فالمُقَسِّماتِ اَمْراً (٤)

ئنجا بەو کەشتی‌یانەی کە بە ئاسانی بە سەر ئاوا ئەڕۆن (٣) ئنجا دابەشی شت ئەکەن بە سەر وڵاتانا (٤)

ڕێ کە بە ئاوی باران گران بارن ، وە بە هەزاران هەزار ․․ ملیۆن تەن باران هەڵ ئەڕێژن بە سەر وشکانیو زەویی دێمدا، وەزویی مردوو زیندوو ئەکەنەوە، بەم ڕەنگە دەغڵو دانو شینایی ئەڕوێنن، وە دارو درەخت تازە ئەکەنەوە، وە کانیو کاریزو چەمو ڕووبار ئەزێننەوە ․

دووهەم : ئەو کەشتیانەی کە بە سەر دەریادا هاتو چۆ ئەکەن زۆر بە ئاسانی ، وەکو ئەفەرموێ ( فالجاريات يسرا ) ئنجا سوێند بەو کەشتیانەی کە بە ئاسانی بە سەر ئاوا ئەڕۆن ، وە بە هەزاران هەزار ․․ ملیۆن تەن پێویستیانی ئادەمی لە ڕۆژ هەڵاتەوە بۆ ڕۆژئاوا ، وە لە ڕۆژئاواوە بۆ ڕۆژ هەڵات ئەبەن ․

ئەو هەورو ئەو کەشتیانە لە هاتنو چوونیانا خێرو بێر دابەش ئەکەن بە سەر وڵاتانا، وەکو ئەفەرموێ ( فالمقسمات امرا ) ئنجا بەو هەورانە باران دابەش ئەکەن بە سەر وڵاتانا، وە بەو کەشتیانە پێویستەکانی ئادەمی ئەهێنن لە وڵاتانی دوورەوە دابەشیان ئەکەن بە سەر مەردوماندا ․

چ خێرو بێرێك لە باران باشترو خۆشتر هەیە بۆ ئادەمی؟، کە خوا بە هۆی باری بەهێزەوە، بە کۆڵی‌هەور ئەی‌نێرێ بۆ شوێنی ووشكو

إنَّما توعَدونَ لَصادق (٥) وإنَّ الدينَ لَواقِعٌ (٦)

ئەوی بەڵێنتان پێدراوە ڕاستە (٥)وە پاداشی هەموو شتێك ئەبێت بە بێ گومان (٦)

تینوو، وە دەغڵو دانو دارو درەختو شینایی‌یان بۆ ئاو ئەدات، یا چی لەوە خۆشتر هەیە کە پێداویستەکانی ئادەمی لە هەموو جۆرە شتێك بە کەشتی بێتو دابەش بکرێ بە سەر مەردوماندا ، وە هەموو کەسێك بە قەد پێویستی خۆی بەهرەی لێ وەربگرێ •

واتە سوێند بەم چوار شتە گرنگانە ( انما توعدون ) ئەوی بەڵێنتان پێ دراوە لە هاتنی ڕۆژی دوایی‌و پرسینەوەو پاداش‌و تۆڵە ( لصادق ) ڕاستو دروستە،وە هەرچی گومان بێ تیایاندا نی‌یە ( وان الدين لواقع )وە بەڕاستی پاداشی هەموو کردەوەیەك ئەبێت بە بێ گومان، چاکەی بە چاکەو خراپەی بە خراپە •

لە پاش سوێند خواردن بە بای قایمی بەهێزو، بە هەوری بە باران‌و بە کەشتی سەر دەریاو،بە دابەش کەرانی خێرو بێر بەسەر وڵات مەردوماندا ئنجا سوێند ئەخوات بەو ئاسمانەی کە ڕێك خراوە، وە ئەستێرەکانی‌وەك تان‌و پۆ بە یەکا چوون ، یا وەك حەلقەی زرێ چەمەرەکانیان لە یەك هەڵکێشراوون‌و ، بە ناو یەکا ئەچن، بە ڕەنگێك کە هەر ئەستێرەیەك بە سەر چەمەرەی خۆیا هاتو چۆ ئەکات، بێ ئەوەی هیچ کامێکیان بە هیچ کامێکانا هەڵتەقێ،یا یەکێکیان بە هەناسەیەك پاش‌و

وَالسَّماءِ ذاتِ الحُبُكِ (٧) اِنَّكم لَفی قولٍ مختلف (٨)
يؤْفَكُ عَنهُ مَنْ أُفِكَ (٩) قُتِلَ الخَرّاصونَ (١٠)

سوێند بە ئاسمانی خاوەن چەمەرەی زۆر (٧) بە ڕاستی ئێوە لە گوفتارێکی تێکەڵو پێکەڵان (٨) ڕوو لە دین وەرئەگێڕێ ئەو کەسەی لە وانەبێ لێی لابدات (٩) نەفرین لەو درۆزنانە (١٠)

پێش بکەوێ، ئەفەرموێ : ( والسماء ذات الحبك ) سوێند بە ئاسمانی خاوەن ڕێگای زۆر، وەك چەمەرەی ئەستێرەکان بێ (انكم) بە ڕاستی ئێوە ئەی هاوبەش پەیدا کەرانی نادان ! ( لفی قول مختلف ) لە قسەیەکی وا دان دەربارەی خواو پێغەمبەرو قورئانو ڕۆژی دوایی، کە قسەکانتان هیچی بە سەر هیچەوە نی‌یە ، وە هەرگیز یەك ناگرنەوە ، بەم ڕەنگە لە کاتێکا کە ئەڵێن : خوا دروست‌کەری ئاسمانەکانو زەوی‌یە، کە چی بت ئەپەرستن، وە بە تەمای تکای بتەکانتانن لە ڕۆژی دواییدا . دەمێك بە محمد ئەڵێن : شاعیر، دەمێك ئەڵێن : جادووگەر ، دەمێك ئەڵێن شێت، دەمێك ئەڵێن : فاڵگرەوە ( کاهن ) ، دەمێك بە قورئان ئەڵێن : شیعرە، دەمێك ئەڵین : جادووە، دەمێك ئەڵێن، قسەی هیچو پووچی پێشینانە، دەمێك بە ڕۆژی دوایی ئەڵین : درۆیەو نی‌یە، دەمێکیش ئەڵێن : بتەکانمان لەو ڕۆژەدا لای خوا تکامان بۆ ئەکەن ، ئەمانە بەم جۆرە قسانە خۆشیانو زۆر کەسی تریشیان گومڕا کرد ، (یؤفك عنه من افك)، ڕوو لە دینو قورئان وەرئەگێڕێ ئەو کەسەی کە لەوانەبێ لە ئایینو قورئان لابدات، بە هۆی ئەم قسە هیچو بووچانەوە ( قتل الخراصون ) نەفرین لەو درۆزنانە

الذين هم في غَمْرَةٍ ساهونَ (١١) يَسأَلونَ أَيّانَ يَومُ الدين (١٢) يَوْمَ هُمْ عَلَى النّارِ يُفْتَنُونَ (١٣) ذوقوا فِتنَتَكُمْ ، هذا الذى كنتم بِهِ تَسْتَعجِلونَ (١٤) انَ المُتَّقينَ في جَنّاتٍ وَعيونٍ (١٥)

ئەوانەی کە لە گێژاوی گومڕایيدا نوقوم بوون (١١) (بە گاڵتەوە) ئەپرسن کەی ڕۆژی سزا ئەبێ ؟ (١٢) (سزا ئەدرێن) لە ڕۆژێکا کە ئەوان بە ئاگری دۆزەخ دەسووتێنرێن (١٣)، (وەپێیان ئەووترێ) : بچەژن سزای خۆتان، ئەمەیە ئەو ڕۆژەی کە بە گاڵتە پەلەتان لێ ئەکرد (١٤)، بەڕاستی پارێزگاران لە ناو باخاتو لە کەناری سەرچاوەهای ڕەوانان (١٥) .

( الذين هم في غمرة ساهون ) ئەوانەی کە لە گێژاوی گومڕایيدا نوقوم بوون، وە سەرسامو سەرگەردان ماوون ( يسألون ايان يوم الدين ) بە گاڵتەوە ئەپرسن : کەی ڕۆژی سزا ئەبێ ؟ وە کەی زیندوو ئەکرێنەوەو ئەخرێنە دۆزەخەوە ؟ .

ئنجا خوا وەڵامی ئەم پرسیارەیان ئەداتەوەو ئە فەرموێ : سزا ئەدرێن ( يوم هم على النار يفتنون ) لە ڕۆژێکا کە ئەوان بە ئاگری دۆزەخ ئەسووتێنرێن، وە بە سزای سەختی خۆیان ئەگەن، وە پێیان ئەووترێ ( ذوقوا فتنتكم ) بچەژن سزای خۆتان ( هذا الذى كنتم به تستعجلون ) ئەمەیە ئەو ڕۆژەی کە بە گاڵتەوە لە جیهانا داواتان ئەکردو پەلەتان لێ ئەکرد .

دوای ئەوەی باسی ئەحواڵی دۆزەخییانی کرد، ئنجا دێتە سەر باسی ئەحواڵی بەهەشتییان ئەفەرموێ : (ان المتقين في جنات وعيون) بە

آخِذينَ ما آتاهُمْ رَبُّهُمْ ، انَّهُمْ كانوا قَبْلَ ذلكَ مُحْسِنينَ (١٦) كانوا قَليلاً مِنَ اللَّيْلِ ما يَهْجَعونَ (١٧) وبِالأَسحارِ هُم يَستَغْفِرونَ (١٨) وفي أَموالِهِمْ حقٌ لِلسّائِلِ والمَحرومِ (١٩) .

ئەوەی کە خوا پێی داوون وەری ئەگرن، چونکە ئەوان بە ڕاستی لەوەپێش کاری باشیان کردووە (١٦)، لە شەوا کەم ئەنوستن (١٧) لە بەیاندا ئەوان داوای لێخۆشبوون ئەکەن (١٨)، وە لە دارایی‌یاندا بۆ (هەژاری) داواکەرو داوانەکەر مافی خۆیان هەیە (١٩) .

ڕاستی پارێزگاران لە ناو باخاتی بەهەشتو کەناری سەرچاوەهای ڕەوانان، واتە لە ناو باخاتی بەهەشتا ئەبن کە سەرچاوەی زۆریان تیایە ( اخذين ما اتاهم ربهم ) ئەو نازو بەهرانەی کە خوا پێی داوون ، زۆر بە سوپاسەوە وەری ئەگرن، ( انهم كانوا قبل ذلك محسنين ) چونکە ئەوان بە ڕاستی لەوەپێش، واتە لە جیهانا خێرەومەند بوون، وە کاری باشیان زۆر کردووە ( كانوا قليلا من الليل ما يهجعون ) لە شەوا کەمێك ئەنوستن، وە لە بەشی زۆریا خوا پەرستی‌یان ئەکردو لێی ئەپاڕانەوە تا دەمە دەمی بەیان، وەکو ئەفەرموێ : ( وبالاسحار هم يستغفرون )وە بەیانیان لەگەڵ شەبەقدا لە بارەگای خوا ئەپاڕانەوەو داوای لێخۆشبوونیان لێ ئەکرد .

ئەمە تا ئێستا باسی شەونوێژی چاکانو پارێزگاران بوو، ئنجا باسی بەخششو دەست گیرۆیی‌یان ئەکات بۆ هەژارانو ئەفەرموێ ( وفي اموالهم حق للسائل والمحروم ) لە دارایی چاکانو پارێزگارانا بەشی ئەو

وَفِي الأَرْضِ آيَاتٌ لِلْمُوقِنِينَ (٢٠)

وە لە زەویدا بەڵـگەی زۆر هـــەن ( لە سەر دەسەڵاتی خوا ) بۆ بڕواداران (٢٠) •

سواڵکەرانە هەیە کە داوا ئەکەن‌و ئەیاندرێتێ، وە بەشی ئەوانەش هەیە کە شەرم ئەکەن‌و، داوا ناکەن‌و هیچیان نادرێتی، واتە : بەشی هـــەردوو لایان دائەنێن، وە بەشەکـــەیان بـــە مافێـــکی پێویست ئەزانن لـــە دارایی‌یەکەیاندا •

★ ★ ★

لـەم چەند ئایەتی پێشووەدا باسی جێ‌گیر کردن (اثبات)ی ڕۆژی دوایی کرد، کە هاوبەش پەیداکەرەکان باوەڕیان پێ نەئەکرد، وە خـوا سوێندی لە سەر خوارد بە چەند شتێکی وا کە مەردوم ئەگەر باش لێیان ورد ببێتەوەو بڕوا بهێنێ بە ڕۆژی زینـدوو بوونەوەو دەسەڵاتی خوا بە سەریا، ئنجا لێرە دوو بەڵـگە نیشان ئەدات لـــە سەر بوونی خـۆی‌و ئاگاداری‌ی‌و دەسەڵاتی •

یەکەم : لە زەویدا وەکو ئەفەرموێ ( وفي الارض آيات للموقنين) لە زەویدا بەڵـگەی دەسەڵاتی خوا ئێجگار زۆرە بۆ بڕواداران •

ئەم ئەستێرەیەی کە ئێمـە بە سـەر پشتی‌یەوە ئەژین ـ کـــە پێی ئەڵێن زەوی ـ نیشانگایەکی ئێجگار زۆرە بۆ نیشانەی گەورەیی خـواو دەستکردە جوانەکانی، تا ئەم چـەند ساڵی دوایی‌یە لـــە دەستکردە

جوانەکانی خوا لە زەویدا شتێکی وامـان بۆ دەرنەکەوتبوو ، بەڵام لـە سایەی زانین و زانیاری‌یەوە ، لـــەم ساڵانی دوایی‌یەوە هـــەر ڕۆژەی شتێکی تازەمان بۆ دەرئەکەوێ هەر وەك ئەم نیشانـگا (معرض)یە وایە ، نیشانـگایەکی تر کـە لـە خـــودی خۆمانا پەنهانە، کـە ئەویش نەفسی ئادەمی‌یە، کە کۆگای هەموو جۆرە نهێنی‌یەکە، نەك هەر نهێنیی زەوی، بەڵـکو نەهێنی هەموو بوونەوەر .

ئەم زەوی‌یەی کە ئێمـەی بـــە سەرەوەین، وە ئامادەی ژیانە بۆ ئادەمی و گیانلەبەرانی‌ترو گوڵو گیـاو دارو درەخت، وە بە پێی زانینی ئێمـە تا ئەمڕۆ تاقانەیە لە ناو ئەم بوونەوەرە گەورە فراوانەدا کە پڕپڕە لە ڕۆژو ئەستێرە، وە ئەوی تا ئێستا بەرچاوی زانایانی ئاسمان کەوتبێ ، بە سەدەها ملیۆن کاکەشانە، کە هەر کاکەشانێکیش بـــە سەدەها ملیۆن ڕۆژی تێدایە، بێجگە لە مانگ‌و ئەستێرەی گەڕۆك کە بـە گردی ئـەو ڕۆژانەدا ئەسووڕێنەوە[1] کە بێ‌گومان ئەبێ هەزاران ئەوەندەی تریش بن‌و بەرچاو نەکەوتبن، وە لە مەولا ساڵ بە ساڵ، هەر ساڵـەی گۆشەیەکی نادیارمان بۆ دەرئەکەوون .

ئەم زەوی‌یەی کە وەك دایك کۆشی بۆ گرتوینەتەوە، بە زیندوێتی ئەمان‌گرێ بە سنگی‌یەوەو، بە مردوێتی ئەمان‌گرێتە ناو خۆی .

لە خۆیەوە بە ڕێکەوت وای لێ نەهاتووە، چونـکە بە هـەزاران هـەزار شتی وای ئەوێ کە ئەم ئادەمی‌یە بەم جۆرە لە سـەری بژین ،

(١) جزمی ٢٧ ، ل : (١٥) لە تەفسیری ( في ظلال القرآن ) .

ئەگەر بەشێك لەو شتانەی كە پێویستن بۆ ئەم ژیانە نەبوایە ، ئەم ژیانە نەئەبوو لە سەر زەوی، بەم ڕەنگە ئەگەر زەوی لەمە گەورەتر یا بچووكتر بوایە، یا لەمەی ئێستا نزیكتر یا دوورتر بوایە بە ڕۆژ، یا قەبارەی ڕۆژ لەمە گەورەتر یا بچووكتر بوایە، یا ڕۆژ لە ئێستا لەمە گەرمتر یا ساردتر بوایە، یا كلایی تەوەرەی زەوی نەبووایە، یا سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیدا، یا بە گردی ڕۆژدا خێراتر یا سستتر بووایە، یا قەبارەی مانگ گەورەتر یا بچووكتر یا دوورتر، یا نزیكتر بووایە، یا ئەندازەی دەریا یا ووشكانی لە ئێستا زۆرتر یا كەمتر بووایە .. یا .. یا تا هەزاران هەزار ڕێكەوتان (موافقات) لەوانەی كە ئەزانرێن و لە وانەی كە نازانرێن، لەوشتانەی كە دەخلیان هەیە لە گونجانی زەوی بۆ ژیانی ئادەمی .

لە پاشا ئەم خواردەمەنی و پێبژیوانەی كە لە زەوی دان بۆ گیانلەبەران، ئنجا لە سەر زەوی بن یا بە ئاسمانەوە بن، یا لەناو دەریاو ئاوا بن، یا لە ناو ئەشكەوت و شاخەكانیا بن، یا لە ناو درزو قەڵەشیا بن ؟ ئەم پێبژیوانەی كە ئامادەی خواردنن چ سادە «بسیط»و چ لێكدراو «مركب» وە ئامادەی دەركەوتن لە زۆر شێوەو وێنەدا بەشی هەموو گیانلەبەرێك ئەكەن، وە پێویستی هەموو لایەكیان بەجێ دێنن كە لە ژمارەدا نیین، هەر وەك خواردەمەنی یەكانیان لە ژمارە نایەن، ئەم خواردەمەنیانەی كە لە ناو زەویدان، یا لە توێكڵی سەرەوەی دەردێن ، یا بە ئاسمانی زەوی یەوەن، یا ئاو ئەیانبا، یا با ئەیانفڕێنێ، یا بە هۆی

تیشکەوە لە ڕۆژەوە بۆی دێ، لەوانەی کە هێندێکیان ئاشکرانو(١) وە هەندێ تریان نهێنینو چاو دەرکیان ناکات لە پانتایی ئـــەم زەوی یەداو لەقوولایی دەریاکاندا بە هەزاران هەزاران ـ بە هۆی ئامێری تازەوە ـ شتی جۆر بە جۆر ئەبینین، ئەگـــەر بیر بکەینەوە لـــە گـــەورەو بچووکی یانو، لە پەیداکردنی ڕوژیی یانو لە خواردنو خەویانو، لـە زاوزێ کردنیانو، لە ڕەحمو بەزەیی یان بەرامبەر بە بێچووەکانیانو بـە خێو کردنیان،وورد بوونەوە لەمانە جگە لە سەرسوڕماوی‌و دەستەپاچەیی نەبێ، هیچی ترمان لێ ناوەشێتەوە، جگە لەوە نەبێ کـــە ناچارین باوەڕ بهێنین بەو خوایەی کە ئەمانەی دروست کردووەو چاودێری یان ئەکات، هەر ئەندامێك کە لە لەشی گیانلەبەرێکی وەك فیلو گاو مرۆڤـــدایە ، هەر هەمان ئەندام بەهەمان کاریگەری یەوە لـــە لـــەشی میشوولەیەکی بچووکیشدا هەیە ، زۆر لە بێ‌بڕوایان هـــەیە بە چاوی خۆی ئەم شتانە دەبینێ‌و، بیرو هۆش‌و ژیری ناخاتە کارو بە سەریاندا تێ‌ئەپەڕێ‌و، بـــە لایەوە وایە تەبیعەت ئەم شتانەی دروست کردووە، لێی ئەپرسی تەبیعەت چی‌یەو چۆنە؟ وەلامێکت دەداتەوە سەروبنی نی‌یەو هیچ هێزو ڕۆحێکی زیندووی تێدانی‌یە، چونکە دەرگـــای مێشـــکیان بە کلیلی گوامڕایی داخراوەو زۆر دوورن لەحەقایقەوە •

ئەوانەی کە خۆیان بە ڕۆشنبیرو زاناو دانا ئەدەن لە قەڵەمو، لافـی زانین لێ ئەئەدەن :

یەکـــەم ئەگـــەر بـــە بیری بێ‌گەرد بڕوانـــە ئەو شتانەی

(١) لێرە بە دواوە تا دوو کەوانە بچووکەکەی دوایی لـــە نووسـینی خوالێخۆشبوو نی‌یە • (م)

وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ (٢١)

وە لە نەفسی خۆشتانا هەیە، ئایا وورد نابنەوە ؟ (٢١)

کە لە دەورو بەریاندایە بێ گومـــان چـــاریان نامێنێو لـــە کۆتایی ئەشتەکەیاندا سەری زەبوونی بۆ خـوا دائەنەوێنن‌و، دان بە خوایەتیی حـــوادا دەنێن، بـەڵام ئـــەم خوێندەوارانە هەرچــەند «(١) ئـەو شتانەی کـە لـە دەورو بەریـانە ، یا ئەوکەسـانە خوێندەواریش بن، وە گەواهنـــامەی دکتۆراشیان لـــە باخـــەڵدا بێ، چونـــکە ئەو خوێندەوارانە وەك خوا ئەفەرموێ : « یعلمون ظاهرا من الحیاة الدنیا(٢) بەڵام ڕاستی‌یەکەی نازانن، چونکە دەرگای دڵیان داخراوە، وە دەرگای دڵیش بە بێ کلیلی ئیمان‌و باوەڕ ناکرێتەوە •

دووهـــەم : لـەو ئادەمی‌یەی کـە بە سـەر زەویدا ئەڕوات وەکو ئەفەرموێ : ( وفي انفسكم ) لە خودی خۆتانا بەڵـــگەی ئاگـــاداریی‌و دەسەڵاتی خوا بۆ بڕواداران زۆرە ( افلا تبصرون ) ئایا نابینن؟ واتە بە چاوی پەند وورد بنەوە، وە نیشانەی زانین‌و ئاگاداریی خوا لە خۆتاندا بخوێننەوە •

بێ گومان ئەم ئادەمی‌یە لە زەویدا گەورەترین بەڵگەیە لـە سـەر

(١) لە دوو کەوانە بچووکەکەی پێشووەوە تا ئێرە لە وتەی خـــاڵی خوالێخۆشبوو نی‌یە، لـــە دەستنووسەکەدا دوو لاپەڕەی ناتەواو بوو، زورهەوڵماندا نەدۆزرانەوە (م)

(٢) واتە هەرشتی ئاشکرا ئەزانن لە زیندەگانیی جیهان •

بوونی خواو زانینیو ئاگاداریی، بەڵام ئادەمی خۆی بێ ئاگایە لە نرخی خۆیو ئەو نهێنیی‌یانەی کە لە خۆیایەتی کاتێك کە بڕوا لە دڵیا نەبێو، بێ بەشبێ لە بەهرەی بێ‌گومانی «یەقین» •

بەڕاستی ئادەمی گیاندارێکی زۆر سەیرە! چ لە ڕووی ڕێك‌خستنی جەستەو ئەندامی‌یەوە، چ لە ڕووی نهێنیی جەستەیەوە، هەر وەك زۆر سەیرە لە ڕووی دروست کردنی گیانیو نهێنیی نەفسیی‌یەوە •

لە کاتێکا کە ئادەمی بیر بکاتەوە لە نەفسی خۆی لووتو بزووت تووشی زۆر نهێنیی وا ئەبێ کە مەردوم تێیـــدا گێژو سەرسام ببێ، وەك داڕشتنی ئەندامەکانیو دابەش کردنیان بە سەر جەستەداو پیشەکانیانو شێوەی بە جێ هێنانی ئەم پیشانەو کردەوەی هـەرس کردن « هضم »و مژین « امتصاص »و هەناسەدانو سووتاندن • خولی خوێن لە دڵو دەمارا کۆ ئەندام « جهـازی »ی پەیی «عصبی»و ، یەك‌خستنیو بەڕێوەبردنی بۆ جەستەو گـــلان «غدة»و دەردان «افراز»یو پەیوەستی بە باڵا کردنی جەستەو بە چالاکی‌یەوەو، ڕێكو پێکیی ئەم کۆئەندامانەو یارمەتی دانیان بۆ یەکتریی‌و بە دەنگ یەکەوە چوونیان •

نهێنیی گیـــان لـە ژمارەدا نین ، پەی بە مەبەستێکی وورد چۆن ئەبرێ ؟ ڕێی ئەو پەی بردنە چی‌یە ؟ ئەو مەبەستانەی کـە پەی‌یان پـێ ئەبرێ چۆن هەڵئەگیرێن؟ وە لە کوێ هەڵ ئەگیرێن؟ وە چـۆن بیـر ئەکەونەوە؟ئەو شتە تا بیرت نەکەوتۆتەوە لەکوێ‌یە؟کە بیرت کەوتەوە لە کوێوە دێتەکوێ؟، وێنەی شتی بینراو چۆن چۆنی نەقش ئەبەستێ ؟ وە لە کوێدایە؟ وە چۆن هەڵئەگیرێ؟ وە چۆن کـــە بتەوێ ئامـــادەی

نەکەیت، وە چۆن دەی‌هێنیتەوە یاد؟ ئەمانە لەو شتانەی کە بەر یەکێك
ە هەست بکەوون، ئەی ئەوشتانەی بەر هەست ناکەوون؟ وە هێزیان بـە
دیمەن بۆ دانەنراوە، ئەوانە زۆرترو گەورەترن،شوێنەوار (ئاثار)یان ناو
بە نو دەرئەکەوێ لە هێندێ کاتی تایبەتی‌دا، وە زۆر شت لــەو دیوی
پەردەوە نیشان ئەدەن، لـە شتانی نەزانراوی، وونی، نادیار، وەك ئـەوی
کە زۆر جار مەردوم هەر لە خۆیەوە شتێك ئەکەوێتە دڵیەوە بە بێ هیچ
بەڵگەو سەرەتایەك کە چی ڕاستیش دەر ئەچێ •

لـە پاشا نهێنی ئـەم ئادەمی‌یە لـە بوونیاو لەو شتانەدا کە لە باوو
باپیرانو دایكو داپیرانی‌یەوە بە کەلەپوور بۆی دێ ئیجگار زۆرن، تاقە
بۆشەك«خلیه»ێك ئەم هەموو سەرمایەی تەحری ئادەمی‌یە هەڵئەگرێ،
وە لـە گـەڵ ئەوانەشدا سیفاتی باوكو دایكو باپیرانو داپیرانی نزیکی
خۆی هەڵئەگرێ، ئـەم سەرمایەو سیفەتانە لە ناو ئەو بۆشەکەدا چـۆنو
لە کوێدا هەڵگیراوون؟ وە چۆن لـە خۆیەوە ئەو ڕێگا دوورو درێژی
مێـــژوویی‌یە ئەدۆزێتەوە؟ وە موو بـــە موو بەراوردی ئەکـــات، وە
ئادەمی‌یەك بە هـەموو نهێنی‌یەکیەوە لـە نهێنی‌یەکانی ئاشکراو پەنهانی
ئەهێنێتە ڕوو بە بێ زیادو کەم •

بە ڕاستی وورد بوونەوەیەك لـەو کـاتەی کـــە منالْ لە دایـکی
ئەکەوێتە خوارەوە، وە پشت ئەبەستێ بە خۆی، وەڕێ ئەدرێ بـە دڵی‌و
بە سی‌یەکانی کـە بکەونە کارو، ژیان دەست پێ بکەن، ئاووڕدانەوەیەك
لەو کاتەدا بە لای ئەو منالەدا مەردوم سەرسام ئەکات، **وە دڵو** دەروون
بە چـــرای باوەڕ ڕووناك ئەکـــاتەوە، وە بە ئاوی بیرو باوەڕ پاك پاك

ئەیشواتەوە، هیچ دڵێك لەم ساتەدا ( بەرامبەر بەو دیمەنەـم ) خـــۆی ناگرێ، وە بە بڕوایەکی ڕاستەقینی‌یەوە سجدەیەك ئەباتە بەر بارەگـای خوای گەورەو مـەزن، با هیچ سەریشی دانەنەوێنێ، وە بە دیمـەن بە ڕوودا نەکـــەوێ(١) •

هەروا وورد بوونەوەیەك لەو کاتەی کە منالی ساوا پیت (حەرف) لە دەمی دەرئەچێو بابەو دایە ئەڵێو، قسە دەست پێ ئەکات، بەڵکو بەرانبەر بە قـسە کردن کـە زبان هەڵئەسووڕێنێ، وە هـەر پیتە لە شوێنی خۆیەوە ئەنێرێتە دەرەوە، بە یارمەتیی قوڕگەوە، شتێکی زۆر سەیرەو، ســـەر سووڕهێنەرە، چونـکە زۆرمان دیوە بۆیە نرخی لامان نەماوە(٢) بـەڵام تۆزێك لێ ووردبوونەوەی نرخەکەی تازە ئەکاتەوە، وە مەردوم سەرسام ئەکات، وە دەسەڵاتی خوای گەورەو مـەزن نیشان ئەدات • هەموو تاقە بەکێك لـەم ئادەمی‌یە لە ناو هەزاران هەزار ملیۆن ئادەمیی‌تردا عالەمێکە بۆ خۆی بە تەنیاو لە هیچ کەسێك ناچێ(٣) نە لـە شێوەو شکڵو، نە لـە زیریی‌و بیرو، نە لـە هەستو گیانو، نە لـە دەنگو ڕەنگو، نە لـــە نەقشی سـەر پەنجەکانیا، هەموو ئادەمی‌یەك لـەم عەنتیکەخانەی خوایەدا نموونەیەکی سـەر بەخۆیە بۆ خۆی، وە دەست نووسێکی تایبەتی‌یە کە

(١) مەبەستی ئەوەیە : سجدە بردن بۆ خوای گەورە یا بە دڵە ، وەیا بە سەر دانەواندنو بە ڕوودا کەوتنە (م) •

(٢) واتە : بۆیە زۆر سەرنجمان ڕاناکێشێ ، چونکە زۆرمـان دیـوە هەرچشتێك با لەو پەڕی جوانیشدا بێ کـــەزۆر بینرا نرخــی نامێنی (م) •

(٣) لە دەستنووسەکەدا نووسرابوو : « هیچ کەسـێك نـاچێ » مـن وشەی (لە)م تێهەڵکێش کرد (م) •

وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ (٢٢)

وە ڕۆزیی ئێوە لە گەڵ ئەو بەڵێنانەی کە پێتان دراوە لە ئاسمانە (٢٢)

وێنەی لە جیهانا نی‌یە، ئەم جۆرە شتانە لە ناو ئادەمیدا هەموو چـاوێك دەیان بینێ، ئنجا چـەندە بە چاو ئەبینرێن لـەم جۆرە شتە سـەیرانە، هەزاران ئەوەندەی تر هـەیە لە نهێنیی ئادەمی کە بە چاو نابینرێن •

قورئانی پیرۆز نایەوێ ئەم جۆرە شتانەمان بۆ هەڵبژێری، بـەڵام ئەیەوێ پەنجەیەك بەرێ بۆ دڵی مـەردوم تا بێداری بـکاتەوە بۆ سەیر کردنی ئەم مۆزەخانەیە کـە وا ڕانوێنراوە بۆ هەموو چاوو دڵێك کـە تەماشای بکاتو، لێی وورد ببێتەوە •

قورئان بەم جۆرە ئاماژانە ئەیەوێ ئادەمی سـەر لـە نوێ دروست بکاتەوە بە مەستێکی تازەو ژیانێکی تازەوە •

بە ئایەتی «وفي الارض••» ئاووڕێکی پێ داینەوە بە لای پیشانگای زەویدا، بـە ئایەتی «وفي انفسكم» ئاووڕی پێ‌داینەوە بە لای پیشانـگای نەفسا، ئنجا ئەیەوێ ئاووڕێکمان پێ بداتەوە بە لای پیشانـگای ئاسمانداو ئەفەرموێ ( وفي السماء رزقكم وما توعدون ) ڕۆزیی ئێوە لـە گـەڵ هەموو بەڵێنێکا کـە پێتان دراوە لە ئاسمانە، واتە هەر چەند ئێوە لە سەر پشتی زەوین، وە کسبو کارتان هـەر لـە سەر زەوی‌یە، بەڵام ئەبێ ئاسمانیشتان لـە بیر نەچێتەوە، وە هەر چاوتان لە زەوی نەبێ، چونـکە مایەی ڕۆزیتان ـ کـە مانگو ڕۆژو بارانە ـ لە ئاسمانە، بـەم ڕەنـگە

فَوَرَبِّ السَّماءِ وَالاَرضِ اِنَّهُ لَحَقٌ مِثلَ مَا اَنَّكم تَنْطِقونَ (٢٣)

بۆ پەروەردگاری ئاسمانو زەوی، ئەوی وترا (لە بابەت ڕۆژییو هاتنی ڕۆژی دوایی) ڕاستە بە وێنەی ئەو قسانەی کە ئەیکەن (٢٣)

ئەگەر مانگو ڕۆژ نەبوایە هەورو باران نە ئەبوو، کە ئەمانەش نەبوونایە هیچ لە سەر زەوی شین نە ئەبوو، وە ئەگەر مانگو ڕۆژ نەبوونایە هاتنو کشانەوە «مد وجزر»ی دەریا نەئەبوو، کە ئەمانەش نەبوونایە باخو باخاتو شینایی نەئەبوو، کە واتە هەرچی مایەی ڕۆژیتان هەیە هەمووی لە ئاسمانە، وە هەر وەك هەموو سەرنفیزتێکیشتان هەر لە ئاسمانەوە دێتە خوارەوە، وە پاداشی هەموو کردەوەیەکتان لە چاکەو لە خراپە هەر لە ئاسمانەوە دێ، کە واتە هەمیشە چاوتان لە قاپیی خواوە بێ، وە پەیوەستیی ناوەندی خۆتانو خواتان هەرگیز مەپسێنن •

لە دوای ئەم سێ ئامـاژەیە بۆ زەوییو بۆ نەفسو بۆ ئاسمان، ئنجا سوێند ئەخوات بە خۆی لە سەر ڕاستیی ئەم قسانەو ئەفەرموێ ( فورب السماء والارض ) سوێند بە پەروەردگاری ئاسمانو زەوی (انه) ئەوی ووترا لە بابەت ڕۆژییو ئەوی بەڵێنتان پێ دراوە لە هاتنی ڕۆژی دواییو پاداشو سزا ( لحق مثل ما انکم تنطقون ) ڕاستو دروستە بە وێنەی ئەو قسانەی کە تێوە لە گەڵ یەکتریدا ئەیکەن، واتە ئەو قسانەی کە خۆتان ئەیکەنو لە دەمتان دێتە دەرەوە، چەندە لە لاتان بێ گومانە، هاتنی ڕۆژی دواییش ئەوەندە بێ گومانە •

★ ★ ★

هـــل اتاكَ حَديثُ ضَيفِ ابراهيمَ المُكرَمينَ ؟ (٢٤) اذ دخلوا علَيهِ فقالوا سَلاماً ، قالَ سلامٌ ، قومٌ منكرونَ (٢٥) فراغَ الى اهلهِ

(ئەی محمد) ئایا داستانی میوانە بە ڕێزەکانی ئیبراهیم (پێغەمبەر)ت پێ گەیشتووە ؟ (٢٤) کاتێك کە چوونە لایو سڵاویان لێ کردو سڵاوی سەندنەوە، (وە لە دڵی خۆیا ووتی) : ئەمانە کەسانێکی نەناسراوون (٢٥) خێرا چوو بۆ لای خێزانەکەیو .

دوای ئەوەی کە نیشانەی گەورەییو دەسەڵاتی خۆی لە ئاسمانو زەویدا نیشاندا، کە ئەمانە نیشانەی تاكو تەنیایی خـوان، وە سوێندی خوارد کـە بەڵێنی خوا بە ڕۆژی دوایی، وە بە پاداشو سزای ئەو ڕۆژە ڕاستو بێگومانە، ئنجا باسی داستانی ئیبراهیم پێغەمبەرو گەلی «لووت»و «مووسا»و «عاد»و «ثمود»و «نوح» ئەکـــات زۆر بە کورتی، چونـکە بڕوایان بە پێغەمبەرەکان نەکرد، تا نیشانی بێ بڕواکانی مەککە بدات کە ئەو خوایەی گەلی ئەو پێغەمبەرانەی لە ناو برد، ئەتوانێ ئێوەش لـە ناو بەرێ فەرمووی (هل اتاك حديث ضيف ابراهيم المكرمين) ئەی پێغەمبەری خـوا ! ئایا داستانی میوانە بەڕێزەکانی پێغەمبەرتان پێ گەیشتووە؟ ( اذ دخلوا عليه ) کاتێك کە هاتنو چوون بۆ لای ئیبراهیم ( فقالوا سلامـــا ) وە سڵاویان کرد ( قال سلام ) ئەویش سڵاوی سەندنەوە، هـــەر چـەند لێیان وورد بۆوە نەیناسیین، وە لە دڵی خۆیدا ووتی ( قوم منـكرون ) ئەمانە مەردومێکی نەناسراوون، ئنجا دایناو بە خێر هاتنێکی گـــەرمو گوڕی کردن ( فراغ الى اهله )وە خێرا بە بێ چـــرپە چـــوو بۆ لای

فَجاءَ بِعِجْلٍ سَمينٍ (٢٦) فَقَرَّبَهُ اِلَيْهِمْ ، قالَ ألا تَأكُلُونَ ؟ (٢٧) فَأَوجَسَ مِنْهُمْ خيفَةً ، قالوا : لا تَخَفْ وَبَشَّروهُ بِغُلامٍ عَليمٍ (٢٨)

گوێرەکەیەکی قەڵەوی برژاوی بۆ هێنان (٢٦) وە لە بەر دەمیانا داینا (بەڵام دەستیان بۆ نەبرد)، پێی ووتن بۆ ناخۆن؟ (٢٧) ئنجا لێیان ترسا (چونکە بە دوژمنی زانین)، پێیان ووت : مەترسەو مژدەیان دایێ بە کوڕێکی دانا کە (ئیسحاق) بوو (٢٨) .

خێزانەکەی، وە پێی ووت : چەند میوانێکمان هاتوون، خێرا گوێرەکەیەکی قەڵەویان بۆ سەربڕین. وە ژنەکەی بۆی برژاندن‌و بۆی خستە سەر خوانێك‌و ئیبراهیم لە بەر دەمیاندا داینا وەکو ئەفەرموێ : ( فجاء بعجل سمين ) گوێرەکەیەکی قەڵەوی بە برژاویی بۆ هێنان ( فقربه اليهم )وە لە بەر دەمیانا دایناو لێی نزیك خستەوە، بەڵام کەسیان دەستیان بۆ نەبرد ( قال الا تأكلون )ووتی ئەوە بۆ ناخۆن؟ ئیبراهیم وا تێ گەیشت کە ئەمانە دوژمنن، وە بە دوژمنایەتی هاتوونەتە سەری، لە بەر ئەوە ترساو ڕەنگی تێك‌چوو، وەکو ئەفەرموێ ( فاوجس منهم خيفة ) ئنجا ئیبراهیم لەم زەلامانە ترسی لێ نیشت، کاتێك کە فریشتەکان زانییان ئیبراهیم ترسا ( قالوا لا تخف ) ووتیان مەترسە، ئێمە فریشتەین‌و خوا ناردووینی بۆ لای تۆ ( وبشروه بغلام عليم )وە مژدەیان دایە بە کوڕێکی زانای دانا لە (سارا)ی ژنی، کە ئیسحاقە، وەك لە سوورەی (هود)دا

فأقبلت امرأته في صرة ، فصكت وجهها وقالت : عجوز عقيم (٢٩) قالوا كذلك قال ربك ، انه هو الحكيم العليم (٣٠)

ژنەکەی قریوەیەکی کردو دای بە ڕوومەتی خۆیداو وتی : پیرەژنێکی نەزۆکم (٢٩) ووتیان : خوای تۆ وای فەرمووە کە ئەو بە مەسڵەحەتی خەڵق ئاگادارو بە حاڵی بەندەگان دانایە (٣٠) •

ئەفەرموێ : « فبشرناها باسحاق ومن وراء اسحاق يعقوب »[1] لە کاتێکا کە ئیبراهیم لە تەمەنی سەدساڵیو، سارەی ژنی لە تەمەنی (٩٩) ساڵیدا بوو، جگە لەوە کە سارا هەر لە سەرەتای شوو کردنیەوە هەر نەزۆك بووەو سکی نەکردووە، لە بەر ئەوە بە مژدەکە سەرسام بوو، وە بیری چووەوە کە ئەمانە فریشتەن‌و، خوا ناردوونی بۆ لای ئیبراهیم بۆ ئەوەی ئەم مژدەیەی پێ بگەیەنن، بۆیە سەرسوڕمانی خۆی نیشاندا، وە کوئەفەرموێ : ( فاقبلت امرأته في صرة ) (سارا)ی ژنی ـ کە وێستا بوو وە گوێی لە مژدەکەبوو ـ لە خۆشیانا ڕووی کردە فریشتەکان‌و بە قریوەیەکەوە ( فصكت وجهها ) بە هەردوو ڕوومەتی خۆیاماڵی ـ وەك دەستووری ژنان ـ ( وقالت عجوز عقيم ) ووتی پیرەژنێکی نەزۆکم، لە گەنجیدا سکم نەکردووە، ئێستا کە پیر بووم‌و لە حەیز وێستاومەتەوە چۆن سك ئەکەم؟ ( قالوا كذلك قال ربك ) ووتیان چۆنمان پێ ووتی خواش وای فەرمووە، نە گومانت بێ‌و نە سەریشت سوڕبمێنێ ( انه هو الحكيم العليم ) بێ‌گومان هەر خوایە کار دروست‌و دانا •

(١) واتە مژدەمان دا بە سارا بە کوڕێك کە ناوی ئیسحاقە ، وە دوای ئیسحاق بە یەعقوب •

قَالَ : فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ؟ (٣١) قالوا : اِنَّا أُرْسِلْنَا اِلٰى قَوْمٍ مُجْرِمِينَ (٣٢) لِنُرْسِلَ عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِنْ طِينٍ (٣٣) مُسَوَّمَةً عند رَبِّكَ للمسرفين (٣٤)

ئیبراهیم ووتی : کارتان چی‌یە ئەی ڕەوانەکراوەکانی خـوا؟ (٣١) ووتیان : ئێمە ڕەوانە کراوین بۆ سەر گەلی گوناهباران (٣٢) تا بارێنین بە سەریاندا بەرد لە گڵی سوورەوە کراوی (٣٣) نیشانە کراو لـە لای پەروەردگارت بۆ ئەوانەی کە لە سنوور دەر ئەچن (٣٤) ٠

سەرەتای ئەم جزمی بیست‌و حەوتەمە لێرەوە دەست پێ ئەکـات، واتە سی‌ئایەتی ئەم سوورەتە لە سەرەتاوە خراوەتە سەر جزمی ( ٢٦ )، ئەمەش لە بەر ئەوەیە ئەو زانایانەی کە قورئانیان بەش کردووە بە سـی بەش، بەپێی ژمـارەی ووتەکانی بەشیان کردووە، تەماشـای ئەوەیـان نەکردووە کە ئەم شوێنە ناوەڕاستی داستانێکە وەك لێرەدا، بەڵام ئێمـــە لەم جزمەدا لە سەری سوورەتەکەوە دەستمان پێ‌کرد ٠

دوای ئەم مژدەیەی کە بە ئیبراهیم درا، ئنجا پرسیاریان لێ ئەکات کە بۆچی هاتوون؟ وەکو ئەفەرموێ : (قال) ئیبراهیم بـــە فریشتەکانی ووت : (فما خطبکم اىها المرسلون) کاری ئێوە چی‌یە ئەی ڕەوانە کراوانی خوا !، واتە بۆچی هاتوون؟ (قالوا) فریشتەکان ووتیان (انا ارسلنا الی قوم مجرمین) ئێمە ڕەوانە کراوین بۆ سەر گەلی گوناهباران کە گەلی «لووت» پێغەمبەرە وەك لە سوورەی «هود»دا ئەفەرموێ «انا ارسلنا الی قوم لوط»(١) ( لنرسل علیهم حجـــارة مـــن طین ) تا بە ســـەریاندا بارێنین گڵی سوورەوە کراوی ( مسومـــــة عنـــد ربك للمسرفین ) نیشانە کراو

(١) واتە ئێمە بۆ سەر گەلی لووت ڕەوانە کراوین ( کـە لـــە ناویان بەرین ) ٠

فَأَخْرَجْنَا مَنْ كَانَ فِيهَا مِنَ الْمُؤْمِنِينَ (٣٥) فَمَا وَجَدْنَا فِيهَا غَيْرَ بَيْتٍ مِنَ الْمُسْلِمِينَ (٣٦)

ئنجا هەر چی بوو لەو دێهاتانەدا لە بڕواداران کردمانە دەرەوە(٣٥) (بەڵام) لەوێدا یەك خانوو نەبێ (کە ماڵی لووت بوو ئیتر) مسڵمانێکمان تیا چنگ نەکەوت (٣٦) •

لە لای پەروەردگاری تۆوە بو ئەوانەی کـــە لـــە سنوور دەر ئەچن ـ وەك گەلی لووت ـ •

کاتێك کـە خوا ویستی بەدکارە گوناهبارەکانی گەلی لووت لـــە ناو بەرێ، بڕوادارەکـــانی ناویانی دوور خستەوە، وەکـــو ئەفەرموێ ( فاخرجنا من کان فیها من المؤمنین ) هـــەرچی بوو لەو دێهاتانەدا لـــە بڕواداران کردمانە دەرەوە، واتە دوای ئەوەی کە فریشتەکان ڕوویان کردە گەلی لووت، چی بوو لـە بڕواداران لـەو دێهاتانەدا هەموویانمان ڕزگار کرد ( فما وجـدنا فیها غیر بیت من المسلمین ) بەڵام لـە ناو ئـەو هەموو دێهاتانەدا یەك خانوو نەبێ کە ئەویش ماڵی لووت بوو ئیتر یـەك مسڵمانی خوا پەرستمان تیا چنگ نەکەوت، وەهەر ئەوتاقە ماڵە بە تەنیـا لە سزای خوا ڕزگاری بوو، کە ئەویش هەر لووتو کچەکانی بوون بە بێ ژنەکەی کە بێ بڕوا بوو، وە لە گـەڵ بێ بڕواکانیتردا تیـا چوو ، وە ئەو دێهاتانەمان سەرەوژێر کرد، وەك لە سوورەی «هود»دا ئەفەرموێ « فلما جاء امرنا جعلنا عالیها سافلها ، وامطرنا علیها حجارة مـــن سجیل

وَتَرَكْنا فيها آيَةً لِلَّذينَ يَخافونَ الْعَذابَ الْأَليمَ (٣٧)

وە لەوێدا پەندێکمان بە جێ هێشت بۆ ئەوانەی کـــە لـە سزای پڕدەرد ئەترسن (٣٧) •

منضود مسومة عند ربك، وما هي من الظالمين ببعيد »[1] ( وتركنا فيهـــا آية ) وە بە جێمان هێشت لە جێگاکەیاندا نیشانەیەکی وا کـــە ببێ بـــە مایەی پەندو ئامۆژگاری بۆ دوای خۆیان ( للذين يخافون العذاب الاليم ) بۆ ئەوانەی کە ئەترسن لە سزای پڕ دەردی خوا کە تووشیان ببێ وەك تووشی گەلی لووت بوو •

ئنجا ئاخۆ گەلی قورەیش لەم کارەساتەی کە بە سەر گـــەلی لووتا هاتووە لە ڕێی بێ فەرمانیی پێغەمبەرەکەیانەوە، پەند وەربگرن؟ وە هـــەر چەند ئەو وولاتە ببینن، وە یا ئەو داستانە بخوێننەوە موچڕکیان پیـا بێ‌و پەنجەی خۆیان بگەزن‌و دەرسی لێ وەربگرن ؟•

دێهاتەکانی گەلی لووت لەو جێگایەدا بوون کـــە ئێستا پێی ئەڵێن دەریاچەی (طبریە)، وا دەرئەکەوێ کە ئەو ناوچەیە بە هۆی کـــانی تواوەو ئاگری ناویـــەوەو سستەکی توێی ژێرەوەی ڕۆچووبێ، وە ئاگرو کـانی تواوە ئەو پارچە گڵانەی کـە وەك خشتی سوورەوە بوو،

(١) واتە کە فەرمانی ئێمە هات (دەربارەی گەلی لووت) دێهاتەکانیانمان سەرەوژێر کرد ، وە بەردمان باراند بە سەریانا پەی دەر پەی لـــە گڵی سوورەوە کراوی نیشانە کراو لە لایـــەن پەروەردگاری تۆوە ، وە ئەم بەرد بارانە هەرگیز لە ستەمکارانەوە دوور نی‌یە •

بە سـەر یەکا جۆشیان خواردبێ‌و، بردبێتی بە ئاسمانا، وە لـەو سەرەوە هێتە خوارەوە بە سـەر ئەو گەلە ستەمکارەدا وەك باران، وە لـەو کاتەوە ئەو ناوچەیە وەك گۆلی زرێباری (مەریوانی کوردستانی ئێمـەم) بووبێ بە دەریاچەی «طبریە»، وە ئاوێکی بۆگەنی تیـا کۆ بووبێتەوە، وە ئەو گەلە لە خوا نەترسە لە ژێر ئەو ئاگرو خاك‌و خۆڵ‌و بۆگـەناوەدا مابنەوە تائەمڕۆ ، بەڵکو تاڕۆژی دوایی •

لە سوورەی « ملك » لە ئایەتی « أم أمنتم من في السماء ان يرسل عليكم حاصبا فستعلمون كيف نذير »دا باسێکی جوانمان نووسیوە لـە بابەت هێزی سروشتی‌یەوە، زۆر بەکەڵکە، بچۆ بیخوێنەرەوە •

لەم ئایەتەوە دەستوورێکی خوا دەرئەکەوێ کە هەر گەلێك باشی لە خرابی زۆرتر بێ، خوا باشەکانیان ناگرێ بـە گوناهی خراپەکان، بەڵام ئەگەر خراپەکانی زۆرتر بوون لە باشەکان، ئەو کاتە باشەکانیشیان بە خراپەکانیانەوە تێوەئەگلێن، وە هەردوولا تیائەچێ •

★ ★ ★

لـە ئایەتی پێشوودا فەرمووی : گەلی لووتمان سەرەوژێر کرد، وە لـە جێگاکەیاندا بەجێمان هێشت نیشانەیەکی وا کە ببێ بە مـایەی پەندو ئامۆژگاری بۆ دوای خۆیان، هەروا لە گـەڵ گـەلی مووساشا

وَفي موسى اِذ اَرْسَلْناهُ الى فِرعَونَ بِسُلْطانٍ مُبين (٣٨) فَتَوَلّى بِرُكْنِهِ ، وَقالَ : ساحِرٌ اَوْ مَجنونٌ (٣٩) فَاَخَذْناهُ وَجُنودَهُ فَنَبَذْناهُمْ في اليَمِ وَهُوَ مُليمٌ (٤٠)

هەروا لە داستانی مووساشا پەندمان بە جێ هێشت، کاتێکی مووسامان نارد بۆ لای فیرعەون بە بەڵگەی ڕۆشنەوە (٣٨) وە فیرعەون بە هۆی هێزو لەشکرەکەیەوە سەرپێچی کردو، ووتی : ( مووسا ) جادووگەرە، یا شێتە (٣٩) ئێمەش خۆی‌و لەشکرەکەیمان گرت‌و فڕێماندانە دەریاوە، لە کاتێکا کە ئەو شایستەی لۆمە کردن بوو (٤٠) •

ئەفەرموێ : ( وفي موسى اذ ارسلناه الى فرعون )لە داستانی مووسادا پەندو ئامۆژگاریمان بە جێ هێشت کاتێك کە مووسامان نارد بۆ سەر فیرعەون‌و گەلەکەی ( بسلطان مبين ) بە بەڵگەی ڕۆشنەوە، وەك داردەستەکەی‌و دەستی ڕۆشنی بێ‌خەوشی بێ (فتولى) فیرعەون ڕووی وەرگێڕاو بڕوای نەهێناو یاخی بوو (بركنه) بە هۆی لەشکرو گەلەکەیەوە ( وقال ساحر او مجنون ) وە ووتی مووسا جادووگەرە یاشێتە، ئیتر لێرەدا درێژەی بە داستانی فیرعەون‌و مووسا نەدا، بەڵکو دوایی هێنا بە باسی ئەو سزایەی کە دای بە سەریانا، فەرمووی ( فاخذناه وجنوده ) ئێمەش خۆی‌و لەشکرو سوپاکەیمان گرت ( فنبذناهم في اليم )وە فڕێماندانە ناو دەریاوەوە بەخنکاندن لە ناومان بردن (وهو مليم) لە کاتێکا کە فیرعەون لۆمە کراوە لە سەر ئەو سەرپێچی‌یەی کە کردی، وە ئەو یاخی بوونەی کە نیشانی دا •

★ ★ ★

وَفِي عادٍ اِذْ اَرْسَلنا عَلَيْهِمُ الرِّيحَ العَقِيمَ (٤١) ما تَذَرُ مِن شَيْءٍ اَتَتْ عَلَيْهِ اِلاّ جَعَلَتْهُ كَالرَّمِيمِ (٤٢)

وە لە گەلی «عاد»یشا پەند هەیە کاتێکی کـــە بای گەرمی توندی بێ کەڵکمان ناردە سەریان (٤١) بـــە سەر هەر شتێکا بڕۆیشتایە وەك ڕزیوی لێ ئەکرد (٤٢) •

( وفي عاد ) لە گەلی «عاد»یشا پەندو ئامۆژگاریی هەیە بۆ مەردومی خاوەن بیر، ئێمە بێ گومان «هود» پێغەمبەرمان بۆ ناردن، بەڵام بڕوایان پێ نەهێنا، وە بێفەرمانییان کرد، خواش تۆڵەی لێ سەندن بەم ڕەنگەی کـە ئەفەرموێ ( اذ ارسلنا علیهم الریح العقیم )لە کاتێکا کە ناردمـــانە سەریان بایەکی گەرمی بە هێزی بێفەڕ، نە هەورو بارانی پێوە بوو، نـــە دارو درەختیشی بۆ متوربە ئەکردن، بەڵـکو بایەکی گـــەرمو تووندو تیژی وا بوو ( ما تذر من شیء اتت علیه الا جعلته کالرمیم ) بە ســەر هەرشتێیا بڕۆیشتایە ئەیکرد بە پووش، یا بە پواوی ڕزیو •

با : هێزێکە لە هێزەکانی بوونەوەر، وە لەشکرێکە لـە لەشکرانی خوای گەورە، خوا خۆی ئەی‌نێرێ؛ دەمێ بـــە باران‌و مایەی ژیان‌و، دەمێکیش بە مایەی مردن‌و وێران کردن، لەم جۆرە کاتانەدا جێی ئـەو خراپەیە نی‌یە کە بگێڕرێ‌و بووترێ : «با» کـە هەڵ‌ئەکات، وە دێت‌و ئەچێت بە پێی دەستوورێکی تایبەتی‌یە لە بوونەوەردا، وە بە هۆی چەند ئیشێکی ڕێکی سروشتی «طبیعی»یەوەیە، چونکە ئەو خوایەی کە ئەوبایە

وفي ثَمُودَ إِذ قِيلَ لَهُمْ : تَمَتَّعوا حَتّى حِينٍ (٤٣)

له گەلی «سەموود»یشا پەند هەیە کاتێك کە پێ‌یان ووترا : بەهرەمەند بن لە ژیان تارۆژی خۆی ( کە کاتی تۆڵەی خوایە بۆتان ) (٤٣) •

هەڵئەکات، بە پێی ئەو دەستوورە، وە بە هۆی ئەو کارکەرە سروشتی‌یانەوە هەر ئەو خوایە ئەو بایە زاڵ ئەکات بە سەر ئەو کەسانەی کە بی‌یەوێ، بە پێی‌ئەو دەستوورانەی کە خۆی دایناوە •

( وفي ثمود ) لە گەلی «سەموود»یشا پەندو ئامۆژگاریی هەیە بۆ مەردومی دڵڕووناك، ئێمە بێ‌گومان «صالح» پێغەمبەرمان بۆ ناردن، بەڵام بڕوایان پێ نەهێناو لە فەرمانی دەرچوونو، حوشترەکەیان کوشت، خواش تۆڵەی لێ سەندن، بەم ڕەنگە ماوەی دان تاسێ ڕۆژ چی ئەکەن بیکەن، دوای سێ ڕۆژەکە، هەورە تریشقەیەکی بۆ ناردنو هەمووی لە ناو بردن، وەکو ئەفەرموێ (اذ قيل لهم) کاتێك کە پێ‌یان ووترا : (تمتعوا حتى حين) بەهرەمەند بن لە ژیان تا ڕۆژی خۆی کە ڕۆژی سزایە، وە لە دوای سێ ڕۆژی‌تر تووشی تۆڵەی خۆتان ئەبن، وەك لە سوورەی «هوود»دا ئەفەرموێ : «فقال تمتعوا في داركم ثلاثة ايام ذلك وعد غير مكذوب »[1] ، ئنجا سەرکەشی‌یان کرد لە فەرمانی

(١) واتە صالح پێغەمبەر پێی ووتن : سێ‌ڕوژ ڕابوێرن لە ماڵی خۆتانا (ڕۆژی چوارەم سزای خواتان بۆ دێ ) ، ئەوە بەڵێنێکە بێ‌درۆ •

فَعَتَوا عَنْ اَمْرِ رَبِّهِمْ ، فَأَخَذَتْهُمُ الصَّاعِقَةُ وَهُمْ يَنْظُرُونَ (٤٤) فَمَا اسْتَطَاعُوا مِنْ قِيامٍ ، وما كانوا مُنْتَصِرِينَ (٤٥)

ئەوان سەرکەشی‌یان کرد لە فەرمانی پەروەردگاریان، ئنجا هەورە تریشقەیەك لێی دان، وە ئەوان (لە ناو چوونی خۆیان) بە چاو ئەبینی (٤٤) نە تەواناى هەستانیان بوو، وە نە یارمەتی یەکتری (٤٥) •

پەروەردگاری خۆیان، بێ ئەوەی پەشیمان بنەوە، وە تەوبەیەکی ڕاستو دروست بکەن (فاخذتهم الصاعقة) ئنجا هەورە تریشقەیەك لێی دان ( وهم ینظرون )وە ئەوان بە خەمو خەفەتەوە تەماشایان ئەکرد، وە بە چاوی خۆیان ئەیانبینی ( فما استطاعوا من قیام )نە ئەیانتوانی هەستنو هەڕابکەن ( وما کانوا منتصرین ) وە نە ئەیانتوانی یارمەتی یەکتری بدەن بۆ ڕزگاربوونیان لەو سزایە •

★ ★ ★

ئەم سێ داستانەی پێشووی دامەزراند بە « وفي موسى •• »و « في عاد •• »و « وفي ثمود •• »، بەڵام بۆ داستانی چوارەم ئەم ئاهەنگەی گۆڕی‌یو فەرمووی « وقوم نوح من قبل » بەبێ «في» تا عەطفی « والسماء بنیناها »ی بکاتەوە سەر، کە ئەمیان ئایەتێکی بوونەوەریی « کەونی »و، ئەویان ئایەتێکی مێژووی « تأریخی »یە، بەم عەطفە ئەم دوانەی بە یەکەوە بەستەوە ، ئەم عەطفەی کرد بە پردێكو پێی

وَقَوْمَ نوحٍ مِن قَبْلُ اِنَّهُمْ كانوا قَوْماً فاسِقينَ ( ٤٦ )
وَالسَّماء بَنَيْناها بِاَيْدٍ وَاِنّا لَموسِعونَ (٤٧)

وە لە پێش ئەم گەلانەدا گەلی نووح بوو کە گەلێکی بەدکـــار بوون (٤٦) وە ئاسمانمان دروست کردووە بە دەسەلاتی خۆمان، وەئێمە فراوان کردەی (ئاسمانین) (٤٧) •

بەڕێیەوە، لە ئایەتێکی مێژوویی‌یەوە بۆ ئایەتێکی بوونەوەریی ، هـەر لـــە بەر ئەمەشە، کە داستانی نووحی خستە دوای داستانەکانی‌ترەوە ، ئەگەر لە بەر ئەمە نەبوایە، ئەبوو داستانی نووحی پێش ئەم داستانانە بخستایە، وەك لە سوورەی «هود»دا پێشی خستووە، چونکە ئـەم لـــە پێش هەموویانا بووە •

( وقوم نوح من قبل ) یادی گەلی نووح بکەن کە لە پێش ئـــەم گەلانەدا بوون ( انهم كانوا قوما فاسقين ) بە ڕاستی گەلێکی بەدکـاری لە سنوور دەرچوو بوون •

★ ★ ★

لە سەرەتای سوورەتەکەوە چـــەند پیشانگایەکی بوونەوەریی نیشان دا لە بای بە هێـــزو هەوری بارشت ٠٠٠، والێرەشا گەڕایەوە سەر چەند پیشانگایەکی بوونەوەریی‌و باسی چەند نیشانەیەکی‌تر لـــە تاك‌و تەنیایی خوا، فەرمووی ( والسماء بنيناها بايد ) ئێمـــە ئاسمانمان دروست کرد بە هێزی خوایەتییمان ( وانا لموسعون )وە ئێمە ئاسمانمان فراوان کردووە بە فراوان کردنێکی وا نە چاو هەنای ئەکات‌و نەڕوانگە

«مرصد» نە زمان ئەتوانێ باسی بکات بە تەواوی‌و نە پێنووس •

نزیکترین ئەستێرە لە ئێمەوە مانگە کە (٢٤٠ر٠٠٠) میل لێمانەوە دوورە، مانگ (٢٩) ڕۆژو نیو جارێك بەدەوری زەویدا ئەسووڕێتەوە ، وە هــەر وا زەویش (٩٣ر٠٠٠ر٠٠٠) میــل لــە ڕۆژەوە دوورە سووڕانەوەیەکی هەیە لە سەر تەوەرە، سەعاتی هەزار میل ئەبڕێ، وە سالی جارێکیش بە دەوری ڕۆژا ئەسووڕێتەوە ، و (١٩٠ر٠٠٠ر٠٠٠) میل ئەبڕێ، هــەر بەو ڕەنــگە نۆ ئەستێرەی گەڕۆکی‌تر هەن لــە گــەڵ زەویدا کە هەر دەیان بەدەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە، وە دوور نزین‌یان ئەستێرەی (ئێکس)ە کە بە دەوری ڕۆژا ئەسووڕێتەوە، وە لــە ســەر چەمدرەیەك کە ( ٨ر٥٠٠ر٠٠٠ر٠٠٠ ) میلە، وە بە دەوری هێندێك لەم ئەستێرانەدا (٣١) مانگ ئەسووڕێتەوە، جگە لەمانە سی هەزار ئەستێرەی بچکۆلە بچکۆلە هەر لە گدڵ هەزاران ئەستێرەی کلکدارو هەزاران هەزار ئەو شتانەی کە وەك ئەستێرە وانو ئەکشێن‌و ئەسووتێن، کــە پێیان ئەڵێن «شهب» ، ئەمانەش هەموو بە دەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە ، ئەو ڕۆژەی کــە تەوەرەکەی (٨٦٥ر٠٠٠) میلە ، وە ( ١ر٢٠٠ر٠٠٠ ) جار لــە زەوی گەورەترە •

ئەم ڕۆژی ئێمــەیە لە یەك شوێنا نەوێستاوە، بەڵــکو دووجــۆر سووڕانەوەی هەیە، یەکێکیان لــە ســەر تەوەرە بە دەوری خــۆیا ئەسووڕێتە، وە لە (٢٦) ڕۆژا چەرخەیەك تەواو ئەکات، دووهەمیــان خۆی‌و ئەو هەموو ئەستێرە گەڕۆکانەی کــە لــە گەڵیان بە خۆیان‌و مانــگەکانیانەوە، وە لــە گــەڵ ئەو لەشکرە بێ‌پایانە لــە ئەستێرەی

بچووكو لە ئەستێرەی كلكداروو، ئەوشتانەی كە ئەكشێنو ئەسووڕێنەوە بەم ڕێكو پێكی‌یە بە دەوری چەق «مەركەز»ی ئەو كاكەشانەی كە كۆمەڵەی ڕۆژی ئێمەی تیایە، وە لە سەعاتێكا (٠٠٠ر٦٠) میل ئەبڕێ •

زانایانی ئاسمان، میل ـ كە هەزارو شەش سەد مەترە ـ كردوویانە بە قیاس بۆ پێوانی دووریی ئەستێرەیەك لە ئەستێرەیەكی‌تر، بەم ڕەنگە ئەبێژرێ : (٩٣) ملیۆن میل لە زەوی‌یەوە دوورە، كە واتە ئەگەر ساروخێك بنێرین بۆ ڕۆژ كە لە سەعاتێكا (٨٨) میل ببڕێ، بە سەدو بیست ساڵ ئەیگاتێ، هەر بەم ڕەنگە هەموو ئەستێرەكانی تریش •

ڕۆژ ئەستێرەیەكە لە هەزاران هەزار ملیۆن ئەستێرەی‌تر، وە نزیكترینیانە لە ئێمەوە، ئەستێرەكانی‌تری ئاسمان هەر یەكەیان ڕۆژێكە بۆ خۆی، وە ئەستێرە گەڕۆكەكانی خۆی ڕووناك ئەكاتەوە، ئنجا لە ناو ئەم ڕۆژانەدا ڕۆژی واهەیە سی ملیۆن جار لە ڕۆژی ئێمە گەورەترە، بەڵام لە بەر دووریی، ئێمە بە عاستەم ئەی‌بینین، ئنجا لە بەر ئەم دووریی‌یە زانایانی ئاسمان نەیان‌توانی ئەم ئەستێرە دوورانە بە میل بپێوون، وەك دووریی ڕۆژو ئەستێرە گەڕۆكەكانیان پێواوە، چونكە ژمارە دەرەقەتی ژماردنی ئەو میلانە نایەت، لە بەر زۆری‌یان، ئنجا هاتن خێرایی « سرعة » تیشكیان كرد بە قیاس كە لە چركە « ثانية » یەكدا (١٨٦) هەزار میل ئەبڕێ، ئنجا ئەگەر ئەمە لێك بدەین لە (٦٠) چركە، ئەبێ بە دەقیقەیەكی تیشكی، وە ئەگەر ئەنجامی ئەم لێكدانە زەرب بكەین لە (٦٠) خولەك «دەقیقە» ئەكاتە سەعاتێكی تیشكی، وە ئەگەر

ئەنجامەکەی زەرب بکەین لە ٢٤ سەعات ئەکاتە شەوو ڕۆژێکی تیشکی، وە ئەنجامی ئەم لێکدانە زەرب بکەین لە (٣٦٥) ڕۆژ، ئەبێ بە ساڵێکی تیشکی کە شەش ملیۆن ملیۆن میلە، ئنجا ئەم ساڵی تیشکییەیان کردووە بە یەکە یەکی پێوانەیی ( وەحدەی قیاسی ) بۆ پێوانی دووریی ئەستێرەکان کە لە ژمارە نایەن •

زانایانی ئاسمان ئەڵێن : تیشکی ڕۆژ بە هەشت دەقیقەو هەژدە چرکە ئەگاتە زەوی، دوای ڕۆژ نزیکترین ئەستێرە لە ئێمەوە بە چوار ساڵو نیوی تیشکی ڕووناکییەکەی ئەمانگاتێ، واتە (٢٥) ملیۆن ملیۆن میل لە ئێمەوە دوورە، وە «نەسری طائر » ـ کە سێ ئەستێرەی سێ گۆشەن، وە لە هاوینانا بە ناوەڕاستی ئاسمانەوە ئەبینرێن، بە چواردە ساڵو نیوی تیشکی ڕووناکییەکەیمان ئەگاتێ، وە ڕووناکیی « سماکی رامح »بە پەنجا ساڵی تیشکی ئەمانگاتێ ـ •

خولاسە وەك زانایانی ئاسمان ئەڵێن : بوونەوەر لە هەزار ملیۆن کاکەشان پێك هاتووە، کە هەر یەکێك لەم کاکەشانانە لە هەزار ملیۆنەوە تا سی هەزار ملیون ئەستێرەی تیایە، ئنجا هەزار ملیون کاکەشان زەرب بکە لە سی هەزار ملیۆن ئەستێرە بزانە ئەکاتە چەند؟ ئەوەندە ئەستێرە بەر چاو کەوتوون •

کاکەشان : بەو شتە سپییانە ئەڵێن کە وەك هەورێکی تەنك لە شەوگاری سافی بێ هەورو تەپو تۆزا ئەبینرێ لە ئاسمانا، ئەو هەورە سپییە هەموو ڕۆژن لە کاکەشانی یەکەمدا وەك ڕۆژی ئێمە، بەڵکو گەلێکیان هەزاران هەزار جار گەورەترن، کە لە بەر چاوی ئێمە

کەوتوونەتە عاستی یەك، بۆیە وا لە دوورەوە سپی ئەچنەوە •

ئەبێ ئەمەش بزانین کە لە ناوەندی هەموو دوو ئەستێرەیەکا سێ سەد ملیۆن میل بۆشایی هەیە، وە لە ناوەندی هەموو دوو کاکەشانێکشا بۆشایی ملیۆن‌و نیوێك ساڵی تیشکی هەیە، لە بەر ئەوە بە یەکا هەڵتەقینیان هەرگیز نەبووەو نابێ، هێندێ لە زانایان ئەڵێن: دووهەنگ لە هەموو ئاسیادا بەرەڵڵا بکرێن، گونجانی هەڵتەقینیان بە یەکا گەلێ نزیکترە لە هەڵتەقینی دوو ئەستێرە بە یەکا •

ئنجا ئەم بوونەوەرە بەم پان‌و پۆڕی‌یە، ددم بە دەم لـــە فراوان بوونایە، واتە ئەم کاکەشانانە هەمیشە وەك میزڵڵانێك کە فووی پیابکرێ، لە هەموو چرکەیەکدا هەزاران میل لە هەموو لایەکەوە زیاد ئەکـات، وە تاریکستانی پشتی خۆیان ڕووناك ئەکەنەوە، ئێمە ـ کـە دانیشتووی سەر زەوین ـ دوورین لە چەق «مەرکەز»ی ئەم کاکەشانەی کـــە کۆمەڵەی ڕۆژی ئێمەی لە ناوایە ـ بە ئەندازەی سی هەزار ساڵی تیشك• ئنجا بەم پێیە، قەبارەی بوونەوەر لە سەرەتای بوونیەوە چـەند بووە؟ ئێستا گەلێ لەوە زیاتر زیادی کردووە، ئەم ڕۆژی ئێمەیە ـ کە هەمیشە لە سەر تەوەرەی خۆی ئەسووڕێتەوە ـ لـــە سەر پەراوێزی ئـــەو کاکەشانەی کـــە ئەمی تیایە ئەڕوا، وە لە هەمموو چرکەیەکدا دوانزە میل لـــەو پەراوێزە دوور ئەکەوێتەوە، هـــەر بەو ڕەنـگە ئەستێرە گەڕۆکەکانیشی ئەڕۆن بێجگە لـــە سووڕانەوەی خۆیان لـــە ســـەر تەوەرە، وە لە سەرگێڕی تایبەتی خۆیان بە دەوری ڕۆژا •

بە کورتی ئەم ئاسمانە پان‌و بۆڕو فراوانە بـــەم هـــەزار ملیۆن

وَالْأَرْضَ فَرَشْنَاهَا فَنِعْمَ الْمَاهِدُونَ (٤٨)

وەزویمان ڕاخستووە، وە (ئێمە) چاك ڕاخەرێنین (٤٨)

کاکەشانەوە ئەمەندە گەورەو بەر بەرەڵلایە، خەیاڵ ئەم پەڕو ئەوپەڕی
ناکات، وە تەوەرەکەی لە هەزار ملیۆن ساڵی تیشکی گەلێ گەلێ زیاترە.

زانایانی ئاسمان ئەڵێن : زۆر ئەستێرەی وا هەن کە لە پێش
دروست بوونی زەویدا دروست بوون، کە چی تیشکیان هێشتا بەڕێگاوەیە
نەگەیشتوونەتە زەوی وە نابینرێن، هەر وەك ئەستێرەی واهەن لە پێش
دروست بوونی زەویدا لە جێی خۆی ترازاوەو نەماوە، کە چی
تیشکەکەی هێشتا هەر بە ڕێگاوەیەو نەکوژاوەتەوە(١) .

( والارض فرشناها )وە زەویمان ڕاخستووە بە ڕەنگێکی وا کە
ئادەمی بتوانێ هاتو چۆی بە سەرا بکات، وە ناو سکی هەڵدڕێ و
خێرو بێری لێ وەرگرێ . بەڵێ زەوی هەر چەند لە خۆیا گردو خڕە
وەك مانگ و ڕۆژ، بەڵام لە بەر گەورەیی و فراوانی خۆی ئێمە
خڕی یەکەی بە چاو نابینین مەگەر لە شوینێکی زۆر دوورەوە نەبێ
وەك سەر پشتی مانگ ( فنعم الماهدون ) چاك ڕاخەرێکین، واتە لە

(١) برای خوێنەرو تێ گەیشتوو ! گەردوونێ بەم شێوەیە بێ کە
(خاڵ)ی خوا لێخوشبوو لەم چەند دێرەدا لیی دواوە ، ئایا ڕەوایە
گوێ شل بکرێت بۆ ئەو دەروون تاریکانەی کە ئەڵێن ئەم
بوونەوەرە بە «ڕێکەوت» پەیدا بووەو تەبیعەت نەخشەی بۆ
کێشاوە ؟ ئەم جۆرە کەسانە (صم بکم عمی فهم لا یفقهون ) کەڕو
=

وَمِنْ كُلِّ شَيْءٍ خَلَقْنَا زَوْجَيْنِ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ (٤٩)

وە لە هەموو شتێك نێرو مێمان دروست کردووە، شایەد پەند وەرگرن ( ٤٩ )

ڕاخستنەکەیا هەر چی کەمو کووڕیی بێ تێیدا نییە ( ومن کل شیء خلقنا زوجین ) وە لە هەموو شتێك ـ لەوانەی زیندوونو لەوانەی زیندوو نین ـ نێرو مێمان دروست کردووە ( لعلکم تذکرون ) شایەد بیر بکەنەوەو پەند وەربگرن •

لە ئادەمیو گیانلەبەرانا نێرو مێ هەیە، هەر وا لە دارو درەختو گژو گیاو هەرچی لە زەویدا بڕوێ نێرو مێ هەیە ـ بەڵکو ( ذەڕە ) ـ کە بچووکترین شتە لە مادەدا دەرکەوتووە، کە لە ووردیلەی زۆر بچووك دروست بووە، ناوکەکەی لە ووردیلەی «پرۆتۆن» کە بارگە «شحنە»ی کارەبای گەرم «موجبە»ی تیایە، وە «نیوترۆن» کە بێبارگەیە، وە ووردیلەی زۆر بچووکتر لە «پرۆتۆن» ـ کە پێی ئەڵێن «ئەلکترۆن» وە بارگەی سالبی هەڵگرتووە، زۆر بە خێرایی ئەسووڕێتەوە بە دەوری ناوکدا لە دووریی دیار کراو « ابعاد معینة »دا، ئەم سێ وردیلەیە لە

=

لاڵو کوێرنو تێگەیشتنیان نییە ، دان دەنێن بە « ڕێکەوت »ێکی بێدەسەڵاتو بێدەستەپاچەو بە «تەبیعەت»ێکی ناپەیداوو بێناوو نیشانو بێ شوێنەوار ، بەڵام لە عاستی تەوانایی خوای گەورە کوێرو نابینان ، چاوی سەرو چاوی ژیرییان لە بینینی مادده بەو لاوە تێناپەڕێ • (م) ـ ئەردەڵانی

ذەرِەدا بناغەو کەرەسەی هەموو توخم «عنصر» یلكو هـــەموو ئاوێتـــە « مرکب » یەکن •

سێر ج•ج طمس لە ساڵی ۱۸۹۷م کارەبای ساردی دۆزی‌یەوە، لە پاشا کارەبای گەرمیش دۆزرایەوە، ئایا پازدە چەرخ لە مەپێش کـــە قورئان ئەم نهێنی‌یەی درکاندووە ـ گەورەترین بەڵگە نی‌یە لە ســـەر ئەوەی کە ئەم قورئانە لە خواوەیە؟، هـەر ئەو خوایەیە کە ئاگادارە بـە هـەموو نهێنی‌یەکی ئاسمانو زەوی، بەڵێ وایە وەك خـــوا خـــۆی ئەفەرموێ « قل انزله الـــذی یعلم السر في السماوات والارض »(۱) فورقان/٦ •

قورئان لە بەشی زۆری لاپەرەکانیا موعجیزەیەك یا زیاتری تیایە، مەردوم کە بـە موعجیزەیەکی وا ئەگات ئەبوو بێ‌بەروا بـــە ڕوودا بکەوتایەو سجدەیەکی بۆ خوای گەورە ببردایە، وەك خـــوا خـــۆی ئەفەرموێ « فما لهم لا یؤمنون ؟• واذا قریء علیهم القرآن لا یسجدون» (انشقاق/۲۱)، واتە بۆچی بڕوا ناهێنن• وە کاتێك کـــە قورئانیان بـە سەرا ئەخوێنرێتەوە بە ڕوودا ناکەوونو سەر دانانەوێنن بۆ بارەگـــای ئەو خوایەی کە ١٤٨٦ ساڵ لە پێش دۆزینەوەی ئەم نهێنی‌یە لـە لایەن ئادەمی‌یەوە ئەو خەبەرەی داوە، ئەو کەسەی کە بڕوای بە پێغەمبەرێتی پێغەمبەر نەبێ، کـە ئایەتێکی وا ببینێ ئەبێ بە ناچـــاری بڕوا بێنێ بـە

(۱) واتە : (ئەی پێغەمبەر ! ) بڵێ ئەم قورئانە ئەو خوایە ناردوویەتـە خوارەوە کە ئاگادارە بە هەرچی نهێنی هەیە لـــە ئاسمانەکانو زەویدا •

پێغەمبەر، چونکە ئەگەر نەڵێ پێغەمبەرە ئەبێ بڵێ خوایە، خۆ نابێ خوابێ، کە وابوو ئەبێ پێغەمبەر بێ •

تەنانەت من ئەڵێم ئاشکرایە کە ئەم خەبەرە غەیبی‌یە لە پێغەمبەرەوە نی‌یە، بەڵکو ئەبێ لە خواوە بێ، کە وابوو دەر ئەکەوێ کە خوایەکی وا هەیە کە هەر بووەو هەر ئەبێ، وە ئاگادارە بە هەموو نهێنی‌یەك لە بوونەوەرا، کە واتە ئەم خەبەرە غەیبی‌یە ئەوەندەی بەڵگەیە لە سەر بوونی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەر، ئەوەندەش بەڵگەیە لە سەر بوونی خوا، چونکە ئەگەر بێ بڕوایەك بڵێ : ئەم بوونەوەرە خۆی خۆی دروست کردووە، وە لە خۆیەوە هاتۆتە دی، ئەی بەم خەبەرە غەیبی‌یە ئەڵێ چی ؟

ئایا ئەمیش وەك بوونەوەر هەر خۆی لە خۆیەوە هاتۆتە خوارەوە بۆ سەر دڵو زمانی پێغەمبەر ؟ کە وابوو قورئان لە بوونەوەر زیاتر بەڵگەیە لە سەر بوونی خوا •

بە ڕاستی خوا جوانی نەرمووە کە ئەڵێ : « لو انزلنا هذا القرآن على جبل لرأيته خاشعا متصدعا من خشية الله »(١) حشر/٢١ •

لە پاش باسی هێزو دەسەڵاتی خوا لە هەموو بوونەوەرا؛ ( واتە لە ناو هەموو ئاسمانو کاکەشانەکانا، وە لە ناو هەموو زەویدا بە دەریاو وشکانیەوە )، ئنجا بانگی مەردوم ئەکات کە ڕەو بکەن بۆ لای خواو

(١) واتە ئەگەر ئەم قورئانەمان بناردایەتە خوارەوە بۆ سەر کێوێك (وە تێگەیشتنی ببوایە وەك ئادەمی) تۆ ئەتدی کە ئەو کێوە لە ترسی خوا ئەهاتە لەرزەو پارە پارە ئەبوو •

فَفِرّوا اِلى اللهِ اِنّى لَكُمْ مِنْهُ نَذيرٌ مُبين (٥٠)
وَلا تَجْعَلُوا مَعَ اللهِ اِلهاً آخَرَ ، اِنّى لَكُمْ مِنْهُ نَذيرٌ مُبين (٥١)

---

ئنجا ئێوه ڕەو بــکەن بۆ لای خوا، به ڕاستی من له لای ئەوەوە ترسێنەرێکی ئاشکرای ئێوەم (٥٠)

وه هەرگیز له گەڵ خوادا خوایەکی‌تر مەگرن، به ڕاستی من لـه لای ئەوەوە ترسێنەرێکی ئاشکرای ئێوەم (٥١)

---

بەنای بۆ بەرن، وه پشتی پێ ببەستن، وه بــه تاكو تەنیــای بناسن، وه هاوبەشی بۆ پەیدا نەکەن،وه هاوار له کەسی‌تر نەکەن تەنیا ئەو نەبێ وەکو ئەفەرموێ ( ففروا الى اللــه ) ئەی بەندەگانی خوا هەر ڕووتان لــه خوا بێ، وه هەر پشت به خوا ببەستن ( انی لکم منه نذیر مبین ) کـه به ڕاستی من بۆ ئێوه له لایەن خواوه ترسێنەرێکی ئاشکرام ( ولا تجعلوا مع الله الها اخر )وه هەرگیز له گــەڵ خوای تاكو تەنیادا خوایەکی‌تر مەپەرستن، واته هەر خوا به کارسازی خۆتان بزانن، وه داوای ئــەو کارانەی که هەر له خوائەکرێ له یەکێکی‌تری مەکەن ( انی لــکم منه نذیر مبین ) که من بۆ ئێوه له لایەن خواوه ترسێنەرێکی ئاشکرام .

ووتنەوەی « انی لکم منه نذیر مبین »له دوو ئایەتی بەروو دوادا که به تەنشت یەکەوەن، بۆ بێدار کردنەوەو خۆ کۆ کردنەوەیە .

★ ★ ★

كَذلِكَ ما اَتَى الَّذينَ مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ رَسولٍ اِلاَّ قالُوا ساحِرٌ أَوْ مَجْنونٌ (٥٢) أَتَواصَوْا بِهِ

هەر وەك (قورەیش قسەكانی تۆ ئەی محمد! بە درۆ ئەزانن) هیچ پێغەمبەرێكی ڕەوانە كراو بۆ گەلانی پێشووش نەهـــاتوون، مەگـــەر ( قسەی ئەوانیشیان بـە درۆ زانیـوەو ) ووتوویانە ئــەو پێغەمبــەرانە جادوگەرن یا شێتن (٥٢)

ئایا (لەسەر ئەم بێ بڕوایی‌یە مەردومانی كۆنو تازە) دەنگیان لـە یەك گێڕاوەتەوە؟

لــە دوای باسی پێغەمبەرەكانو گـەلەكانیان، ئەم باسی دروست كردنی ئەم ئاسمانە بە فراوانیو ڕاخستنی زەویو دروست كردنی نێرو مێ لە هەموو شتێكا وەك گوریزێك وابوو باسی پێغەمبەرەكانو ڕەوانـە كردنیان بۆ سەر گەلەكانیان، ئنجـــا كە گوریزەكە تەواو بوو، نۆرەی دووكەوتن «تعقیب» هات لە سەر داستانی ئەو پێغەمبەرانە كە باسكران، فەرمووی ( وكذلك ) هەر وەك گەلەكەی تۆ ئــەی محمـــد! قسەكانی تۆیان بە درۆ زانی ( ما اتی الذین من قبلهم من رسول ) هیچ پێغەمبەرێك نەهاتووە بۆ ئەو گەلانەی كە لە پێش گەلەكەی تۆ دا بوون ( الا قالوا : ساحر او مجنون ) مەگەر ووتوویانە ئەم پێغەمبەرە جادوگــەرە یاشـێتە ( اتواصوا به ؟ ) ئایا ئەم هەموو گەلانە، پێشینان بۆ پاشینان ئامۆژگاری یەكتری‌یان كردووەو دەنـــگیان لـە یەك گێڕاوەتەوە؟ كـــە هـــەر پێغەمبەرێكیان بۆ بێت، قسەكانی بە درۆ بزانن، وە وای پێ بڵێن، نەخێر

بَلْ هُمْ قَوْمٌ طاغُونَ (٥٣) فَتَوَلَّ عَنْهُمْ
فَما اَنْتَ بِمَلُومٍ (٥٤)
وذكّرْ فَاِنَّ الذِّكرى تَنْفَعُ الْمُؤمِنينَ ( ٥٥ )

(نەء) بەڵكو ئەم گەلانە هەموو دەستەیەكی سەركێشی یاخین (٥٣) تۆ (ئەی پێغەمبەر!) لەم بێ بڕوایانە ڕوو وەرگێڕە كە تۆ لۆمە كراو نیت (٥٤) وە ئامۆژگاری بكە ، بە ڕاستی پەند ( ئەگەر سوودی بۆ بێ بڕوایان نەبێ) سوود ئەدا بە بڕوادلران (٥٥)

ئامۆژگاریی یەكتری‌یان نەكردووە، ( بل هم قوم طاغون ) بەڵكو ئەوان گەلێكی یاخیو سەركێشن، وە هەمیشەش یاخێتیو سەركێشی، پێشینانو پاشینان كۆ ئەكاتەوە لە سەر ئەم جۆرە شتانە •

ئنجا خوا ئامۆژگاریی پێغەمبەر ئەكاتو ئەفەرموێ ( فتول عنهم)تۆ ئەی پێغەمبەری خوا! ڕوو لەم بێ بڕوایانە وەرگێڕە، وە خۆتانی پێوە خەریك مەكەن(١) ( فما انت بملوم )تۆ لە سەر بێ بڕوایی ئەوان لۆمە كراو نیت، چونكە پێغەمبەرێتی خۆتت كردو، سپاردەی خۆت بە جێ هێنا، وە تۆ هەر ڕاگەیاندنی فەرمانانی خواو ئامۆژگاریی كردنت لە سەرە وەكو ئەفەرموێ ( وذكر ) ئامۆژگاری بكە ( فان الذكرى تنفع المؤمنين ) بێ‌گومان ئامۆژگاری كردن سوود ئەدا بە بڕواداران •

(١) چاتر وابوو بیوتایە : « وە خۆتیان پێوە خەریك مەكە » • ( م ) — ئەردەڵانی •

وَمَــاخَلَقْتُ الجِنَّ وَالاِنس اِلا لِیَعْبُدُونِ (٥٦)

وە من پەری‌و ئادەمیم هەر بۆ ئەوە دروست کردووە کە من بپەرستن (٥٦)

چەند ئایەتێك لە مەپێش فەرمووی : ئەی بەندەگان ڕەو بکەن بۆ لای خوا، وە هەرچی ئەکەن لە چاکە هەر بۆ خوای بکەن، وە هەرچیش ناکەن هەر لە بەر خوا مەیکەن، ئنجا وا لێرەدا مەبەست لەو ڕەو کردنە دەرئەکەوێ کە ڕزگار بوونە لە خەم‌و خەفەتی دنیاو، خۆ سووك کردنە بۆ بە جێ هێنانی ئەو خوا پەرستی‌یەی کە خوا تۆی بۆ ئەوە دروست کردووە، ئەفەرموێ (وما خلقت الجن والانس الا لیعبدون)ئێمە پەری‌و ئادەمی‌مان کە دروست کردووە، هەر بۆ ئەوەیە کە بە تاك‌و تەنیایی بمان‌پەرستن، واتە پیشە «وظیفە»ی پەری‌و ئادەمی هەر پەرستنی خوایە، وە هەر ناسینێتی بە تاك‌و تەنیا، وە هەر بۆ ئەوە دروست کراوون •

ئەم ئایەتە کورتە ڕاستێتی «حقیقة»یەکی زۆر گەورەی تیایە ، لە گەورەترین ڕاستێتی‌یان «حقائق»ی بوونەوەر، کە ئادەمی بە بێ زانینی ئەو ڕاستێتی‌یە ژیانی ڕاست نابێتەوە، ئنجا ئەم ژیانە ژیانی تاك بێ، یا کۆمەڵ بێ یا ژیانی تەرح «نوع»ی ئادەمی بێ لە هەموو چەرخێکا وە لە هەموو دەورێکا •

ئەم ڕاستێتی‌یە زۆر گۆشەو قوژبنی لێ ئەبێتەوە، وە لە زۆر لاوە

مەبەستو مانامان نیشان ئەدا کە هەموو ئەچنەوە ژێر ئـەم ڕاستێتی‌یە گەورەیە کە بەردی بناغەیە بۆ وێستانی ژیان •

یەکـەم گۆشە لـەم گۆشانەی کە ووتمان ئەمەیە کە ئامانجێـکی تایبەتی هەیە لە دروست کردنی ئادەمیو پەریدا، کـە ئەویش پەرستنی خوایەو ناسینێتی بە تاكو تەنیا، بەم ڕەنگە ئەبێ ژیانی بەندە لە سەر ئـەم بنـەڕەتە بێ •

گۆشەکەی تری ئەمەیە کە مەبەست لەم پەرستنە هـــەر نوێژو ڕوژوو حـەجو زەکاتو خێرو چاکە کردن نی‌یە، چونـکە لـــە هیچ کاتێکا پەریو ئادەمی هەموو ژیانی خۆیان بەخت نەکردووە لـەم جۆرە خـوا پەرستی‌یانەدا، هـەر وەك خواش ئـەم تەکلیفەی لێ نەکردوون، بەڵـکو ـ وەك «سید قطب» ئەڵێ ـ گەلێ لەمە فراوانترو گەورەترە، بە نیشانەی فەرموودەی خوا کە ئەفەرموێ « واذ قال ربك للملائكة انی جاعل في الأرض خليفة »[1] •

مەبەست لـە جێ‌نشینی خوا لە سـەر زەوی ئادەمی‌یە کـــە لـــە هەزاران لاوە خەریـکی ئاوا کردنەوەی زەوی بێ بە خانوو کردنو، ـ بونیات نانی دێهاتانو شار دروست کردنو شاڕێ ڕاکێشانو باخ‌نانو، زەویو زار کێڵانو کشتو کـاڵو، هـــەموو جـــۆرە کارخـــانە کردنەوەیەکو، کان دەرهێنانو، پوختـە کردنیو بە کـــار هێنـانیو، مەردوم خستنە گـــەڕو، ئاوەدانی زۆر کردنو، هەرزانی خستنەوەو،

---

(۱) وانە بیر بکەرەوە کاتێك کە پەروەردگاری تۆ بە فریشتەی ووت : من جێ‌نشینێکی خۆم لە سەر زەوی دروست کردووە •

ما أُرِيدُ مِنْهُمْ مِنْ رِزْقٍ وما أُرِيدُ اَنْ يُطْعِمونِ (٥٧)

من لە دروستکردنی ئەمانە هیچ خواردنو ڕۆزیی‌یەکم نەویستووە(٥٧)

پاڵنان بە گرانیو، هەژاریو، نەخۆشیو، نەخوێندەواری‌یەوە، کە واتە دەرکەوت کـە مەبەست لەم خـوا پەرستی‌یەی کە ئامانجی هاتنە جیهانی ئادەمی‌یە گەلێ فراوانترە لەو خوا پەرستی‌یەی کە ئێمە تێی ئەگەین، وە پشەی جێنشینی «خلافة» ئادەمی بەشێکە لەم خواپەرستی‌یە •

ئنجا بەم پێ‌یە مەبەست لە خواپەرستی دێتە دی، وە کردو کۆشی وەك نوێژو ڕوژووی لێ دێو، ئاوا کردنەوەی زەوی‌و زار، وەك حەجو زەکاتی لێ دێو، ڕێـگا کردنەوەوو پرد دروست کردن، وەك غەزای لێ دێ لە ڕێی خوادا •

تا ئێرە باسی ئەوەی کرد کە خوای پەروەردگار، بەندەگانی خۆی دروست کردووە بۆ خوا پەرستی، بەم مەبەستە تێکرایی‌یەی کە ووتمان، ئنجا باسی ئەوە ئەکا کـە خوا لە گەڵ بەندەگانی خۆیدا وەك خـاوەن بەندەگانی جیهان نی‌یە کە چاوی لە قازانجو سوودی خۆیەوە بێ کـە پێی بگات، وە ئەو خێرو چاکانەش کـە داوایان لێ ئەکات بۆ هەژارانو کەفتەکارانە، سوودێك بە خوا ناگەیەنێ، وەکو ئەفەرموێ ( مـا اریـد منهم من رزق وما ارید ان یطعمون ) من نامەوێ لەوان هیچ ڕۆزیی‌یەك وە هیچ خواردەمەنی‌یەك واتـە هیچ جۆرە قازانجێکم ناوێ لێیانەوە

اِنَّ اللهَ هُـــوَ الرَّزاقُ ذو القُـــوَّةِ المَتَینُ (٥٨) فَاِنَّ
لِلَّـــذینَ ظَلَمُوا ذَنُـــوباً مِثْـــلَ ذَنُوبِ اَصْحابِهِمْ فَلا
یَستَعْجِلوُنِ (٥٩)

---

بێ‌گومان هـــەر خوا ڕۆزیی دەرە کـــە خاوەنی دەسەلاتی بە
نینە (٥٨) بە ڕاستی بۆ ئەوانەی ستەمیان کرد بەشیك هەیە لـــە سـزا
مانەندی بەشی هاوڕێکانیان، با پەلە نەکەن (لە داوا کردنی سزا) ( ٥٩ )

---

( ان الله هو الرزاق ) بەڕاستی هـــەر خوایە ڕۆزی دەری بەندەگـــان
( ذو القوة المتین ) خاوەنی هێزو دەسەلاتی زۆر، واتە خوا هیچ کـاتێك
پێویستی بە بەندەگانی خۆی نی‌یە، بەڵـکو هـــەر ئەوان پێویستن بە خوا
لە هەموو کاتێکاو لـــە هـــەموو کارو بارێـکا، وە هەرشتێکی داوا لێ
کردین هـــەر بۆ خێرو خۆشیی خۆیانە •

لـــە دوای باسی ئەم ڕاستێتی‌یە گەورەیەی کە کرا، ئنجا ئەوانەی
کـــە ستەم لـــە خۆیان ئەکەن‌و بڕوا ناهێنن ـ ئەیان‌ترسێنێ ، ئەفەرموێ
( فان للذین ظلموا ) بێ‌گومان، هەیە بۆ ئەو بێ‌بڕوایانەی کـــە ستەمیان
کرد لە خۆیان، کـــە خەڵـکی مەککەن ( ذنوبا مثل ذنوب اصحابهم )
بەشێك لـــە سزا وەك بەشی هاوڕێـکانیان لە بێ‌بڕوایانی گـــەلانی
ڕابوردوو ( فلا یستعجلون )با پەلە نەکـەن لـــە داواکردنی سزا؟ بەم

فَوَيْلٌ لِلَّذِينَ كَفَرُوا مِن يَوْمِهِمُ الَّذِي يُوعَدُونَ (٦٠)

ئنجا وای بۆ ئەوانەی کە بێ بڕوا بوون! ، لە ڕوژێکیان کە پێغەمبەران بەڵێنیان پێ داوون (٦٠)

ڕەنگە کە ئەڵێن : « فاتنا بما تعدنا ان کنت من الصادقین »[1] (فویل للذین کفروا )

ئنجا ئەو کاتە وای بۆ ئەوانەی کە بێ‌بڕوا بوون ( من یومهم الذی کانوا یوعدون ) لە سزای سەختی ئەو ڕۆژەی کە بەڵێنیان پێ‌دراوە لە لایەن پێغەمبەرەکانەوە کە ڕۆژی دوایی‌یە •

(١) واتە تۆ ئەگەر ڕاست ئەکەیت ، هەر سزایەك کە لە سەر بت‌پەرستی بەڵێنمان پێ ئەدەیت زوو بۆمانی بهێنە •

# سورة الطور

بسم الله الرحمن الرحيم

والطُّورِ (١) وكِتابٍ مسطور (٢)

---

# سوورەی (طور)ە

مەککی‌یە ، ٤٩ ئایەتە

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

سوێند بە کێوی توور (١) وە بە نامەی نووسراوە (٢)

---

# سوورەی (طورە)ە

مەککی‌یە ، ٤٩ ئایەتە

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

خوا لە سەرەتای ئەم سورەتەدا سوێند ئەخوات بە پێنج شتی زۆر گەورەو گرنگ، بۆ بەهێز کردنەوەی سوێند لە سەر خوراوەکە، کە ڕوودانی سزای ڕۆژی دوایی‌یە، ئەفەرموێ ( والطور ) سوێند بە تووری سینا کە شاخێکە لە «سینا»، حەزرەتی مووسا قسەی لە سەر کردووە لە گەڵ خوادا ، ( وکتاب مسطور )وە بە نامەیەك کە نووسراوە ،

فِي رَقٍّ مَنْشُورٍ (٣) والبَيْتِ الْمَعْمُورِ (٤) وَالسَّقْفِ الْمَرْفوعِ (٥) و الْبَحْرِ الْمَسْجُورِ (٦)

لــە پێستی کراوە (٣) وە بە خانەی ئاوا (٤) وە بە بانی بڵند کراو (٥) وە بە دەریای پڕ (٦)

(في رق منشور) لە پێستیکی یەکاڵا کراوەی خۆش کراو ، کە قورئانە، وە گەورەترین نامــەی ئاسمانی‌یە، ( والبيت المعمور ) وە بــەو خــــانەی ئاوەدانە کە کەعبەیە، کــە ئاوایە بــە نوێژکەرانو ڕۆژووگرانو خــوا پەرستان، وە لە هەموو کونو قوژبنی جیهانەوە مسڵمانان لــە نوێژدا ڕووی تێ‌دەکەن، وە هەمیشە مسڵمانان بە شەوو بە ڕۆژ بــە دەوریا ئەخولێنەوە ( والسقف المرفوع )وە بە بانی بڵندکراوی زۆر بەرز کــە ئاسمانە •

●

ئاسمان وەك سەربان وایە بۆ زەوی وەك لــە سوورەی (أنبيا)دا ئەفەرموێ « وجعلنا السماء سقفا محفوظا »[١] ( والبحر المسجور )وە بــە بە دەریای‌پڕلێوان‌لێو[١] ئەویان بە هەزاران هەزار ملیار ئەستێرەو مانگ‌و ڕۆژهەن بە ئاسمانەوە کە بەهێزی کێشندە ڕای‌گرتوون وە نایەڵێ بترازێن‌و بکەونە خوارەوە، وە ئەمیان هەر بەهێزی کێشندە دیسان ڕای گرتووەو نایەڵێ سەرڕێژ بکات بە سەر ووشکانیداو دای‌بۆشێ، شەپۆلی دەریــــا گەورەکان کە وەك کێو دێن‌و ڕوو ئەکــەنە قەراغی دەریا، لــەوێدا

(١) واتە ئاسمانمان کردووە بە بانێکی پارێزراو (بۆزەویی‌و ئادەمی‌یان)•

ئەپۆلەکە ئەشکێتەوەو ئەگەڕێتەوە•

پانو پۆڕیی دەریای هێمن «هادی» شەستو هەشت ملیۆن میل چوار گۆشەیە، قووڵییەکەی لە هێندی لاوە نۆ هەزارو چوار سەدو سیو سێ مەترە، ڕووی دەریا بە تێکڕایی دوو جارو نیو بە قەد هەموو ووشکانییە •

بە ڕاستی ئاسمانو دەریا دوو نیشانەی زۆر گەورەن لە سەر گەورەییو ئاگاداریی خوا، ئاسمان لە پانو پۆڕیو، فراوانیو، هاتو چۆی ڕۆژو مانگو ئەستێرەکانیو، هەڵاتنو ئاوابوونیانو، بەرودوا هاتنی شەوو ڕۆژو، تاریکیو، ڕووناکیو، ساڵو مانگو، هاوینو، بەهارو، پایزو، زستان • دەریاش لە گەورەییو فراوانیو بەرز بوونەوەی شەپۆلیو، نزم بوونەوەیو، هاتنو کشانەوەیو، هەڵگرتنی هەزاران هەزار کشتیو پاپۆڕو بەلەمی قورسو گرانو مامناوەندی لە سەر پشتیو، ژیانی هەزاران هەزار بە ملیۆنو بە بلیۆن گیاندارانی ئاویی لە ناویاو، بە هەزاران هەزار تەن دوڕو لوءلوءو، مەرجانو، بەردی بە نرخ•• ئەمانە هەموو لایەکیان بە سرپەوسرکە ئەچرپێنن بە کوێچکەی ئادەمیدا لە بابەت دەسەڵاتو کارسازییو، کردار جوانیی خواوە، وە بە سیخورمەو نوقورچ ئادەمیو گێژو وێژو خەو لێکەوتوو بێدار ئەکەنەوە، کە چاوێك هەڵبڕنو نەختێك وورد بنەوە •

خوای گەورە بەم پێنج شتە گەورانە سوێندی خوارد لە سەر ئەوەی کە ڕۆژی زیندوو بوونەوەو حسابو سزا بە بێگومان ڕوو

إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ لَوَاقِعٌ (٧)
مَا لَهُ مِنْ دَافِعٍ (٨) يَوْمَ تَمُورُ السَّمَاءُ مَوْراً (٩)
وَتَسِيرُ الْجِبَالُ سَيْراً (١٠) فَوَيْلٌ يَوْمَئِذٍ لِلْمُكَذِّبِينَ (١١)

بەڕاستی سزای پەروەردگاری تۆ ( بۆ بێبڕوایان ) ئەبێ (٧)
هیچ پاڵپێوەنەرێکی نی یە (٨) لە ڕۆژێکا کە ئاسمان (تێك ئەچێو) شەپۆل ئەدات بە شەپۆلدان (٩) وە شاخەکان ( لە جێی خۆیان ) ئەجووڵێن (١٠) ئنجا لەو ڕۆژەدا وای بۆ ئەوانەی کە ( فەرموودەی خوایان ) بە درۆ ئەزانی (١١)

ئەداو ئەبێ[١] وە هیچ شتێك نی یە کە بتوانێ پاڵی پێوە بنێو دووری بخاتەوە لە بێبڕوایان وە کو ئەفەرموێ سوێند بەمانەی پێشوو ( ان عذاب ربك لواقع ) بێگومان بۆ بێبڕوایان سزای خوای گەورە ئەبێ • ( ما له من دافع ) هیچ شتێك نی یە کە بتوانێ پاڵی پێوە بنێو دووری بخاتەوە ( یوم تمور السماء مورا ) لە ڕۆژێکا کە ئەم ئاسمانە ڕێكو پێكو قایمو بەهێزە تێك ئەچێو ئەکەوێتە جونبوشو پەلەپەلو شەپۆلدان وەك شەپۆلی دەریا دێتو ئەچێتو بەیەکا ئەدات ( وتسیر الجبال سیرا )وە شاخەکان لە جێی خۆیان ئەترازێن، وە لەبەر نەمانی هێزی کێشندە لە یەك هەڵ ئەوەشێنو ئەبن بە تۆزو ئەچن بە حەوادا ( فویل یومئذ للمکذبین ) ئنجا لەو ڕۆژەدا وای بۆ ئەو بێبڕوایانەی کە

(١) لە سوورەی «قەلەم»و «نازعات» دا فەلسەفەی ئەم جۆرە سوێندانەمان بە دوورو درێژی باس کردووە ، بچۆ بیخوێنەرەوە •

الَّذينَ هُمْ في خَوْضٍ يَلْعَبُونَ (١٢) يَوْمَ يُدعُّونَ الى نارِ جَهَنَّمَ دَعّاً (١٣) هذِهِ النّارُ الَّتى كُنْتُمْ بِها تُكَذِّبونَ (١٤) أَفَسِحْرٌ هذا ؟ أَمْ أَنْتُم لا تُبصِرونَ ؟ (١٥)

ئەوانەی کە بە قسەی هیچو پووچ یـاری ئەکەن (١٢) لە ڕۆژێـکا کە (بێبڕوایان) چنگ لە سەرشان ئەبرێن بۆ ئاگری دۆزەخ (١٣) •
(پێیان ئەووترێ) ئەمە ئەو ئاگرەیە کە بە درۆتان ئەزانی (١٤) ئایا ئەم ئاگری دۆزەخە جادووە ؟ یا ئێوە لێرەش نایبینن (١٥)

فەرموودەی خواو پێغەمبەریان بە درۆ ئەزانی ( الذين هم في خــوض يلعبون ) ئەوانەی کە بە قسەی هیچو پووچو گـاڵتە کردن بە قورئان یاری ئەکەن ( يوم يدعون الى نار جـنم دعا ) لە ڕۆژێـکا کە پاڵ بـە بێبڕوایانەوە ئەنرێ بە پاڵپێوەنانی بەهێز، وە چنگ لـە سـەرشان ئەیانبەن بۆ ئاگری دۆزەخ، تا نزیك ئەکەونەوە لە قەراغی دۆزەخو ئاگرەکەی ئەبینن، ئەو کاتە پێیان ئەووترێ ( هذه النار التى كنتم بهـا تكذبون) ئەمەیە ئەو ئاگرەی کە پێغەمبەر لە دنیادا ئەیترساندن لێیو پێتان باوەڕ نەئەکرد، وە ئەتانووت ئەم قورئانەی کە محمد هێناویێتی جادووی جادوگەرانە، ئنجا لە ڕووی گاڵتە پێکردنەوە پێیان ئەووتری ( افسحر هذا؟ ) ئایا ئەم ئاگرەی کـە وا بە چاو ئەیبینن، وە لە دنیـادا پێتـان ئەووتراو باوەڕتان پێ نەئەکرد، ئایا ئەمە ڕاستە؟ یا لێرەش جـادووتان لێکراوە، وەك بە محمدتان ئەووت « انما سكرت ابصارنا، بل نحن قوم مسحورون »[١] ( ام انتم لا تبصرون )یا پەردە بە سەر چاوتانا هـاتووەو

(١) واتە ئێمە چاومان بەستراوەتەوە، بەڵکو ئێمە گەلێکی جـادوو لێکراوین •

اصْلَوها ، فَاصْبِروا أَوْ لا تَصْبِروا سواءٌ عَلَيْكُم ، اِنَّما تُجْزَوْنَ ما كُنْتُم تَعْمَلونَ (١٦)

(جارێ) بچنە ناویەوە، ئنجا خۆتان ڕابگرن یا ڕانەگرن چونیەکە بۆتان، بێ‌گومان ئەوی لـــە دنیـادا کردووتانە ، ئەمڕۆ ئەوەتان دەست ئەکەوێت (١٦) •

هیچ نابینن؟ نەء ئەمە ڕاستە، نە جادووتان لێ‌کراوەو نە پەردەش بەسەر چاوتانا هاتووە •

لە دوای ئەم سەرکۆنەو گاڵتەپێ‌کردنە، ئنجا بێ‌ئومێدیان ئەکـات ئەفەرموێ ( اصلوها ) بچنە ناو دۆزەخەوە ( فاصبروا او لا تصبروا سواء علیکم ) ئنجا خۆتان ڕابگرن یا خۆتان ڕانەگرن چونیەکە بۆتان، بەڵام ئازاری دنیا وانی‌یە، ئەگەر خۆت بۆ ڕاگرت ئەوا ئافەرین ئەکرێیت، وە ئەگـەر خۆشت ڕانەگرت ئـەوا گاڵتەت‌پێ‌ئەکـەن، بەڵام لـــە ڕۆژی دوایيدا وانی‌یە، خۆت ڕاگریت‌و خۆت ڕانەگریت وەك یەکە، چونـکە ( ان ما تجزون ما کنتم تعملون ) ئەوی لە دنیادا کردووتانە ئەمڕۆ هـەر ئەوەتان دەست ئەکەوێتەوە •

★ ★ ★

لـە دوای ئەوەی کـە لە ئایەتەکانی پێشوودا باسی سزای سەختی بێ‌بڕوایانی کرد کە بە بێ‌گومان تووشیان ئەبێ، بێ ئەوەی بتوانن لـــە خۆیانی دوور بخەنەوە، یا لە دەستی ڕاکەن •

ئنجا باسی بڕواداران‌ی پارێزگاران ئەکات لە بەهەشتا، لـە گـەڵ باسی ئەو شتانەی کـە بۆیان ئامادە کراوە لە جێـگاو ڕێـگای خۆش‌و،

اِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَعِيمٍ (١٧) فاكِهِينَ بِمَا آتاهم رَبُّهُمْ وَوَقَاهُمْ رَبُّهُمْ عذابَ الْجَحِيمِ (١٨) كُلُوا وَاشْرَبُوا هَنِيئاً بِما كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ (١٩) مُتَّكِئِينَ على سُرُرٍ مَصْفُوفَةٍ ، وَزَوَّجْناهم بِحُورٍ عينٍ (٢٠)

---

بەڕاستی پارێزگاران لە ناو باخاتی بەهەشتو نیعمــەتانی زوران ( ١٧ ) بــەو شتانەی خــــوا پێداوون دڵشادن، وە پەروەردگاریان پاراستوونی لە سزای دۆزەخ (١٨) (فریشتەپییان ئەڵێن : حەزتان لــە چی‌یە) بیخۆنو بیخۆنەوەو نۆشی گیــانتان بێ بەهۆی ئــەو کردەوە (جوانا)نەی کە لە دنیادا کردووتانە (١٩) لە سەرتەختانی ڕیزکراو پاڵ ئەدەنەوە، وە جووتمان کردوون لە گەڵ حۆری‌یانی چاوجوانان (٢٠)

---

چەشمەندازی جوانو خواردنو خواردنەوەی نایابو، ڕابواردن لە گەڵ هاوڕێی گیانی بە دڵنیایی‌و سەرو دڵخۆشی‌یەوە ئەفەرموێ ( ان المتقين في جنات ونعيم ) بێ‌گومان پارێزگاران لــە باخاتی بە هەشتو نازو نیعمەتان ( فاكهين بمــا اتاهم ربهم ) دڵشــادن بەو نازو نیعمــەتانەی کــە پەروەردگاریان داوینێ ( ووقاهم ربهم عذاب الجحيم )وە پەروەردگاریان پاراستوونی لە سزای دۆزەخ ، فریشتە لە هەموو لایەکەوە پێیان ئەڵێن ( كلوا واشربوا ) بە ئارەزووی دڵی خۆتان بخۆنو بخۆنەوە ( هنيئا ) نۆشی گیانتان بێ، ئەمە پاداشی خۆتانە ( بما كنتم تعملون ) بەهۆی ئــەو کردەوە جوانانەی کە لە دنیادا ئەتانکرد ( متكئين على سرر مصفوفة ) پاڵی لێ ئەدەنەوە لــە ســەر کورسی‌و موبیلەی نەرمو شلی دانراوی ڕیزکراو لە تەنشت یەکەوە ( وزوجناهم بحــور عين )وە جووتمــان

والّذين آمَنوا و اتَّبعَتْهُم ذُرِّيَّتُهُم بايمان أَلْحَقْنا بِهِم ذُرِّيَّتَهم و ما اَلَتْناهُم من عَمَلِهِم مِن شَيْءٍ كلُّ امْرِيءٍ بِما كَسَبَ رَهين (٢١)

---

وە ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە، وە مناڵەکانیشیان دوایان کەوتوون لە بڕوادا ، ئێمە ئەو منالانە ئەگەیەنین پێیان، وە هیچ لــە کرداری باوکەکــان کـــەم ناکەینەوە ، هــەموو کــەسێك پابەستی کرداری خۆیەتی (٢١) .

---

کردوون لە گەڵ حۆرییانی چاو جوانان .

لــە دوای باسی نازو نیعمەتی خەڵکی بەهەشت، ئنجــا باسی خۆشییەکیتریان ئەکات ئەفەرموێ (والذين امنوا واتبعتهم ذريتهم بايمان) ئەوانەی کە بڕوایان بە خوا هێناوە، وە مناڵەکانیشیان دوای باوکەکانیان کەوتوون لە بڕوادا ( الحقنا بهم ذريتهم ) ئێمە ئەو منالانە ئەگەیەنین بە باوکەکانیان، واتە لە گــەڵ ئەوانا ئەبن، با پلەو پایەی خواپەرستیی ئــەو منالانەش نەگاتە پلەوپایەی باوکەکانیان، وە شایستەی ئەو جێگایە نەبن ، بەڵام خوا بە میهرەبانیی خۆی، وە لە بەر دڵی باوکەکانیان ئەو شــوێنە بەرزانەیان ئــەداتێ تا چــاوی باوکەکانیان بــە بینینی مناڵەکانیان ڕۆشن بێتەوە ( وما التناهم من عملهم من شيء ) ئێمە بەم چاکەیە کـــە ئەیکەین هیچ شتێك لــە پلەی باوکەکان کەم ناکەینەوە (کل امرء بما کسب رهين) هەموو کەسێکی گەورەی ژیر لە ڕۆژی دوایيــدا پابەستی کردەوەی

وَاَمْدَدْناهُمْ بِفاكِهَةٍ ولَحْمٍ مما يَشْتَهون (٢٢)
يَتَنازَعونَ فيها كَاْساً لا لَغْوٌ فيها وَلا تَأثيم (٢٣)

---

له هەموو جۆرە مێوەو گۆشتێك كه ئارەزووی ئەكەن پەی دەرپەی بۆیان ئەنێرین (٢٢) لەوێ پیاڵەی شەراب له یەك وەرئەگرن، نه قسەی هیچ‌و پووچی تیایەو نه گوناهكردن (٢٣) •

---

خۆیەتی‌و لێی ڕزگـــار نابێ ، هەر وەك هیچ كەسێك بـــه كردەوەی یەكێكی‌تر گیرۆدە نابێ •

ئنجا باسی ئەوە ئەكات كه خواردن خواردنەوەی بەهەشتی وە نەبێ ه تام‌و ڕەنگ‌و بۆن و ئەندازەدا هەمیشه وەك یەك وابن، بەڵكو ناو بە ناو ئەگۆڕرێن به پێی ئارەزووی خۆیان وەكو ئەفەرموێ ( وامددناهم بفاكهة وحم مما يشتهون ) له هەموو جۆرە میوەیەك‌و گۆشتێكی خۆش‌و تازە به تازە كه ئارەزووی ئەكەن پەی دەرپەی بۆیان ئەنێرین •

لـه دوای باسی خواردنی بەهەشتی‌یان، ئنجا باسی خواردنەوەیان ئەكات ئەفەرموێ ( يتنازعون فيها كأسا ) پیاڵەی شـەراب ئەوەندە بـــه ڕوزجی له دەستی یەكتری‌ی وەرئەگرن ئەڵێیت جەنـگی له سەر ئەكەن، بەڕەنـــگه یەكێكیان تۆزێـــكی لێ‌ئەخواتەوەو خێرا ئەیداته دەست هاوڕێـــكەی ، هـــەر وا ئەویش بۆ یەكێـكی‌تر تا خۆشی‌و پێـــكەنینیان ئەبجرێتەوە، ئنجا ئەو شەرابی بەهەشته ( لا لغو فيها ولا تأثيم )نه قسەی هیچ‌و پووچی تیـایەو نه قسەیەك كـه گوناه بێ، وەك جنێوو درۆو دڵی

ویَطوفُ عَلَیهِم غلمانٌ لَهُمْ کَاَنَّهم لؤْلؤٌ مَکْنون (٢٤)
وَاَقْبَلَ بَعْضُهم عَلی بَعْضٍ یَتَساءَلون (٢٥)

وە کوڕانی مانەندی مرواریی ناو پۆرگ ( لەپاكو تەمیزیـدا ) ئەگەڕێن بە سەریانا وەك خزمەتکار (٢٤) بەهەشتی‌یەکان ڕوو ئەکەنە یەکتری‌و پرسیار لە ( کردەوەی ) یەکتری ئەکەن ( ٢٥ )

---

یەکتری ئازاردان، واتە شەرابی بەهەشت سەرخۆشی نادات تا لـە کـاتی خواردنەوەیاندا بکەونە دەمقاڵی‌و جنێودان •

ئنجا باسی ئەو بەردەستانە ئەکات کە خواردن‌و خواردنەوە پێشکەش بـــە بەهەشتی‌یەکان ئەکـەن ئەفەرموێ ( ویطوف علیهم غلمـان لهم ) هاتوچۆ ئەکەن بە دەوریانا چەند خزمەتکارێـکی نەوجوانانی پاكو تەمیزی خۆیان ( کانهم لؤلؤمکنون ) ئەڵێیت مرواریی ناو سـەدەفن ، کـــە دەستی کەسیان لێ‌نەکەوتووە ، وە ئیش‌کردن‌و خزمەتـــکاری نەیژاکاندوون‌و چڵکنی نەکردوون •

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە ئەو بەهەشتی‌یانە پرسیار لە یەکتری ئەکەن کە بە چی ئەم پایەیەتان دەس کەوتووە ( واقبل بعضـهم علـی بعض یتساءلون ) بەهەشتی‌یەکان ڕوو ئەکەنە یەکـتری‌و پرسـیار لـە سەرگوزەشتی یەکتری ئەکەن کـە ئێوە چۆن بوون لـە دنیاداو چیتان

قالوا انا كُنَّا قَبلُ فــي اَهلِنا مُشفِقِينَ ( ٢٦ )
فَمَنَّ اللهُ عَلَينا وَوَقانا عَــذابَ السَّمومِ (٢٧)
اِنَّا كُنَّا مِنْ قَبْلُ نَدْعوهُ اِنَّهُ هُوَ البَرُّ الرَحيمْ (٢٨)

---

بە یەکتری ئەڵێن : ئێمــە لەمــەپێش لــە ناو کــەس‌و کارمــانا لــە خواترس بووین (٢٦)
خوا منەتی نا بە سەرماناو پاراستینی لە سزای ئاگری دۆزەخ (٢٧)
بەڕاستی ئێمە لەمەپێش خوامان بەڕاستی ئەپەرست کــە ئەوچاکە کەرێــکی میهرەبانە (٢٨))

---

کردووە ؟ ( قالوا انا كنا قبل في اهلنا مشفقين ) بەیەکتری ئەڵێن : ئێمە لەمەپێش لە دنیادا لە ناو ماڵ‌و منالانمانا لە خواو سزای ئەم ڕۆژە ئەترساین ( فمن الله علينا ) خوا بەمیهرەبانیی خۆی منەتی نا بە سەرماندا ( ووقانــا عذاب السموم )وە پاراستینی لە سزای ئاگری دۆزەخ ( اناكنا من قبل ندعوه ) ئێمــە بەڕاستی لە مەپێش خوامان ئەپەرست‌و هاوارمان لێ‌ئەکرد ( انه هو البر الرحيم ) کە ئەو خوایە لە گەڵ بەندەگانی خۆیا زۆر زۆر چاکەکەرو میهرەبانە •

* * *

لە دوای باسی سزای ڕۆژی دوایی کە هیچ گومانێــکی تیا نەیە ، وە ئەبێ هەربێ بۆ بڕوایان، وە لە دوای باسی گۆشەیەك لە نازو ئیعمەتی بەهەشت ، ئنجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر کە لە ئامۆژگاریی خۆی دوا نەکەوێ‌و گوێ نەدا بەوانەی کە بڕوای پــێ‌ناکەن‌و ، فڕوفێڵی لە گەڵ ئەکەن ، فەرمووی « فذكر » •

فَذَكِّرْ فَما اَنْتَ بِنِعْمَةِ رَبِّكَ بِكاهِنٍ ولا مَجْنُونٍ (٢٩)

( ئەی پێغەمبەر ) خەڵق بەیادی خوا خەریك بکە ، تۆ بە بەهرەی بەروەردگارت نە فاڵچیتو نە شێتیت (٢٩)

پێغەمبەر لە پێش پێغەمبەرێتی‌دا چل ساڵ لە ناو گەلەکەیا بووە ، وە ئەمەندە ڕەفتارپاكو بە بیرو ڕاستگۆ بووە ، گەلەکەی پـێ‌یان ئەووت : محمد ئەمین ، وە هیچ کارێکی گرنگیان بە بێ ئەو نەئەبڕی‌یەوە، کە لەگەڵ بوو بە پێغەمبەر لێی کـەوتنە تەقـە ، دەمێ پێ‌یان ئـەووت « کاهن » واتە فاڵچی ، دەمێ پێ‌یان ئەووت شێت ، دەمێکیش پـێ‌یـان ئەووت شاعیرو دەمێ پـێ‌یان ئەووت جادووگەر ، ئەم دوانەیان ـ کـە شاعیرو جادووگەرە ـ لە کاتێـکا پـێ‌یان ئەووت کە چەند ئایەتێـکی قورئانی بەسەرا بخوێندنایەتەوە ، ، وە واقیان ووڕبمایەو سەرســام بوونایە لە بەرزیی ووتارو مەبەستی قورئان •

ئنجا خوائەیەوێ سەبووریی پێغەمبەر بدات لەم قسانەی کە پـێی ئەڵین ، وە ئەم قسانە بـێ‌نرخ بکات ، تا زۆر دڵـگیر نەبێت ، وە خـوا خۆی شەهادەتی بۆ بدات کە بەهرەیەکی وای پـێ‌بەخشیوە زۆر لەوەوە دوورە کە فاڵچێتی‌و شێتێتی لەودا کۆبنەوە ، فەرمووی ( فذکر )ئـەی پێغەمبەر تۆ ئامۆژگاریی خۆت هەر بـکەو هیچ شتێك ساردت نەکاتەوە لێی ( فما انت بنعمة ربك بكاهن ولا مجنون ) تۆ بەهۆی ئەو بـەهرەی

أَمْ يَقُولُونَ : شاعِرٌ نَتَرَبَّصُ بِهِ رَيْبَ الْمَنونِ (٣٠)

بەڵـکو ئەڵێن ( محمـد ) شـاعیرەو چـاوەڕوانی مردنینی (٣٠)

سروش « وحی » و پێغەمبەرێتی‌یەی کە پەروەردگارت پێی‌داویت ، نـە فاڵچیت‌و نە شێتیت ، فاڵچی هەرچی بڵێ هەمووی لە ڕووی‌گۆترەوەیە ، لە دە قسەیا یەکێـکی بەڕاست دەرناچێ ، قسەکـانی تۆ هـــەمووی ڕاست‌و دروستن ، شێتیش هەرچی ژیری بێ نی‌یەتی ، بەڵام تۆ بـــە شەهادەتی هەموو دانیشتوانی مەککە ژیرترینی هەموویانیت ، لـە پاشـا فاڵچی‌و شێت زۆر لە یەکەوە دوورن ، چونکە هەرچی فاڵچی‌یـە لـە سەروسیماو شێوەی قسەکردنی ئەو کەسانەی کە فاڵیان بۆ ئەگرنەوە ، شت دەرئەهێنن ، کە ئەمە جۆرە زیرەکی‌و ژیری‌و بیرێـکی ئەوێ، کە شێت ئەمانەی هیچ نی‌یە ، کە واتـە قسەکانیـان دژی یـەکن • ئەگێڕنەوە کە ڕۆژێ گەورەکانی قورەیش لە یانەی خۆیان (دار الندوة) کۆ ئەبنەوە بۆ قسەکردن لە بابەت ڕزگاربوونیانەوە لە دەست پێغەمبەر، یەکێـکیان ئەڵێ : محمد شاعیرێـکە وەك « زهیر » و « نابغـە » ، دان بە خۆتانا بگرن تا ئەمیش وەك ئەوان ئەمرێ‌و ڕزگارمان ئەبێ لە دەستی ، ئنجا ئـەم قسەیەش ئەباتە دواوە ، ئەفـەرموێ ( ام یقولون شـــاعر ) بەڵـکو ئەڵێن ( محمد ) شاعیرە ( نتربص به ریب المنون ) چاوەڕوانیی چورتمێـکی ڕۆژگاری بۆ ئەکەین کە بێت‌و بیبا لەگەڵ خۆیا ، واتـە چاوەڕوانی مردنی ئەکەین کە بمرێ‌و ڕزگارمان ببێ •

ئنجا خوا پـێی ئەفەرموێ کە هەڕەشەیەکی پـێچراوەیان لێ بکات

قُلْ : تَرَبَّصُوا ، فَاِنِّی مَعَكُمْ مِــنَ الْمُتَرَبِّصِینَ ( ٣١ ) اَمْ تَأْمُرُهُمْ اَحْلامُهُم بِهذا ؟ أَمْ هُمْ قَوْمٌ طاغُونَ (٣٢)

( ئەی پێغەمبەر ) بڵێ : ئێــوە چاوەڕوانیی خۆتان بکەن ، منیش لەگــەڵ ئــێوەدا لە چاوەڕوانانم (٣١) یا خۆ ژیریی‌و بلیمەتی‌یان فەرمانیان پــێ ئەدات بەم قسە ناقۆڵایە ؟ بەڵــکو ئەمانە گەلێــکی یاخین (٣٢)

بە گاڵتە پــێ‌کردنەوە ، فەرمــووی ( قل تربصــوا ) پــێ‌یان بڵــێ ئەی‌پێغەمبەر : ئێوە چاوەڕوانی خۆتان بکەن ( فانی معکم من المتربصین ) کە منیش لەگەڵ ئێوەدا لەچاوەڕوانانم ، واتــە منیش چــاوەڕوانی لــە نــاوچوونی ئــێوە ئەکــەم وە بزانین خوا چــاوەڕوانی کــام لامــان ئەهێنێتە دی ؟ .

گەورە گەورەکانی قورەیش پێ‌یان ئەووترا : خاوەن‌ژیریی‌و بیر ، واتە تێ‌گەیشتوو ، ئنجا لێرەدا گاڵتەیان پــێ‌ئەکات بە خۆیان‌و ژیریی‌و بیریان ، بەرامبەر بە ئیسلام‌و پێغەمبەر ، وە پرسیار ئەکات بەگاڵتەوە ئەفەرموێ ( أم تامرهم احلامهم بهذا ؟ ) ئایا زیرەکی‌و ژیریی‌یەکەیان فەرمانیان بێ‌ئەدات بــەم قســە هیچ‌و پووچانەیان کــە هیچ بەیەکەوە نانووسێن ، کە وا دەمێك بە پێغەمبەر ئەڵێن فاڵچی‌و ، دەمێك پــی ئەڵێن شێت‌و دەمێك شاعیر ، کە ئەمانە دژی‌یەکن ، چونکە فاڵچی زۆر زیرەك‌و وریایەو لەگەڵ هەموو کەسێك بە پێی ئارەزووی خۆی قسە ئەکا،شێتیش بێ ژیریی‌و بیرە ، شاعیریش خاوەنی شیعری جوان‌و ڕێك‌و پێــکە کە لە عەروز دەرناچێ ، واتە پیاوی ژیر ئەم جۆرە قسانە ناکات کە وا دژی یەکترین ( ام هم قوم طاغون ) بەڵکو ئەمانە گەلێکی یاخی‌و سەرکێشن ،

أَمْ يَقُولُونَ تَقَوَّلَهُ ؟ بَلْ لا يُؤْمِنُونَ ( ٣٣ ) فَلْيَأْتُوا بِحَدِيثٍ مِثْلِهِ إِنْ كانُوا صادِقِين (٣٤)

یا ئەڵێن ( محمد ـ خۆی )قورئانی هەڵبەستووە ؟ ( نەء وانی‌یە ) ، بەڵکو بڕوا ناهێنن ( ٣٣ ) ئنجا ( ئەگەر وایە ) یا ئەوانیش فەرموودەیەکی وەك قورئان بێنن ئەگەرڕاست ئەکەن ؟ (٣٤)

وە لە بەر سەرکێشیی خۆیان ئەم جۆرە **قسانە ئەکەنو لە ڕێی** ڕاست لائەدەن ، کە واتە ئەمانە نەزیرن‌و نە تێ‌گەیشتوون ( ام يقولون تقوله ؟) یا خۆ ئەڵێن محمد خۆی قورئانی هەڵبەستووە بە دەم خواوە؟ نەء وانی‌یە (بل لايؤمنون) بەڵکو بڕوا ناهێنن ، وە بێ‌بڕوایی‌یەکەیان ئەم جۆرە قسانەیان پێ ئەکات ، ئنجا ئەگەر ڕاست ئەکەن کە ئەڵێن قورئان فەرموودەی خوا نی‌یە (فليأتوا بحديث مثله) با ئەوانیش (فەرموودە)یەکی وەك قورئان بێنن (ان كانوا صادقين) ئەگەر ڕاست ئەکەن ، کە زۆر شاعیرو ڕەوانبێژی زیرەکیان لە ناواهەیە ؟ ، ئنجا کە نەیانتوانی ، با بزانن کە ئەم قورئانە فەرموودەی خوایە ، وە (محمد) پێغەمبەرێکی ڕاست‌و دروستە •

دوای ئەوەی کە پێغەمبەرێتیی پێغەمبەری جێگیر کرد بە موعجیزەیەکی وەك قورئان ، وە ئەو قسانەی بردە دواوە کە گوایە فاڵچی‌یە ، یا شێتە ، یا شاعیرە ، وە فەرمانی دا بە پێغەمبەر کە گوێ نەداتە ئەم قسانەو ئامۆژگاریی خۆی بکات ، ئنجا هاتە سەر لێدوان (مناقشە)ی ئەو بێ‌بڕوایانەی کە بڕوایان بە خوا نی‌یە ، یا بڕوایان پێی هەیە ، بەڵام هاوبەشی بۆ پەیدا ئەکەن ، خوا بەم لێدوانە دەیەوێ دەمکوتیان بکاو

اَمْ خُلِقوُا مِنْ غَیْرِ شَیْءٍ أَمْ هُمُ الْخالِقونَ ؟ (٣٥)

ئایا ئەم دروستکراوانە (بە بێ دروستکەرێك) دروست بوون ؟ یا خۆیان خۆیانیان دروست کردووە ؟ (٣٥)

دەفەرموێ ( ام خلقوا من غیر شیء ) ئایا ئەم دروستکراوانە بە بێ دروستکەرێك دروست بوون ؟ ، کەی ژیر ڕێگای داوە کە دەرگایەکی دار یا ئاسن لە خۆیەوە پەیدا ببێ بە بێ وەستای خۆی ، یا کۆشکێك پەیدا ببێ بە بێ وەستایەك ؟ کە واتە بوونەوەرێکی وا گەورەو فراوان بە هەزار ملیۆن کاکەشانەوە ، وە هەر کاکەشانێکیشی بە سەدان ملیار ڕۆژو ئەستێرەوە چۆن لە خۆیەوە بە بێ دروستکەرێك هاتە دی ؟ ، واتە نابێ وورد ببنەوە لەو کەسەی کە دروستی کردوون ؟ ، تا بە دروست بوونی خۆیان خوا بدۆزنەوە ( ام هم الخالقون ) یا خۆیان خۆیانیان دروست کردووە ؟ کە ئەمە هەرگیز نەبووەو نابێ ، چونکە ئەگەر وابێ ؟ ئەبێ خۆیان لە بوونا لە پێش خۆیانا بووبن ، واتە خۆیان بە بێ ئەوەی کە دروستکەرن ، لە پێش خۆیانا بووبن ، بە پێی ئەوەی کە کراوون ، کە ئەمە هەرگیز نابێ ، کە وابوو هیچ نەمایەوە ئەوە نەبێ کە قورئان ئەیفەرموێ : کە خوا دروستی کردوون ، وە هەرچی هەیە دروست کراوی خوایە ، وە کەس هاوبەشی خوا نی‌یە لە دروست کردنا ، کە وابوو نابێ کەسیش هاوبەشی بێ لە پەروەردگاریی‌و خواپەرستیدا

أَمْ خَلَقُوا السَّماواتِ والارضَ بل لا يوقِنونَ (٣٦)
أمْ عِندَهُمْ خَزائِنُ رَبِّكَ امْ هُمُ الْمُصَيْطِرُونَ (٣٧)

یا ئەوان ئەمزەمین‌و ئاسمانەیان دروست کردووە ؟ بەڵکو بەڕاستی خوا نەناس‌و بێباوەڕن (٣٦) ئایا گەنجینەهای ڕەحمەتی پەروەردگاکاری تۆیان لە لایە یا هەر ئەوانن دەسەڵاتدار ؟ (٣٧)

ئنجا بە جۆرێکی بەهێزتر قسەیان لەگەڵ ئەکات‌و ئەفەرموێ ( ام خلقوا السماوات والارض) ئایا ئەوان ئەم زەمین‌و ئاسمانانەیان دروست کردووە؟، نـەء ، وانازانن ، وە هەرچەند ئەم پرسیارەیان لێ کرابێ ـ وەك قورئـان ئەفەرموێ « ولئن سألتهم من خلق السماوات والارض ليقولن الله[١] ـ دانیان بەوەدا ناوە کە ئەوان دروست کراوی خوان،بەڵام بڕوایان بە تاك‌و تەنیایی خوا نی‌یە وەکو ئەفەرموێ ( بل لایؤمنون ) بەڵکو ئەوان بڕوایان نی‌یە بەو وەڵامەی کە ئەیدەنەوە ، ئەگینا خوایان ئەپەرست ، وە هانایان بۆ ئەم بتانە نەئەبرد .

دوای ئـەوەی دەمـــکوتی کردن بە دروســت کردنی خۆیـان‌و بە دروستکردنی ئاسمان‌و زەوی ، ئنجا بە پلەیەك بەرەو خوارتر لـەوە دەمکوتیان ئەکات‌و ئەفەرموێ ( ام عندهم خزائن ربك ؟ ) ئایا خەزێنانـی ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆیان بە دەستە ؟ تا پێغەمبەرێتی ببەخشـن بـە هەرکەسێ کە خۆیـان بیـانەوێ ، وە بیـگرنەوە لـەو کەسانەی کـە نایانەوێ[٢] وە ڕۆزیی بدەن بەم بیگرنەوە لەو ( ام هم المصيطرون ) یا

(١) واتە ئەگەر لـــەم بێبڕوایانە بپرسییت : ئـــەوە کێیە کـــە ئاسمانەکان‌و زەویی دروست کردووە؟ بێگومان ئەڵێن خوایە .
٢) ئەمە گاڵتەیە پێیان ئەکات لە سەر ئەوقسەیەی کە هـــاوبەش

اَمْ لَهُمْ سُلَّمٌ يَسْتَمِعونَ فيه فَلْيَأْتِ مُسْتَمِعُهُمْ بِسُلْطانٍ مُبين (٣٨)

یا پەیژەیەکیان هەیە (کە پیاسەرکەوون بۆ ئاسمانو ) گوێ ئەگرن (لەو شوێنەی کە سرووشی لێوە دێ ؟ ( ئنجا ئەگەر وایە ) ئەوی گوێ ئەگرێ لەوان با لەگەڵ بەڵگەی ڕۆشنا بێ‌هێنێ (٣٨)

دەسەڵاتدارن بە سەر بوونەوە رداو زاڵن بە سەر ئاسمانو زەویدا ، تا هەڵیان سووڕێنن بە ئارەزووی خۆیان ، واتە : نەء ، ئەمانە هیچیان بە دەست ئەوان نی‌یە ، بەڵکو هەمووی هەر بە دەست خوایە ٠

ئنجا پلەیەکی‌تر ئەیانهێنێتە خوارەوە پرسیاریان لێ ئەکات : ئایا هیچ ڕێگایەکیان هەیە کە پیا سەرکەوون بۆ ئاسمانو گوێ بگرن لەو شوێنەی کە سرووشی لێوە دێ ، وەکو ئەفەرموێ (ام لهم سلم يستمعون فيه ) ئایا ئەوان پەیژەیەکیان هەیە کە پیا سەرکەوون بۆ ئاسمان ؟ ، وە گوێ بگرن لە قسەی فریشتەو ئەوی بە سرووش بۆیان دێ ، وە ئەوان لە بەرئەوە لە سەر قسەی خۆیان ئەمێننەوە ، ئەگەر وایە ( فليأت مستمعهم بسلطان مبين ) ئەوەی کە سەرئەکەوێ بۆ ئاسمانو دەنگو باس

=

پەیداکەرەکان ئەیانووت : « لولا نزل هذا القرآن على رجل من القريتين عظيم »واتە ووتیان بۆچی ئەم قورئانە نەنێررایە خوارەوە بۆ پیاوێکی گەورە کە (ولیدو حبیب)ە لە یەکێك لەم دوو دێیە کە مککەو طاییفە ٠

اَمْ لَهُ الْبَنَاتُ ولَكُمُ البنون (٣٩)

یا بۆ خوایە کچانو بۆ ێێوەیە کوڕان ؟ (٣٩)

وەرئەگرێ لەگەڵ بەڵگەی ڕوشندا بیهێنێ بۆ جێگیرکردنی قسەکەی خۆی ئەگەر ڕاست ئەکات ؟ •

واتە (محمد) کە ئەڵێ پێغەمبەرمو ، ئەم قورئانەم بە سرووش بۆدێت ، وە بێبڕواکان بە درۆی ئەزانن ، ئایا ئەم بێبڕوایانە هیچ زانیاری‌یەکی تریان هەیە کە زانیاریی پێغەمبەر بە درۆ بخاتەوە ، وە ئەو زانیاری‌یەیان تەوژمو تینێکی وای بێ بە سەر دڵو دەروونو بیرو باوەڕی مەردوما کە ناچار بن بە بڕوا پێهێنانی وەك تینو تەوژمی قورئانەکەی پێغەمبەر •

ئنجا قسەی ئەو کەسانە ئەباتە دواوە کە ئەڵێن فریشتە کچی خوان،وە گاڵتە بە ژیریی‌و بیریان ئەکات کە کچ بۆ خواو کوڕ بۆ خۆیان دائەنین ، ئەفەرمووی ( ام له البنات ولكم البنون ) ئایا وا ئەزانن کە کچان بۆ خوایەو کوڕان بۆ ێێوەیە ، لە کاتێکا کە خۆیان حەزیان لە کچ نی‌یە، وە ئەگەر پێیان بوترێ کە کچتان بووە لە داخانا ڕوویان ڕەش هەڵئەگیرسێ ، واتە هیچ شەرم ناکەن بەشە باشەکە ( بە بیرو باوەڕی خویان ــ م ) بۆ خۆیان دائەنێنو بەشە خراپەکەش بۆخوا •

لێرەدا ئاماژە « ئیشارە » هەیە بۆ ئەوە یەکێك ئەمە بیرو باوەڕی بێ هەرگیز بە ژیر دانانرێ ، چ جای ئەوەی دەستی بگاتە ئاسمانو گومانە « منشاء »ی وەحی‌و سرووش •

أَمْ تَسْأَلُهُمْ أَجْراً فَهُمْ مِنْ مَغْرَمٍ مُثْقَلُونَ ؟ ( ٤٠ ) أَمْ عِنْدَهُمُ الْغَيْبُ فَهُمْ يَكْتُبُونَ ( ٤١ ) أَمْ يُرِيدُونَ كَيْداً فَالَّذِينَ كَفَرُوا هُمُ الْمَكِيدُونَ (٤٢)

---

یا تۆ (ئەی محمد) لە بێبڕوایان داوای کرێ ئەکەیت وە ئەوان بەو تاوانە گرانبارن (٤٠) یا عیلمی غەیبیان هەیەو (بۆ خۆیانی) ئەنووسنەوە ؟ (٤١) ◆ یا فێڵێکیان ئەوێ بیکەن ؟ کە هەر بێبڕوایان فێڵ لێ کراوون (٤٢)

---

( ام تسألهم اجرا ) ئایا تۆ ـ ئەی پێغەمبەر ! ـ بەرانبەر بە مسڵمان بوونی هاوبەش پەیدا کەرەکان داوای کرێیان لێ ئەکەیت ( فهم ) ئنجا ئەو بێبڕوایانە ( من مغرم مثقلون ) بەو تاوانە گرانبارن ، واتە بەهۆی گرانیی باری غەرامەوە ناتوانن مسڵمان بن ◆

( ام عندهم الغيب فهم يكتبون ) یا عیلمی غەیبیان هەیە وە هەرچی لە عیلمی خوا دابێ ئەوان ئاگایان لێیەو ئەی نووسنەوەو ڕای ئەگەیەنن بە مەردوم ، وە هەرچی تۆش بیڵێیت ئەوان بە پووچی ئەزانن کە واش نییە ◆

لە دوای باسی ئەم دەمکوت کردنانە ، ئنجا باسی نابەکارییو فێڵی ئەو بێبڕوایانە ئەکات ئەفەرموێ ( ام يريدون كيدا ) بەڵکو ئەم هاوبەش پەیدا کەرانە ئەیانەوێ فێڵ بکەن لە پێغەمبەر هەروەك بڕیاریاندا لە (دار الندوە ) کە بیکوژن (فالذين كفروا هم المكيدون) ئنجا ئەوانەی کە بێ بڕوا

اَمْ لَهُمْ اِلهٌ غَیْرُ اللهِ ؟ سُبْحانَ اللهِ عَمّا یُشْرِکُونَ !(٤٣)
وَاِنْ یَرَوا کِسْفاً مِنَ السَّماءِ ساقِطاً

---

یا ئەو بێ‌بڕوایانە خوایەکی تریـان هەیە ؟ بە بێ‌خوای ڕاسـتی ! خوا پاکە لە هەموو هاوبەشێك کە بۆی پەیـدا ئەکەن (٤٣) وە ئەگـەر پارچەیەك لە ئاسمان ببینن بکەوێتە خوارەوە •

---

بوون هەر ئەوانن فێڵ لێ‌کراو ، واتە زەرەری ئەو فێڵە هەر یەخەگیری خۆیان ئەبێتەوە ، هەر وەك بوو ، وە لە غەزای بەدردا شکانو کوژرانو گیران بە دیل •

لە ( فتح البیان )دا ئەفەرموێ : «وا دەرئـەکەوێ کە ئـەم ئـایەتە ئیخبار بە غەیب بێ ، چونکە سوورەتەکە مەککی‌یە ، ئەم فێڵە لەمەککەو لە شەوی کۆچی پێغەمبەرا کرا بۆ مەدینە کە پێغەمبـەر بکـوژن ، دوای دووساڵ جەنگی بەدر ڕوویدا ، وە حەفتاش بە دیل‌گیرا ، ( ام لهم اله غیر الله ) یا ئەو بێ‌بڕوایانە خوایەکی تریان هەیە بەبێ خوای تاكو تەنیـا ، یارمەتی‌یان ئەداتو ئەیانپارێزێ لە سزای ڕۆژی دوایی (سبحان الله عما یشرکون ) خوا پاکە لە هەموو هاوبەشێك کە بۆی پەیدا بکرێ •

ئیتر چی‌ماوە دوای ئەم هەموو بەڵگانەی کە هێنایەوە ، واتە هیـچ نەماوە هەر مەگەر لاساری‌و سەهەندەیی نەبێ ، وەکو ئەفەرموێ ( وان یروا کسفا من السماء ساقطا ) ئەگەر پارچەیەك لە ئاسمان ببینن‌و بکەوێتە خوارەوە باوەڕی پێ ناکەن ، وە لە بێ‌بڕوایی‌یەکەیان نایـان گێڕێتـەوە

یَقولُوا : سَحابٌ مَرْکومٌ ( ٤٤ ) فَــذَرهم حَتَّى يُلاقُوا يَوْمَهُمُ الَّذی فيــهِ يُصْعَقونَ (٤٥) يَوْمَ لا يُغْنِي عَنْهُمْ كَيْدُهُمْ شَيْئاً وَلا هُمْ يُنْصَرونَ (٤٦)

---

ئەڵێن (ئەمە) هەورێـکی بە سـەریەکا کەوتـووە (بـارانمان بـۆ ئەبارێنێ ) (٤٤) (ئەی پێغەمبەر ! ) دەستبەرداری ئەمانە بە ، تا دووچاری ڕۆژێکیان ئەبن کە تیا لە ناو ئەچن (٤٥) ، ئەو ڕۆژەی فڕو فێڵەکانیـان (بۆ لە ناو بردنی تۆ) بە هیچ دەرئەچێ ، وە هیچ یارمەتی‌یەك نادرێن(٤٦)

---

بەڵکو ( یقولوا : سحاب مرکوم ) ئەڵێن ئەمە هەورێکی توێ‌توێ‌یەو بـە سەر یەکا ئەکەوێ تا قورس ئەبێ‌و ئەبارێنێ •

ئنجا خوا بە پێغەمبەر ئەفـەرموێ (فذرهم) وازیـان لێ‌بێنـە (حتى يلاقوا يومهم الذي فيه يصعقون ) تا ئەگەن بە ڕۆژێـکیان ــ وەك ڕۆژی دوایی بێ ــ کە تیا بە هیلاکا ئەچن (یوم لایغنی کیدهم شیئا) ئەو ڕۆژەی کە فڕوفێڵەکانیان بۆ لە ناو بردنی تۆ ئەی پێغـەمبەر بـە هیـچ جـۆرێ بەکاریان نایەت (ولا هم ينصرون) وە هیچ کەسێك یارمەتی‌یان نادات ، وە لە سزای ئەو ڕۆژە دووریان ناخاتەوە •

ئنجا وەنەبێ بەجێ‌یان بێڵێ بۆ سـزای ڕۆژی دوایی بـە تەنهـا ــ کە زۆر دوورە ــ بەڵکو مژدەیان ئەداتێ بە سزایـەکی نزیـکتر لـە دنیادا ، وەك سزای جەنگی (بەدر)بێ ، کە تیا کوژران ، یا بە دیل گیران

وَاِنَّ لِلَّذِینَ ظَلَمُوا عَذاباً دُونَ ذلِكَ ، ولٰكِنَّ أَكثَرَهُمْ لا یَعْلَمُونَ ( ٤٧ ) واصْبِرْ لِحُكْمِ رَبِّكَ فَاِنَّكَ بِأَعْیُنِنا ، وَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ حینَ تَقُومُ (٤٨)

---

بەڕاستی بۆ ئەوانەی کە ستەمیان کردووە لە خۆیان ( بەبێ بڕوایی) سزایەك ئەبێ لە پێش سزای ڕۆژی دوایدا (کە سزای بەدرە) بەلاَم بەشی زۆریان نایزانن (٤٧) خۆت ڕابگرە بۆ فەرمانی پەروەردگارت ، بێ گومان تۆ لە ژێر چاودێری ئێمە دایت ، وە هەرچەند هەستایت ( بۆ کارێك ) تەسبیحات بکە بە ستایشی پەروەردگارت (٤٨)

---

ئەفەرموێ (وان للذین ظلموا) بەڕاستی هەیە لە دنیادا بۆ ئەوانەی کە ستەمیان کرد لە خۆیان بە گوناه کردنو بێ‌بڕوایی (عذابا دون ذلك) سزایەك لە پێش سزای ڕۆژی دوایدا ، وەك سزای (بەدر) بێ ( ولکن اکثرهم لایعلمون) بەلاَم بەشی زۆریان نایزانن •

ئنجا سوورەتەکە تەواو ئەکات بە فەرماندان بە پێغەمبەر بە دان بە خۆدا گرتن بەرانبەر بە زۆرو ستەمو سەرکێشیو دەمدرێژیی بێ‌بڕواکان ، وە دڵنیا کردنی پێغەمبەر بە چاودێریی خوا بۆی ئەفەرموێ (واصبر لحکم ربك) خۆت ڕابگرە بۆ فەرمانی پەروەردگارت ، وە تەنگەتاو مەبە لە دواکەوتنی سزایانو مانەوەت لە ناویانا بە ناڕەحەتی (فانك باعیننا) بێ‌گومان تۆ لە ژێر چاودێرییو ئاگاداریی ئێمە دایت ، چاومان لێتە کەس ناتوانێ دەس‌درێژیت بۆ بکات •

ئنجا خوا ئەیەوێ پێغەمبەر چەکدار بکات بە چەکێکی گیانی ، چەکی خواپەرستیو تەسبیحات بە ناوی خوای گەورە ، ئەفەرموێ (وسبح بحمد ربك حین تقوم) خوا بە پاك ڕابگرە لە هەرچی شتێك کە

وَمِنَ اللَّيْلِ فَسَبِّحْهُ ، وَإِدْبَارَ النُّجُومِ (٤٩)

وە تەسبیحات بکە لە بەشێك لە شەوا ، وە لە کاتی پشت هەڵکردنی ئەستێرەکانا (٤٩)

شایستەی ئەو نەبێ ، وە تەسبیحات بکە بە ستایشی پەروەردگارت ، واتـە هەرچەند هەستایت لە خەو ، یا لە کۆڕێك ، یا هەستایت بۆ نوێژ کردنێك، یا بۆ چوونێك لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێـکیتر ، بـڵێ « سبحانـك اللهـم

وبحمدك اشهد ان لا اله الا انت استغفرك واتوب اليك» وە پێغەمبەر هەمیشە ئەم ویردەی بە سەر دەمـەوە بووە (ومـن الليـل فسبحـه)وە تەسبیحات بکە لە بەشێك لە شەوا ، کاتێـك کە شـەو ئەزرنـگێتەوە ، وە هۆش‌و بیرت کۆ ئەبێتەوە ، وە خەڵق ئەنوێ‌و جیهان کش‌ومات ئـەبێ (وادبار النجوم)وە لە کاتێکا کە ئەستێرەکان پشـت هەڵئـەکەن لەگەڵ شەبەقدا ، واتە هەمیشە خوات لە دڵابێ‌و بە سەر دەمتەوە بێ ، چونـکە ئەمە بڕوات بەهێز ئەکات‌و ترست بە با ئەدات‌و زاڵـت ئەکات بە سـەر دوژمنەکانتا •

# سورة النجم

## بسم الله الرحمن الرحيم

والنَّجْمِ اِذا هَوى (١) ما ضلَّ صاحِبُكم

## سوورەی (نجم)ە

## مەککی یە، (٦٢) ئایەتە

بە ناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

سوێند بە ئەستێرە لە کاتێکا کە ئاوا ئەبێ ( ١ ) هاوڕێـکەتان ( کە «محمد»ە ) لە ڕێ لای نەداوە

## سوورەی (نجم)ە

### بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

( والنجم اذا هوى ) سوێند بە ئەستێرە لـە کاتێکا کـە ئاوا ئەبێ • بۆیە لەم کاتەدا سوێندی پێ ئەخواﷲ ، چونکە ئەستێرە کە ئاوا بوو ئیـتر نە ڕووناکیی ئەمێنێو نە تینو تەوژم ، وە ئەوەدەمە نیشـان ئـەدات کـە کارکەر ( مؤثر )ی هەمیشەیی ئەستێرە نی یە ئـەگینا ئـاوا نە ئـەبوو ، وەخۆی نەئەشاردەوە ، بەڵکو شتێکی‌ترە کە خوایە •

دوور نی یە مەبەس لەم ئەستێرەیە ئەستێرەی گەلاوێژ بێ کە زۆر کەس پەرستوویەتی ، وە ناوی دێ لە دوای ئەم سوورەتەدا کە ئەفەرموێ «وانە هو رب الشعري» واتە خوا خوای گەلاوێژە ، ئنجـا سـوێند بـەم ئەستێرەیە ( ماضل صاحبكم ) گومڕا نەبووە هاوڕێکەتان کە (محمد)ە ،

وَما غَوى (٢) وما يَنْطِقُ عَنِ الْهَوى (٣) اِنْ هُوَ اِلاّ وَحْيٌ يوُحى (٤)

---

وە ڕێی وون نەکردووە (٢)وە لە خۆیەوە قسە ناکات (٣) هەرچی ئەڵێ (هەمووی) هەر سرووشە بۆی ئەکرێ (٤)

---

واتە ئەو (محمد)ەی کە لە منالّی‌یەوە لە ناوتانایەو هاوڕێتانـە ، وە زۆر ژیرو بەبیرە ، وە تا ئێستا درۆتان لێ نەبیستووە ، ئێستا کە چۆتە ساڵەوە لـە جـاران ژیر ترو بەبیرترە ، چـۆن درۆ ئـەکاتو ، لـە ڕێی ڕاست لائـەدات ( ومـاغوى )وە ڕێـی وون نـەکردووە ، ( وما ينطـق عـــن الهوى)وە هەرگیز بە هەواو هەوەس قسە ناکات ، ئنجا بۆ پشتگـیریی ئەم سێ قسەیە ئەفەرمۆی (ان هو الا وحي يوحي) هەرچی ئەڵێ لە ئایەتی قورئانو شتی دینیو کاروباری دنیایی ، هەمووی هەر سرووشەو بـۆی ئەکرێ ، لە کوێ ئادەمی‌یەکی نەخوێندەوار ـ با زۆر زیرەكو بلیمەتیش بێ ـ ئەتوانێ دینێكو یاساو شەریعەتێك دابنــێ بە ڕەنـگیك هــەرچی ئادەمی ـ ڕۆژێك لە ڕۆژان ـ پێویستی بێ ، هەمووی بڵێ بە بێ زیادو کەم ، وە بە بێ پێچو پەنـا •

وەك بارەها نووسیومانە لەجزمی «تبارك»و «عم»ە دا : خوا بەشتێك سوێند ئەخوات کە زۆر بە کەڵك بێ بۆ ئادەمی تا ئاووڕێکمان پێ بداتەوە بە لای ئەو شتانەدا بۆ لێووردبوونەوەیان ، ئەوە ئاشکرایە کە ئەستێرە لە شەوا بۆ ئادەمی نەخوازەلا لە دەریادا وەك گوڵۆپی ســەوزو سوورو

عَلَّمَهُ شَدِيدُ الْقُوَى (٥) ذُو مِرَّةٍ

دەرسی داداوە (فریشتەیەکی) زۆر بەهێز (٥) ژیریکی خاوەن شکۆهە

ئامارەکان «ئیشارات»ی سەر شاڕێو شەقامەکان وایە ، بێ گومان ئەگەر ئەستێرە نەبوایە ، هاتوچۆی سەرزەوی نەئەبوو بەم ڕێك‌و پێکی‌یە ، نە لە دەریاو نە لە ووشکانی‌دا ، وەك خوا ئەفەرموێ «وبالنجم هم يهتدون» واتە ئەوان بە ئەستێرە ڕێ ئەدۆزنەوە •

هەروا ئاشکرایە لە هەموو کەسێکەوە ئەوەتی دنیا دنیایە ئەم هەموو مانگ‌و ڕۆژو ئەستێرانەی بە ئاسمانەوەن‌و ، هەڵدین‌و ئاوائەبن ، بێ ئەوەی یەکێکیان پاش‌و پێش بکەوێ ، یا بە قەد سەری موویەك لە ڕێی خۆی لابدات ، یا ڕێی لێ وون ببێ کە واتە بەم سوێندە ئەمەش نیشان ئەدات کە هەر وەك سوێند پێ‌خوراوەکە ـ کە ئەستێرەیە ـ هەرگیز لە ڕێی خۆی لانادات‌و ڕێ وون ناکات ، سوێند لە سەر خوراوەکەش ـ کە بوونی پێغەمبەرە لە سەر ڕێگایەکی ڕاستە ، بێ ئەوەی سەری لێ تێك بچێ‌و ڕێ وون بکات ـ وایە •

(علمه) ئەم سرووشەی فێرکرد (شديد القوى) فریشتەیەکی زۆر بەهێزو توانا ، چ لە ڕووی زانین‌و چ لە ڕووی کردەوەوە ، واتە زاناو ئیش‌کەرە ، وە هەر ئیشێکی پیا بدرێ لە خواوەیە ، هەرچەند گران بێ ئەیکات بە بێ دواکەوتن •

ئەمە هیچ گومانێکی تیا نی‌یە کە تەعریفی مامۆستا تەعریفی قوتابی‌یە ، چونکە تا مامۆستا زاناترو داناتر بێ قوتابی‌یەکەشی زاناو دانا ئەبێ ( ذو مرة ) خاوەنی ژیریی‌و بیرێکی بەرزە ، بە جۆریکی وا کە

ئەو سرووشە لە خواوە وەربگرێو بیهێنێ بۆ پێغەمبەر بە بێ لە بیر چوونەوە •

ئەمڕۆ زانایانی گیان (مەبەستی زانایانی ئەرواحە ـ م ) لە ئەوروپا بڕوایان هێناوە بەهێزو دەسەڵاتی عالەمی گیان ، وە بەو خەواریقو عاداتەی کە هەیانە •

«ئولیفرلودج» ئەڵێ : من ئەمڕۆ بێگومانم کە ئێمە گەمارۆ دراوین بە عالەمێکی وا بەهێز کە ئێمە لە چاو ئەو عالەمەدا ، وەك مێرووله واین، وە ئەو عالەمە یارمەتیمان ئەدەنو چاودێریمان ئەکەن ، لە پاشا ئەڵێ : ئەم زانیاری «معلومات»یەم پەیدا کردووە بە شێوەیەکی عیلمی کە ئامادە کردنی گیانە ، لە پاشا ئەڵێ ئەگەر پێغەمبەران بڵێن فریشتەمان دیوە ڕاست ئەکەنو ، قسەکەیان جێی گومان نییە •

ئەمڕۆ هیچ گومانێك نییە لە ئەخبارەکانی قورئاندا ، چونکە هەرچی لەوانەبێ کە پەیوەستی بە عالەمی ئەرواحەوە بێ ، ئەمڕۆ وەکو بابەتێکی زانیاری ئەخوێنرێو بە دەرس ئەووترێتەوەو ، بە هەموو جیهاندا بڵاو بۆتەوە ، لەم ڕووەوە ئەمانە زانستیی ڕۆحیو دۆزینەوەی بابەتانی زانستیی تازەن ، هەر خوا ڕاستەوڕاست ئەفەرموێ : « سنریهم آياتنا في الأفاق وفي انفسهم حتى يتبين لهم انه الحق »(١) •

ئەمڕۆ هێزی جەستەییو زیریی جیهانی ڕۆح بە تەواوی

(١) واتە ئێمە نیشانەی دەسەڵاتی خۆمان لە ئافاقی جیهانو نفوسی بەندەگانا بە تەواوی ئاشکرا ئەکەین تا باش دەرکەوێ کە خوا ڕاستو دروستو حەقە •

فَاسْتَوَى (٦) وَهُوَ بِالْأُفُقِ الْأَعْلَى (٧) ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّى (٨) فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَى (٩)

---

ئنجا وێستا (٦) وە بە ئاسۆی بڵندی ئاسمانەوە بوو (٧) لە پاشا نزیك کەوتەوە (لە پێغەمبەر)و هاتە خوارەوە(٨) بە قەد دوو کەوان یا کەمتر(٩)

---

دەرکەوتووە لای زۆر لە زانایان لە ڕێی ئامادەکردنی گیانو « تەنویمی مغناتیسی‌یەوە » (١) ٠

پێغەمبەر زۆر ئارەزووی ئەکرد کە فریشتەی سرووش بە شکڵو وێنە «صورة»ی خۆی ببینێ ، بە دڵ داوای لە خوا ئەکرد کە بەو ڕەنگە جارێك نیشانی بدات ، تا چاوی پڕببێ لە بینینیو پێی دڵنیابێ ، خودا داواکەی گیرا کرد ، وە دوای ئەو ماوەیەی کە سرووش لە پێغەمبەر بڕا جبیریل بە وێنەی فریشتەیی خۆیەوە هاتە خوارەوە بۆ لای ، (فاستوی)وە ڕاست وێستا (وهو بالافق الاعلی)وە ئەو فریشتەیە بە ئاسۆی بەرزەوە بوو ، واتە کەمێ لە ئاسۆ بەرزتر ، وە ئاسۆکەی پڕ کردبوو (ثم دنـا) لە پاشا نزیك کەوتەوە لە پێغەمبەر (فتدلی)وە بە سرووشەوە هاتە خوارەوە بۆ خزمەتی ، وە کەم کەم لێی نزیك کەوتەوە ، تا وای لێ‌هات (فکان قاب قوسین او ادنی) ماوە لە نێوانیانا بە قەدەر دوو کەوان یا کەمتر لە دووکەوان بوو ٠

باوی عەرەب وابووە ماوەی کەمیان لە ناوەندی دووشتا بە ماوەی کەوانێك یا دووکەوان یا ڕمێك داناوە ، هەر وەك لە ناو ئێمە دا دائەنرێ

---

(٢) تا ئێرە بەم دەقەوە لە تەفسیری مەراغیدا هەیە (م-ئەردەڵانی) ٠

فَأَوْحى الى عَبْدِهِ ما أَوْحى (١٠)
ما كَذَبَ الْفُؤادُ ما رَأى (١١) اَفَتُمارونَهُ عَلى ما
يَرى (١٢) وَلَقَدْ رَآهُ نَزْلَةً أُخْرى (١٣)

---

ئنجا ( خوا ) سرووشی بۆ کرد ئەوی کە بۆی کرد (١٠)
ئەوی (محمد) دی بە درۆی نەزانی (١١) ئایا (بێ بڕوایان) ئینکاری ئەوە ئەکەن کە پێغەمبەر بە چاوی خۆی ئەی بینێ ؟ (١٢) بێ گومان جارێکی تر جیبریلی دی (بەوێنەی خۆی لە شەوی میعراجا) (١٣)

---

بە پەنجەیەك یا بە بستێك ، یا بە هەنگاوێك ، یا بە گوریسێك (فاوحی الی عبده ما اوحی) ئنجا خوا سرووشی بۆ بەندەی خۆی کرد کە (محمد)ە بەهۆی ئەم فریشتەیەوە بەو سرووشەی کە بۆی کرد لە بابەت دینەوە •

لە بەر ئەوەی کە ئادەمی زۆر جار ئەوی بە چاو ئەیبینێ ، وائەزانێ کە خەیاڵە ، وە ئەوی بۆی دەرئەکەوێ دڵی باوەڕی پێ ناکات و بە ئەوهامی ئەزانێ ، خوا دوا بە دوای ئەم باسە هات بە باسێکی وادا کە نیشان بدات کە پێغەمبەر لە چاوپێکەوتنی جیبریل بە وێنەی خۆی هیچ بە دڵیا نەهاتووە کە ئەمە خەیاڵ و گومانە فەرمووی (ماکذب الفوءاد ما رأی) ئەوی کە لە پەردەی غەیبا بە چاو دی و دڵیشی بڕوای پێ کردو بە ڕاستی زانی ، وە بە ئەوهام و خەیاڵی نەزانی (افتمارونه علی مایری) ئایا بێ بڕوایان ئینکاری ئەوە ئەکەن کە پێغەمبەر بە چاوی خۆی ئەی بینێ و پێی بڕوا ناکەن و دەمقاڵی لەگەڵ ئەکەن ؟ لە کاتێکا کە ئەم بینینی پێغەمبەرە بۆ جیبریل بە وێنەی خۆی یەکەمین جار نی یە بەڵکو جارێکی تریش هەر بە وێنەی خۆی چاوی پێ کەوتووە وەکو ئەفەرموێ (ولقد رآه نزلة اخری) بێ گومان پێغەمبەر جارێکی تر جیبریلی بە وێنەی خۆی لە شەوی

عِنْدَ سِدْرَةِ الْمُنْتَهى (١٤) عِنْدَها جَنَّةُ الْمَأْوى (١٥)

لای (سدرة المنتها)وە (١٤) کە لای ئەوەوەیە بەهەشتی ئارامگا (١٥)

میعراجا دی (عند سدرة المنتهی) لای درەختی «سدرە» کە هەرچی گوفتارو کرداری جیهانیان هەیە تا ئەوێ ئەڕواو سەر ئەکەوێ « الیه یصعد الکلم الطیب والعمل الصالح یرفعه)(١) واتە کردەوی بەندەگان تا «سدرة المنتهی» ئەڕوات ، هەر وەك فریشتەش تا ئەوێ ئەڕوات ، لەوەولا نە کەس ئەیگاتێو نە کەس ئەزانێ چی‌یە ؟ ، لە شەوی میعراجا جیبریل لەگەڵ پێغەمبەرا ڕۆی تا گەیشتە « سدرة المنتهی » لەوێ ئیتر جیبریل وێستا ، وە پێغەمبەر بە تەنها ماوەیەکی‌تر ڕۆی ، وەك مەلا محەممەدی خاکی لە چەکامەی نووردا ئەڵێ :

لە سیدرە منتهای سەیرو صغیری پەڕی جیبریل بوو

تەجەللی ئاگرەو پەڕ ، پووشەکەی ئەم ووردە هەردانە

(عندها جنة المأوی) بەهەشتی ئارامگاهـ لە نزیك سدرەوەیە ، واتە ئەو بەهەشتەی کە ئارامگاهی پیاوچاکانو خواپەرستانە نزیکە لە «سدرة المنتهی »وە •

ئنجا باسی ئەو شتە ئەکات کە لە کاتی چاو پی‌کەوتنەکەدا ڕوویداوە

(١) واتە هەر بۆ لای خوا بەرز ئەبێتەوە، ووتەی تاكو تەنیایی خـوا کە « لا اله الا الله »یە لە گەڵ کردەوەی باشا •

اِذْ يَغْشَى السِّدْرَةَ ما يَغْشى (١٦) ما زاغَ الْبَصَرُ وَما طَغى (١٧) لَقَدْ رَأى مِنْ آيات رَبِّهِ الْكُبْرى (١٨)

---

کاتێ کە «سدرە»ی داپۆشی ئەوی کە دای‌پۆشی (١٦)
چاوی پێغەمبەر ئەم‌لاو ئەولای نەکرد ، وە لە مەبەست تێ‌نەپەڕی (١٧)
بەڕاستی پێغەمبەر زۆر نیشانەی گەورەی پەروەردگاری خۆی دی (١٨)

---

ئەفەرموێ ( اذ يغشى السدرة ما يغشى ) لە کاتێکا سدرەی داپۆشی ئەوی کە دای‌پۆشی ، بەم نەزانراوی‌یە « الهام » ئەیەوێ ئامازە (ئیشارە) بکات کە زمان کۆڵە لە باسی گەورەیی‌و زۆریی ئەوەی کە بە سەر «سدرە»دا هات لە نووری تەجەللای خواو ، دابارینی فریشتە بە سەریا بۆ زیارەت کردنی ، وەك داباریني مەردوم بە سەر کەعبەدا لەکاتی حەجا •

ئەمانە کە پێغەمبەر لە شەوی میعراجا دیونی هەموویان شتی غەیبین ، وە لە مە زیاتر قسەی تیا نەکراوە لە بەر ئەوە لە ووزەی ئێمەدا نی‌یە لەمە زیاتر قسەی لێ بکەین •

ئنجا باسی ئەدەبی پێغەمبەر ئەکات‌و ئەفەرموێ ( ما زاغ البصر ) چاوی پێغەمبەر ئەم‌لاو ئەولای نەکرد ، (وما طغى)وە لەوێ کە فەرمانی پێ‌درابوو تەماشای بکات لای نەدا واتە لەو شەوە بە فەڕە ، وە لەو نوێنە پیروزە بەلای هیچ شتێکا ئاوڕی نەدایەوە ، وە چاوی دڵی بڕیبووە نیشانانی خوا کە یەکێکیان وێنەی سەرەکیی جیبریل بوو (لقد رأى من آيات ربه الكبرى) بە ڕاستی پێغەمبەر زۆر لە نیشانەی گەورە گەورەی

اَفَرَأَیتُمْ اللاتَ وَالْعُزّی (١٩) وَمَناةَ الثالِثَةَ الأُخْری ؟ (٢٠)

( ئەی هاوبەش پەیداکەران ) ئایا لاتوعزی (کە دوو بتی گەورەتانن) دیتانن کە بێ کەڵکن (١٩)وە بتی سێهەمتان دی کە مەناتی بێ نرخە ؟ (٢٠)

پەروەردگاری خۆی دی ، وەك «سدرة المنتهی»و وێنەی ئەسڵیی جیبریلو گەلێ شتی تربێ •

★ ★ ★

لە دوای ئەوەی کە پێغەمبەر ( دروودی خۆای لێ بێ ) زۆر شتی گەورە گەورەی دی لە شەوی میعراجا ، ئنجا لە ڕووی سەرکۆنەوە بە هاوبەش پەیداکەرەکان ئەفەرموێ ( افرأیتم اللات والعزی ) ئایا ئێوە چیتان دیوە لەم دوو بتە بێ کەڵکە کە «لات»و «عزی»یە (ومناة الثالثة الاخری )وە چیتان دیوە لە بتی سێهەم کە «مناة»ە ، وە بەپلەو پایە لە دوای دوانەکەی ترەوەیە ، وە هەمیشە بە گەورەیان ڕائەگرنو کۆشکیان لە سەر دروست ئەکەنو پەردەیان لە سەر دائەدەنەوەو زێدەوانیان بۆ ڕائەگرنو قوچیان بۆ ئەبەنو ئاژاڵیان بۆ سەر ئەبڕنو بە دەوریانا ئەخولێنەوەو داوای شتی وایان لێ ئەکەن کە هەر ئەبێ لە خوا داوا بکرێن (١) ئایا ئەم بتانە هیچ سرووشێکیان بۆ ئێوە کردووە ؟ وەك خوا

(١) وا دەرئەکەوێ ئەم بتانە نیشانەی فریشتە بوون، کە فریشتە بەلای هاوبەش پەیدا کەرەکانەوە کچی خوان، بۆیە ئەیان پەرستن، وە ئەم بتانەش بە مێ دانراوون، لە پاشا نیشانەکەیان لە بیر چۆتەوە وە ئەم نیشانانە بوون بە پەرستراو •

اَلَــكُمُ الــذَكَرُ وَلَهُ الأُنثى ( ٢١ ) تِلْكَ اِذاً قِسْمَةٌ ضيزى (٢٢) اِنْ هِيَ اِلاّ أَسْماءٌ سَمَّيْتُموها أَنْتُمْ وَآباؤُكُمْ

ئایا ئێوە کوڕتان بێ‌و خوا کچ ؟ (٢١) ئەگەر وابێ دابەش کردنێکی نادروست ئەبێ (٢٢) (ئەی هاوبەش پەیداکەران ! ) ئەم بتانە هەر ئـەو ناوانەن کە ئێوەو باوو باپیرانتان لێتان ناوون

سرووشی بۆ (محمد) کردووە ؟ ، وە ئایا ئەم بتانە فریشتەیـان هەیـە ؟ وەك خوافریشتەی هەن‌و (محمد) لە شەوی میعراجا دیونی ؟ ئەم بتانەی کە کردووتانن بە کچی خوا بۆچی ئەبێ مێ‌بن ؟ کێ بە ئێوەی ووت ئەم بڕیارە بدەن ، بەم ڕەنگە کوڕ هەڵگرن بۆ خۆتان‌و کچ بدەن بە خوا وەکو ئەفەرموێ ( الکم الذکر وله الانثى ) ئایا بۆ ئێوە کوڕو بۆ خوا کچ بێ ؟ (تلك اذا قسمة ضیری) ئەوە دابەش کردنێکی بێ دادانەیەو زۆر دوورە لە ڕاستی‌یەوە ، چونکە بەشێك ئەدەن بە خوا کە خۆتان ناتانەوێ ، ئنجـا خوا قسەکانیان ئەباتە دواوەو ئەفەرموێ (ئەی هــابەش پەیداکەرەکان) (ان هي الا اسمائر سمیتموها انتم وآباؤکم) ئەم بتانە هەر ئەو ناوانەن کـە ئێوەو باوو باپیرانتان لێتان ناوون ، واتە ئەم ناوانە وەك «لات»و «عزی» و « مناة »و گەلێ ناوی تربێ ، وە ناوبردنیان بە فریشتەو بە پەرستراو ، وە ناو بردنی فریشتە بە مێ ، وە ناو بردنی مێ بە کچی خوا ئەمانە هەمووی

ما اَنْزَلَ اللهُ بِها مِن سُلْطانٍ ، اِنْ یَتَّبِعوُن اِلاّ الظَّنَ وَما تَهوْی الْاَنْفُسُ ، وَلَقَدْ جاءَهم مِن رَبِّهِمُ الهُدی (٢٣) اَمْ لِلاْنِسانِ ما تَمَنّی (٢٤)

خوا هیچ بەڵگەیەکی نەناردۆتە خـوارەوە لە سـەر پەرسـتراویی ئەوان (هاوبەش پەیداکەران) هەر پەیرەویی گومـانی پـووچو هـەواو هەوەسی بتپەرستی خۆیان ئەکەن ، لـە کاتێکا کە بەڕاستی ڕێنموونیی خوایان بۆ هات (لەقورئانی پیرۆز) (٢٣) ئایا ئادەمی هەرچی ئارەزووی کرد دەستی ئەکەوێ ؟ واتە ( نەء ) (٢٤)

بە تەنیا هەر ناوون ، بێ ئەوەی ناونراوێك «مسمی»یان بێ ( مـا انزل الله بها من سلطان ) خوا هیچ بەڵگەیەکی نەناردۆتە خـوارەوە لە سـەر پەرستراویی ئەوان ( ان یتبعون الا الظن وما تهـوی الانفس ) هاوبەش بەیداکران هەر پەیرەویی گومانی هیچو پووچی باوو باپیرانو هـەواو هەوەسی بتپەرستیی خۆیان ئەکەن ، لە کاتێکا بیانووش بێ نی‌یانە ، وەکو ئەفەرموێ (ولقد جاءهم من ربهم الهدی) بەڕاستی ڕێنموونیی خوایـان بۆ هات لە قورئانی پیرۆز کە ئەم بتانە هیچ نینو بێ کەڵکن •

لە دوای ئەو سەرکۆنانەی کە هی هاوبەش پەیداکەرەکانی کرد ، ئنجا سەرکۆنەیەکی تریان ئەکات کە ئەم بتانە هیچ جۆرە قازانجێکیان نی‌یە بۆیان ، وە چاوەڕوانیی چی‌یان لێ ئەکەن ؟ چونـکە ئادەمیی سەربەسـت نی‌یە تا هەرچیی بوێت بی‌پەرستێ ، وە هەرچی ئارەزوو بـکات بـکات بەیاسا ، بەڵکو بەستراوەتەوە بە یـاسای خـواوەوە ، وەکو ئەفـەرموێ ( ام للانسان ماتمنی ) ئایـا ئادەمی هـەرچی ئـارەزووی کرد دەسـتی

فَلِلّهِ الْآخِرَةُ والأُولى (٢٥) وكَمْ مِنْ مَلَكٍ في السَّماوات لا تُغْنِي شَفاعَتُهُمْ شَيْئاً إلاّ مِنْ بَعْدِ أَنْ يَأْذَنَ اللهُ لِمَنْ يَشاءُ وَيَرْضى (٢٦)

(کە واتە) هەرچی کاری دین‌و دنیا هەیە هەمووی هەر بە دەست خوایە (٢٥)وە زۆر فریشتە کە لە ئاسمانەکانا هەن تکاو شەفاعەتیان سوودێك نادات ، مەگەر دوای ئەوەی کە خوا ڕێ بدات بۆ ئەو کەسەی کە ئەیەوێ‌و لێی ڕازی بێ (٢٦)

ئەکەوێ ؟ ، واتە نەء ، کە واتە (فلله الاخرة والاولى) هەرچی کاری دین‌و دنیا هەیە هەمووی هەر بە دەست خوایە ، وە بۆ هەریەکەی دەستوورو باوێکی داناوە ، ئنجا هەر کەسێك پەیڕەوی‌یان بکات سەر ئەکەوێ ، وەهەر کەس لێ‌یان لابدات ژێر ئەکەوێ •

ئنجا لەوەی کە بە تەماینی نائومێدیان ئەکات ، وەك شەفاعەتی فریشتەو شەفاعەتی بتەکانیان بێ ، فەرمووی (وکم من ملك في السماوات)وە زۆر فریشتە لە ئاسمانەکانا هەن (لاتغني شفاعتهم شيئا) تکاو شەفاعەتیان سوودێك نادات ( لمن یشاء ) بۆ کەسێك کە خوا شەفاعەتی بوێ بۆی (ویرضى)وە لێی ڕازی بێ ، ئنجا لە لایەك ئەمە شەفاعەتی فریشتە بێ کە بە خوا نزیکن ، بتێکی بێ گیان کە لە دار یان لە بەرد داتاشرابێ ، وە هەرچی نزیکی بێ نی‌یەتی بە بارەگای خواوە ، ئەبێ چ نرخێکی ببێ •

اِنَّ الَّذينَ لا يُؤْمِنونَ بِالآخِرَةِ لَيُسَمّونَ المَلائِكَةَ تَسْمِيَةَ الأُنْثى (٢٧) وَما لَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ

بە ڕاستی ئەوانەی کە بڕوایان بە ڕۆژی دوایی نی‌یە فریشتەکان ناوی کچی خوایان لێ ئەنێن (٢٧)

دوای ئەوەی کە نەنگی گرت لە هاوبەش پەیداکەران لە سەر بتپەرستی ، وە لە سەر ئەوەی کە ئەیانووت خوا منالّی هەیە کە فریشتەن ، وە دوای ئەوەی کە قسەکەی بردنە دواوە ، بەم ڕەنگە کە ئەم بتانەی بە خوایان ئەزانن ، نە ئەتوانن قازانج بگەیەنن نە زیان ، ئنجا هات نەنگیی تریان لێ ئەگرێ کە ئەڵێن فریشتە کچی خوان ، وەکو ئەفەرموێ ( ليسمون الملائكة تسمية الانثى) فریشتەیان ناو ناوە بە کچانی خوا ، بەڕاستی ئەمە ئەوپەڕی بێشەرمی‌یە کە منالّ بۆ خوا دائەنێن ، وە منالّەکەش کچ بێ ، لە کاتێکا ئەگەر خۆیان کچیان ببێ بە نەنگی ئەزانن ، وە ئەم بڕکێشی‌یە لە یەکێك ناوەشێتەوە کە بڕوای بە پرسینەوەی ڕۆژی دوایی بێ ، وە بە تەمای پاداش‌و تۆڵەی ئەو ڕۆژە بێ (ومالهم به من علم) لە کاتێکا کە هەر چی بەڵگە بێ نی‌یانە لە سەر ئەم قسە ناقۆڵانانەیان کە ئەیکەن ، وە هیچ زانیاری‌یەکیان نی‌یە لەم ڕووەوە، بەڵکو هەر دوای گومان کەوتوون کە سەرچاوەی ئەویش هەر هەواو هەوەس‌و دوای باوو باپیران کەوتنە ، بێ ئەوەی وورد بنەوەو بیر بکەنەوە ، لەگەڵ ئەمیشە کە ئادەمی ڕاستیی بۆ دەرناکەوێ بەگۆترەو گومان ، بەڵکو هەموو شتێکی هەر بەزانین‌و زانیای‌و وورد بوونەوەو

اِنْ يَتَّبِعُونَ الاَّ الظَّنَّ وَاِنَّ الظَّنَّ لا يُغْنِي مِنَ الْحَقِّ شَيْئاً (٢٨) فَأَعْرِضْ عَنْ مَنْ تَوَلَّى عَنْ ذِكْرِنا

لە کاتێکا کە هیچ ئاگایەکیان لێ نیيە وە هەردوای گومان ئەکەوون ، وە بەڕاستی گومان هیچ کەڵکێـك نادات لە ناسینی شتی بەڕاستیدا (٢٨) ڕوو وەرگێڕە لەوەی کە ڕوو لـە نامەی ئێمە وەرئەگێڕێ

بیر کردنەوە بۆی دەرئەکەوێ ( ان یتبعون الا الظن ) هـەر دوای گومان ئەکەوون (وان الظن لایغنی من الحق شیئا )وە بۆ گەیشتن بە زانیـنی بەڕاستی گومان هیچ سوودێکی نیيە ، واتە : شتی بەڕاستی بە گوترەو گومان نازانرێ ، وە گومان لەم ڕێیەدا هیچ بایەخی پێ نیيە •

زانایانی ئەمڕۆ شانازی ئەکەن بە «باکۆن»ەوە ، کە بانگی زانایان ئەکـات بۆ بێگومانی ، وە بۆجێگیرکردنی مەسائیلی عیلمی بـە تاقی کردنەوە تاگومانت نامێنێ ، بەڵام وا شایستەبوو کە شانازیی بکردایە بـە ئیسلامەوە کە زیاد لە هەزار ساڵ پێش « بـاکۆن » ئـەم بانـگەوازەی کردووە بە زوریی لە ئایەتەکانی قورئاندا کە یەکێکیان ئەم ئایەتەیە •

★ ★ ★

ئنجا فەرمان ئەدا بە پێغەمبـەر کە ڕوو وەرگـێڕێ لە هـاوبەش بەیداکەران ، وە دان بە خۆیا بگرێ ، فەرمووی ( فاعرض عن من تولی عن ذکرنا ) تۆ ـ ئەی پێغەمبەر ـ ڕوو وەرگێڕە لە هەر کەسێك کە ڕوو لە نامەی ئێمە وەرئەگێڕێ کە قورئـانە ، وە بەگوێـی فەرموودەکانمان

وَلَمْ يُرِدْ إلاّ الْحَياةَ الدُّنيا (٢٩) ذلِكَ مَبْلَغُهُمْ مِنَ الْعِلْمِ ، إنَّ رَبَّكَ هو أَعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِمَنِ اهْتَدى (٣٠) وَلِلّهِ ما في السَّماواتِ وما في الأَرضِ

وە زیندەگانیی دنیا نەبێ هیچیتری ناوێ (٢٩) ئەوە ئەوپەڕی تێگەیشتنیانە ، بەڕاستی پەروەردگاری تۆ داناترە بەوەی کە لە ڕێی خوا تەرەو گومڕا بووە ، وە ئەو داناترە بەوەی کە ڕێنموونیی کردووە (٣٠) هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هی خوایە

ناکات ، (ولم یرد الا الحیاة الدنیا)وە زیندەگانیی دنیا نەبێ هیچیتری ناوێ ، (ذلك) ئەو دنیا پەرستیی‌یەیان (مبلغهم من العلم) ئەوپەڕی تێگەیشتنیانە ( ان ربك ) بێگومان پەروەردگاری تۆ ( هو اعلم بمن ضل عن سبیله ) داناترە بەو کەسەی کە لە ڕێی خوا تەرەو گومڕا بووە ( وهو اعلم بمن اهتدی )وە ئەو داناترە بەوەی کە ڕێنموونیی کردووە، واتە هەرگا ئەم هاوبەش پەیداکەرانە هەردوای گومان ئەکەوون، تۆش خۆتیان پێوە خەریك مەکە، وە بەتەما مەبە کە گوێت بۆ بگرنو بڕوات پێبێنن، چونکە خوا لە تۆباشتر ئەزانێ کێ لە سەر گومڕایی ئەمێنێتەوە، وەکێش ڕێنموونی ئەکات، ئەمانە بەجێبێڵە بۆ خوا، چونکە ئەوە خاوەنی ئاسمانو زەویو لەناویانا فەرمانڕەوایە وەکو فەرمووی ( ولله ما في السماوات وما في الارض ) هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هەمووی هی خوایە وە لە ژێر دەسەڵاتی ئەوایە، وا مەزانە کە خوا پشتگوێیان ئەخات، بەڵکو جەزای هەموو کەسێك ئەداتەوە

لِيَجْزِيَ الَّذِينَ أَسَاءُوا بِمَا عَمِلُوا وَيَجْزِيَ الَّذِينَ أَحْسَنُوا بِالْحُسْنَى ( ٣١ ) الَّذِينَ يَجْتَنِبُونَ كَبَائِرَ الْإِثْمِ وَالْفَوَاحِشَ إِلَّا اللَّمَمَ إِنَّ رَبَّكَ وَاسِعُ الْمَغْفِرَةِ هُو

---

تا سزای ئەوانە بداتەوە کە بەدیو خراپەیان کردووە بە پێی کردەوەیان ، وە پاداشی ئەوانە بداتەوە کە چاکەیان کردووە بە چاکە (٣١) ئەوانەی کە لە گوناهانی گەورەو کردەوەی بەد خۆیان ئەپارێزن ـ مەگەر گوناهانی بچووك ـ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بوردەیە ،

---

بە پێی کردەوەی خۆی، ئنجا چاکەی بە چاکەو خراپەی بە خراپە، وەکو ئەفەرموێ ( ليجزی الذين اساءوا بما عملوا )تا جەزای ئەوانەی کە بەدی‌یان کردووە بداتەوە بە پێی کردەوەیان ( ويجزی الذين احسنوا بالحسنی )وە جەزای ئەوانەی کە چاکەشیان کردووە بداتەوە بە چاکە •

ئنجا باسی سیفاتی چاکان ئەکاتو ئەفەرموێ ( الذين يجتنبون كبائر الاثم ) ئەوانەی کە خۆیان ئەپارێزن لە گوناهی گەورە، وەك هاوبەش پەیداکردن بۆ خواو، بێ‌فەرمانیی باوكو دایكو شەهادەتی درۆ ( والفواحش )وە خۆئەپارێزن لە گوناهانی بەد و بێ‌جایی کە لە قورئانا هەڕەشەیان لە سەر کراوە، یا حەدیان لەسەر دانراوە ؟ وەك داوێن‌پیسی‌و پیاوکوشتن بە ناڕەواو، عەرەق خواردنەوەو دزی کردن ( الا اللمم ) مەگەر گوناهی بچووك ئەوانە خوا چاویان لێ‌ئەپۆشێ وەکو ئەفەرموێ ( ان ربك واسع المغفرة ) بەڕاستی پەروەردگاری تۆ زۆر بوردەیە کە لە گوناهی بڕواداران خۆش ئەبێ، چونکە خوا ئاگادارترە لە ئێوە بە

اَعْلَمُ بِكُمْ اِذ اَنْشَأَكُمْ مِنَ اْلاَرضِ
وَاِذْ اَنْتمُ اَجِنَّــةٌ في بُطوْنِ اُمَّهاتِكُمْ فَلا تُزَكّوا اْنفُسَكُمْ هُوَ اَعْلَمُ بِمَنِ اتَّقى (٣٢)

---

ئەو لە هەموو کەس داناترە بە حاڵی ئێوە لە کاتێـکا کە ئێـوەی پەیـدا کردووە لە خاکی زەوی ،
وە لە کاتێکا کە ئێوە ساوا بوون لە سکیدا یکتانا کە واتە خۆتان بە پاك دامەنێن خوا داناترە بەوەی کە پارێزگارە (٣٢)

---

حاڵی بەندەگانی خۆی وەکو ئەفەرموێ ( هو اعلم بکم ) ئەو خوایە داناترە بە حاڵی ئێوە ( اذ انشأکم مـن الارض ) لە کاتێـکا ئێوەی پەیدا کرد لە خاکی زەوی ( واذ انتم اجنة في بطون امهاتکم )وە لە دەمێکا کـە ئێــوە ساوا بوون لە سکی دایکتانا، واتە ئەو خوایەی کە یەکەم جــار پەیدای کردوون لە گڵو لــە پاشا پەروەردەی کردوون لــە سکی دایــکتانا ئاگادارە بە ئەحواڵتان، وە ئاگادارە بە ڕێنموونییەکەرانو گومڕایان، وە بۆ بڕواداارانو گوناهباران ( فلا تزکو انفسکم ) کـە واتە خۆتان بەپاك مەدەنە قەڵەمو ستایشی خۆتان مەکەن بە چاکی، چونـکە بەوە مەغروور ئەبن ( هو اعلم بمن اتقی ) خوا لە هەموو داناترە بەوەی کـە پارێزگاریی کردووە .

★ ★ ★

زانایانی ئیسلام زۆریان ئەڵێن : «وەلیدی» کوڕی « موغــەیرە » چووە خزمەت پێغەمبەرو مسڵمان بوو، لە پاشا هاوبەش پەیداکەرێك پێی

اَفَرَأَيْتَ الَّذي تَوَلّى (٣٣) وَأَعْطى قَليلاً وَأَكْدى (٣٤) اَعِنْدَهُ عِلْمُ الْغَيْبِ فَهُوَ يَرى (٣٥)

---

ئایا دیت ئـەو کەسەی کـە ڕووی وەرگـێڕا (لـە ئیسـلام) (٣٣) وەکەمێکی‌دا (١) (لەوەی کە بڕیار بوو بیدا)وە ئەوی‌کەی گلدایـەوە (٣٤) ئایا ئەو کەسە عیلمی غەیبی هەیەو بە چاو ئەی‌بینێ (٣٥)

---

ئەڵێ : تۆ بۆ لـە دینی باووباپیری خۆت لاتدا ؟ وەلیدیش ئەڵێ لە ترسی ئاگری دۆزەخ‌و سزای ڕۆژی دوایی مسڵمان بووم، کابراش ئەڵێ مـن دەستەبەرێتیت ئەکەم کـە سزا نەدرێیت، بە مەرجێك ئەوەندەو ئەمەندەم پارە بدەیتێ، وەلیدیش ئەڵێ: باشە، وەپێشەکی کەمێکی لـــەو پارەیە ئەداتێ، لە پاشا لـە پارەکەش پەشیمان ئەبێتەوە، وە باقی‌یەکەی ناداتێ ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە، فەرمووی ( افرأیت الـذی تولی ) ئایا دیت ـ ئەی محمد ـ ئەو کەسـەی کـە ڕووی وەرگێڕا لـە ئایینی ئیسلام ( واعطی قلیلا ) وە کەمێکی دا لەو ماڵەی کـە بڕیار بوو بێدات بەو کەسەی کە دەستەبەر بوو بوو بە هەڵـگرتنی سزای ئاگری دۆزەخ لە سـەری ( واکدی )وە ئەوی‌کـەی لێ گلدایەوەو نەیدایێ (اعنده علم الغیب)ئایا ئەو کەسەی کە ڕووی لە بڕوا وەرگێڕا، وە بووەوە بە هاوبەش پەیداکەر « مشرك »وە ئەو ئەندازەیەی کە بڕیار بوو بێداو، نەیدا، ئاگای لە ئەحواڵی قیامـــەتە، کـە لـە هەموو کەسێکەوە وون‌و نادیارە ( فهو یری )وە ئەو بە ئەحواڵی ئەو ڕۆژە بینـایە وە ئەزانێ کـە

---

(١) بڕیار بوو ماڵی زۆری بداتێ، بەڵام لە دواییـدا پەشیمان بۆوەو زۆری‌نەدایە (م) ٠

أَمْ لَمْ يُنَبَّأْ بِما في صُحُفِ مُوسى (٣٦) وَإِبْراهيمَ الَّذي وَفَّى (٣٧) أَلاَّ تَزِرُ وازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرى (٣٨)

ئایا خەبەردار نەکراوە بەوەی کە لەنامــەی مووسادایە ؟ (٣٦) وە بەوەی کە لە نامەی ئیبراهیمایە ، ئەو ئیبراهیمەی کە (پەیمــانی خۆی) بەجێ هێنا لەگەڵ خودا (٣٧) کە هیچ کەس باری گوناهی یەکێکی‌تر هەڵناگرێ (٣٨)

ئەم مرۆڤە ئەتوانێ لەو ڕۆژەدا سزای لە سەر هەڵگرێ تا بــەم مامەڵەیە ڕازی بێ، بۆ؟ ئایا سزای ڕۆژی دوایی کووتاڵە بکڕدرێو بفرۆشرێت ؟ ئایا نازانێ کــە هــەموو کەسێك بەرپرسیارە لە کردەوەی خــۆی؟ وە هیچ کەسێك گوناهی هیچ گوناهبارێك هەڵناگرێ •

ئنجا پشت‌گیری ئەم ئینکارە ئەکاتو ئەفەرموێ ( أم لم ينبأ بما في صحف موسى )ئایا ئەم کابرایە ـ کە «وەلید»ە خەبەردار نەکراوە بەوەی کە لەنامــەی مووسادایە؟ ( وابراهيم ) وە لەنامەی ئیبراهیمی خەلیلایە ( الذي وفى ) ئەو ئیبراهیمەی کە پەیمانی خۆی بەجێ هێنا لەگــــەڵ خوادا، وە هــەر فەرمانێکی پێ درابوو کردی، وەك دەرئەکەوێ لــــە ئایەتی « واذ ابتلى ابراهيم ربه بكلمات فاتمهن »[1] بقره/١٢٤ •

ئنجا ئەوانەی کە لەنامەی ئیبراهیمو مووسادا هەن ئەم پانزەیەن کە باسیان ئەکاتو ئەفەرموێ •

١ ـ لا تزر وازرة وزر اخـرى ) کــە هیچ کەس باری گوناهی

(١) کاتێك کە خوا ئیبراهیمی تاقی کردەوە بەچــــەند فەرموودەیەك کەئەویش بەجێی هێنان •

وَاَنْ لَيْسَ لِلاِنْسانِ اِلاّ مـا سَعى ( ٣٩ ) وَاَنَّ سَعْيَهُ سَوْفَ يُرى (٤٠) ثُمَّ يُجْزاهُ الْجَزاءَ الأَوفى (٤١)

وە ئادەمی هەرچی بە هەوڵی خۆی پەیدای نەکات دەستی ناکەوێ (٣٩)وە بە بێ گومان پاداشی کردەوەی خۆی نیشان ئـەدرێ (٤٠) لـە ڕۆژی دوایشـا پـاداشی تـەاوو ئەدرێـتەوە (٤١)

یەکێکی‌تر هەڵناگرێ، وە کەس بە گوناهی کەس گیرۆدە نابێ ، بـەم ڕەنگە گوناهبار ڕزگاری ببێ‌و بێ گوناه سزابدرێ، واتە هەمووئاینەکانی خوا لەم یاسایەدا یەکن •

٢ ـ ( وان لیس للانسان الا ما سعی ) ئادەمی هەرچی بە هـەوڵی خۆی پەیدای نەکات دەستی ناکەوێ، واتە هـەر وەك کـەس باری گوناهی کـەس هەڵناگرێ، کەسیش بەری‌کۆششی کەسی‌تری دەس ناکـەوێ •

٣ ـ ( وان سعیه سوف یری ) کردەوەی ئادەمی باش یاخراپ لـە ڕۆژی دوایدا نیشان ئەدرێ بە ئەهلی مەحشەر، کـە بەمە چاکـان کەیف‌خۆش‌و خراپان شەرمەزار ئەبن •

٤ ـ ( ثم یجزاه الجزاء الاوفی ) لە پاشا پاداش ئەدرێتەوە بـە پاداشی تەواو ، بەم ڕەنـگە خوا چاکەی چاکەکەران بە زیادەوە ئەداتەوە، تا حەوسەد چەندانە، وەخراپەی خراپەکەران تۆڵە ئەداتەوە بە قـەد خۆی بە بێ زیادو کەم، واتە گوناهێك یا بە یەك تۆڵە تۆڵە ئەدرێتـەوە ،

وَأَنَّ إِلَىٰ رَبِّكَ الْمُنْتَهَىٰ (٤٢) وَأَنَّهُ هُوَ أَضْحَكَ وَأَبْكَىٰ (٤٣) وَأَنَّهُ هُوَ أَمَاتَ وَأَحْيَا (٤٤)

وە هەموو کارێك سەرەنجامەکەی هەر بۆلای خوا ئەگەڕێتەوە (٤٢) وە خوا بەندەگان ئەهێنێتە پێکەنینو گریان (٤٣) وە ئەو خەڵق ئەمرێنێو زیندووی ئەکاتەوە (٤٤)

وە یا لێی خۆش ئەبێ •

٥ ـ ( وان الى ربك المنتهى ) وە هەموو کارێك سەرەنجامەکەی هەر بۆ لای خوا ئەچێتەوە وە پرسیاریان لێ ئەکات لە سەر کاری گەورەو بچووك، وە پاداشیان ئەداتەوە بە بەهەشت، یا تۆڵەیان ئەدات بە دۆزەخ •

٦ ـ وانە ( هو اضحك وابكى ) بەڕاستی هەر خوایە کە بەندەی خۆی شادو خەندانو، خەمبارو خەفەتبار ئەکاتو، ئەیهێنێتە پێکەنینو گریان ، واتە خۆشیو ناخۆشی هەر بە دەست خوایە •

٧ ـ ( وانە هو أمات وأحیا )وە بێ گومان هەر خوایە کە هەر کەسێکی بوێ ئەیمرێنێ، وە هەر کەسێکیشی بوێ ژیانی ئەداتێ کاتێك کە لە دایك بوو •

وَأَنَّهُ خَلَقَ الزَوْجَينِ الذَكَرَ وَالأُنثى (٤٥) مِنْ نُطفَةٍ إذا تُمنى (٤٦) وَأَنَّ عَلَيهِ النَشأَةَ الأُخرى ( ٤٧ ) وأَنَّهُ هُوَ أغنى وأَقنى (٤٨)

---

وە ئەو دوو جۆری دروست کردووە کە نێرو مێیە (٤٥) لە مەنی‌یەك کە برژێتە ناو ڕەحمەوە (٤٦) وە لە سەر خوایە زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دوایی (٤٧) وە خوایە کە مەردوم دەوڵەمەندو هەژار ئەکات (٤٨)

---

٨ ـ ( وانه خلق الزوجين الذکر والانثى )وە هەر خوایە پەیدای کردووە دوو جۆر : نێرو مێ لە ئادەمی‌و گیاندارانی‌ترا ( من نطفة اذا تمنى ) لە مەنی‌یەك کە برژێتە ناو ڕەحمەوە • لە دوای پەیدا کردنی ئادەمی یەکەم جار، ئنجا باسی پەیدا کردنەوەی دووهەم جار ئەکات‌و ئەفەرموێ :

٩ ـ ( وان عليه النشأة الاخرى )وە بە بێ‌گومان لە سەر خوایە زیندوو کردنەوەی دوایی تا پاداشی چاکەو خراپە بدرێتەوە هەر کەسە بە پێی کردەوەی خۆی •

١٠ ـ ( وانه هو أغنى وأقنى )وە بەڕاستی هەر خوایە هەرکەسێکی بوێ دەوڵەمەندی ئەکات، وە هەر کەسێکیشی بوێ هەژاری ئەکات بە پێی هەوڵ‌و کۆشش ، ئامادەیی‌و ژیریی‌و بیرو دەسەڵاتی لە سەر هەڵسووڕان‌و کۆششی لە ڕێی‌کسب‌و کارا بە پێی دەستوورو باوی جیهان•

وَأَنَّهُ هُوَ رَبُّ الشِّعْرَى (٤٩)

وە هەر خوایە پەروەردگاری ئەستێرەی گەلاوێژ (٤٩)

١١ ـ ( وانه هو رب الشعری )وە هـــەر خـوایە پەروەردگاری ئەستێرەی گەلاوێژ .

لەم ئەستێرەیە گەورەترو ڕووناکتر زۆرن، بەڵام چونـکە لەپێش ئیسلاما پەرستراوە لە لایەن تیرەی «حیمیەر»و «خوزاعە»وە[1] بۆیە بـە تایبـەتی ناوی برد، وە فـــەرمووی ئـــەم ئەستێرەیە دروست کراوی خوایەو خۆی خوانی‌یە .

ئەم ئەستێرەیە پەنجا جار لە ڕۆژی ئێمە ڕووناکترە، وە ملیۆنێك جـار لـە ڕۆژی‌ئێمە دوورترە، تیشکی ئەم ئەستێرەیە بە هەشت سـاڵ ئەمانـگاتێ، لە کاتێکا کە ڕووناکیی ڕۆژ بە هەشت دەقیقە ئەمانـــگاتێ

ئەگەر ئەم ئەستێرەیە ڕۆژێك لە جێی ڕۆژی ئێمە ئەبوو ژیان لـە سەرزەویدا نەئەما، وە هەرچی دەریاکان هەیە هەموو ئەهاتنە کوڵ .

لە ئاسماندا ئەستێرەی واهەیە دە هەزار جار لە گەلاوێژ گەورەترو

(١) یەکەم کەسێ کەنەم ئەستێرەیەی پەرستو پەرستنەکەی بەـناو ئادەمی‌یاندا بڵاوکردەوە «ئەبووکەبشە» بوو، ئەم ئەبووکەبشەیە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی عەرەبی ئەو سەردەمە، وە یەکێك بوو لە باپیرەکانی پێغەمبەر لـــە لایەن دایکیەوە، بەم بۆنەیەوە بـــە پێغەمبەریان ئەوت «ئەبووکەبشە»، چونـــکە پێغەمبـــەر وەکو «ئەبووکەبشە» ئایینێکی تازەی هێناوەتە ناوەوە . م ـ ئەردەڵانی .

وَأَنَّهُ أَهْلَكَ عـاداً الأولی (٥٠) وَثَمودَ فما أَبْقی ( ٥١ ) وَقَوْمَ نُوحٍ مِنْ قَبْلُ إِنَّهُمْ کانوا هُمْ أَظْلَمَ وَأَطْغی (٥٢)

وە خوا گەلی عادی یەکەمی لە ناو برد (٥٠)وە گەلی ( ثمـود )ی نەهێشت ( ٥١ ) وە گـەلی نووحی لـە ناوبرد لە پێش عادو سەموددا ، بەڕاستی ئەوان ستەمکارترو یاخی‌تر بوون (٥٢)

ڕووناك‌ترو گەرمترە، بەڵام لە بەر دووریی وەك ئەستێرەیەکی بچووك‌و کز دەرئەکەوێ • واتە ئەم ئەستێرەیە لە ئەستێرە ناوونجی‌یەکانە، نـەك گەورەکان، کـە واتە یەکێك بێ‌عەقڵ نەبێ ناچێ ئەم ئەستێرەیە بپەرستێ وەئەوخوایەی کە ئەمی دروست کردووە نەی پەرستی !!•

ئنجا باسی ئەو فەلاکەتانە ئەکات کـە بە سەر گەلانی ڕابوردوودا هاتووەو لـە ناوی بردوون، بۆ ئەوەی هاوبەش پەیدا کەرەکانی پێغەمبەر بترسێنێ، کە ئەگەر بڕوا نەهێنن چی بە سەر گەلانی پێشوودا هاتووە بە سەر ئەمانیشا دێ فەرمووی :

١٢ ـ ( وانه أهلك عاد الاولی )وە خوا گەلی عادی یەکەمی لـە ناو برد کە گەلی «هود» بوون، وەپێ‌یان وتوون «عاد»ی کوری «ارم»ی کوڕی «سامی» کوڕی «نوح» کـە گەلێـکی زۆر بەهێزو بەدەسەڵات بوون ، وە لە ڕووی شانازی‌یەوە وتوویانە « مـــن اشد منا قوة » واتە کێ لەئێمـە بەهێزترە ؟

١٣ ـ ( وثمود ) وەگـــەلی « ثمود »ی کوڕی صالحی لە ناو برد ( فما ابقی ) وە کەسێ لێ نەهێشتنەوە لەم دووگەلە •

١٤ ـ ( وقوم نوح من قبل )وە گەلی نووحی لە ناو برد لـــەپێش عادو سەموودا ( انهم کانوا هم أظلم واطغی ) بەڕاستی ئەوان ستەمکارترو

والْمُؤْتَفِكَةَ أَهْوى (٥٣) فَغَشَّاها ما غَشَّى ( ٥٤ ) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكَ تَتَمارى (٥٥)

وە دێهاتەکانی گەلی لووتی سەرەوژێر کرد (٥٣) ئنجا ئەو دێهاتانەی داپۆشی ئەوی کەدای پۆشی (٥٤) ئنجا لە کام نیعمەتانی پەروەردگارت لە گومانایت ؟ (٥٥)

یاخی‌تربوون لە عادو سەموود •

١٥ ـ ( والمؤتفكة )وە دێهاتەکانی گەلی لووتی (أهوى) سەرەوژێر کردو دای‌پۆشی بە تاوێرە بەردی زۆر، وەکو ئەفەرموێ ( فغشاها ما غشى ) ئنجا ئەو دێهاتانەی داپۆشی ئەوی کەدای پۆشی •

واتە ئایا ئەی (محمد) ! گەلەکەت نازانن ئەو هێزو دەسەڵاتەی کە پێی ئەنازن زۆر هیچو پووچە لە چاو هێزو دەسەڵاتی خوادا، ئەو دەسەڵاتەی کە گەلانی نووحو عادو سەموودی لە ناو بردو کردنی بە واتەی ڕۆزگار، واتە ئەگەر ئێوەش لە سەر ئەم بێ‌بڕواییە بمێننەوە لە ناوتان ئەبات ( فبای الاء ربك تتمارى ) کە واتە ئەی ئادەمی لەکام لەم نیعمەتانەی کە باس کران لەگومانایت ؟!

مەبەست لەم نیعمەتانە کە ئەفەرموێ لە ناوبردنی گەلانی نووحو عادو سەموودو لووتە، بەڕاستی لە ناوبردنی مرۆڤی خراپو گەلی بەدخوو گەورەترین نیعمەتی خوایە، کە عالەمێك ڕزگار ئەکات لە دەست زۆرو ستەمی ئەو زۆردارو ستەمکارانە، جگە لەوە کە ئەم

هـذا نَذیرٌ مِنَ النُّذُرِ الأُولی (٥٦)

ئەم پێغەمبەرە ترسێنەرێکە وەك پێغەمبەرانی پێشوو (٥٦)

بەسەرهاتانە هەموو پەندن بۆ خـاوەن بڕواو بەهرەیان لێ وەرئەگرن، هەر وەك بەڵگەن لە سەرتاكو تەنیایی‌و پەروەردگارێتی خوای گەورە •

ئەم پانزە شتەی کە باس کران‌و لە نامەی ئیبراهیم‌و مووسادا هەن ، کە جوولەکەکان خوێندوویانەتەوە بەسەر هاوبەش پەیداکەرەکانا، ئیتر چۆن گوناهـ بە پارە ئەفرۆشرێت؟ ، وە چۆن سزای ڕۆژی دوایی بـــە ماڵی دنیـا ئەکڕدرێت ؟، وەك وەلیدی کوڕی موغەیرە کردی •

لەم ئایەتانەی پێشوودا باسی سەرەنجامی ئەو گەلانە بوو کە سەرپێچی‌یان کردووە، وە بێ‌فەرمانیی پێغەمبەرەکانیان کردووە، تا سزای خـــوایان بە سەرا ڕژا، وەگـەلی عادو سەموودو نووح‌و لووتی لە ناوبردو، کردنی بە واتەی ڕۆزگار، وە بە پەند بۆ پەندوەرگران، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە حەزرەتی (محمد)یش ( دروودی خوای لـە سەر بێ ) پێغەمبەرێکە وەك پێغەمبەرەکانی پێشوو، ئەفەرموێ : ( هـــذا ) ئـەم پێغەمبەرەش مانەندی پێغەمبەرەکانی پێشوو ( نذیر من النذر الاولی ) ترسێنەرێـــکە وەك ترسێنەرەکانی پێشوو، پێغەمبەرێتیی خـــۆیتان پێ ڕائەگەیەنێ، وە ئەتان ترسێنێ بە ڕۆژی دوایی، ئنجا ئەگەر هەروا لە سەر ئەم لاســاری‌و بێ‌فەرمانی‌یە مانەوە ؟ ئەوا سەرەنجامی ئێوەش وەك سەرەنجامی گەلانی پێشوو ئەبێ، وەئەو پێغەمبەرانە چی‌یان فەرمووە بە گەلەکانی خـۆیان،

أَزِفَتِ الْآزِفَةُ ( ٥٧ ) لَيْسَ لَهَا مِنْ دُونِ اللَّهِ كاشِفَةٌ (٥٨) أَفَمِنْ هذَا الْحَدِيثِ تَعْجَبُونَ (٥٩) وَتَضْحَكُونَ وَلَا تَبْكُونَ (٦٠) وَأَنْتُمْ سَامِدُونَ ( ٦١ )

---

ڕۆژی دوایی زۆر نزیك کەوتۆتەوە (٥٧) خوا نەبێ کەسی‌تر ئاشکرای ناکات (٥٨) ئایا لەم قورئانە سەرتان سوڕ ئەمێنێ ؟ (٥٩) وە پێی پێ ئەکەنن‌و ناگرین ! ( ٦٠ ) وە ئێوە بێ‌ئاگان ( ٦١ )

---

ئەمیش هەر ئەوە ئەفەرموێ‌و ئەڵێ : ( ازفت الارفة ) واتە ڕۆژی دوایی زۆر نزیك کەوتۆتەوە، ( لیس لها من دون الله کاشفة ) هیچ کەسێك بێجگە لە خوا ناتوانێت ئەو ڕۆژە ئاشکرا بکات، واتە هەر خوا خۆی ئەزانێ کەی ئەبێت، کە واتە خۆتان ئامادە بکەن بۆ ئەوڕۆژە پێش هاتنی •

ئنجا سەرکۆنەی بێ‌بڕوا هاوبەش پەیدا کەرەکان ئەکات لە سەرگاڵتە کردنیان بە قورئان‌و پشت تێ‌کردنیان **بۆی، ئەفەرموێ** ( افمن هذا الحديث تعجبون ) ئایا سەرتان سوڕ ئەمێنێ لەم قورئانەو ئینکاریی ئەکەن ؟ ( وتضحكون ) وە لە ڕووی گاڵتەپێ کردنەوەوە پێی پێ‌ئەکەنن ( ولا تبكون ) وە بۆخۆتان ناگرین، کە وابێ لەم قورئانە گەورەیە بێ‌بەهرەن، وە لە ئامۆژگارییەو هەزاران باسی بەرزو بەنرخی ( وانتم سامدون )وە ئێوە ــ ئەی مەردومانی نادان ! ــ زۆر گێل‌و بێ‌ئاگان کە لەوەختی خوێندنەوەیدا دەنگە دەنگی تیا ئەکەن بۆ ئەوەی

فَاسْجُدُوا لِلّٰهِ واعبُدوا (٦٢)

ئنجا بەڕوودا بکەوون بۆ خواو بێپەرستن (٦٢)

گوێتان لێی نەبێ‌و نەچێتە مێشکتانەوە ئنجا فەرمان ئەدات بە ڕێزگرتنی قورئان لە کاتی گوێ بۆ گرتنیا ئەفەرموێ ( فاسجدو لله ) ئنجا سجدە بەرەن بۆ ئەو خوایەی کە لەخۆتان پێغەمبەرێکی بۆ ناردن لە گەڵ دەستوورێکی ژیان کە قورئانە ( واعبدوا )وە پەرستشی خوابکەن، نەك پەرستنی بت‌و دارو بەردو گۆڕو ئەم‌و ئەو[1] •

(١) بەم مانایە بێ لە ناو موریدان‌و مەنسووبانی نەقشی‌و قادریدا هەندێ کەسان هەن بە پێچەوانەی ئەم ئایەتە ئەجوولێنەوە، چونکە بەرامبەر بە ئیحتیرامی شێخەکەیان لە هێلی ئیسلامی ئەچنە دەرەوە م_ ئەردەلانی •

# سورة القمر

## بسم الله الرحمن الرحيم

## سوورەی (قمر)ە

### مەککی‌یە، (٥٥) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

سوورەی (قمر)ە

مەککی‌یە، (٥٥) ئایەتە

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

ئەم سوورەتە لە سەرەوە تا خوار هەڵمەتێکی سامناکو توندو تیژە بۆ سەر ئەو بێ‌بڕوایانەی کە بڕوا بە پێغەمبەران ناکەن، هەر وەك دڵخۆشی دەرەوەیە بۆ بڕواداران •

ئەم سوورەتە بەش بەش کراوە بە چەند بەشێك، هەر بەشێکی

(١) بە لای دانەری خوالێخۆشبووەوە ـ وەك لە دەربڕینەکەیەوە دەرئەکەوێ ـ هەموو ئایەتەکانی ئەم سوورەتە مەککین، وە هەر وەها لە تەفسیری «مواهب الرحمان»دا، بەڵام لە تەفسیری «مەراغی»دا ئەفەرموێ : ئایەتەکانی (٤٤) و (٤٥) و (٤٦)ی ئەم‌سوورەتە مەدینەیین‌و، ئەوانی تری مەککەیین •

لە تەفسیری «جلالین»دا وا دەرئەکەوێ لە ناو هەموو ئایەتەکاندا بەتەنها ئایەتی (٤٥) مەدینەیی‌بێ‌و، ئەوانی‌تر مەککی‌بن م ـ ئەردەڵانی

اِقتَرَبَتِ السَّاعَةُ

نزیك کەوتەوە قیـامەت

چەشمەندازێکە لە چەشمەندازانی ئازارو سزاو دەردیسەری، لـە دوای هەموو بەشێك لەم بەشانە هەستی ئادەمی ئەبزوێنێو ئەیهێنێتە لـەرزە بە فەرموودەی « فکیف کان عذابی ونذر » بەرەڵلای ئەکاتو پێی ئەڵێ: « ولقد یسرنا القران للذکر فهل من مدکر » •

خـــوا خەبەر ئەدات بە نزیك کەوتنەوەی ڕۆژی دواییو تێك چوونی دینا ئەفەرموێ : ( اقتربت الساعـــة ) ڕۆژی قیامـــەت نزیك کـــەوتەوە •

زانایانی ئاسمان تەمەنی ڕۆژیان داناوە بە پێنج ملیۆن ملیۆن ساڵو، تەمەنی زەوی بە دوو هەزار ملیۆن ســـاڵو، تەمەنی ئادەمی بە (٣٠٠) هەزار ساڵ، بەشی زۆر لە تەمەنی ڕۆژ ڕۆیشتووە بە نیشانەی ئەو سارد بوونەوەیەی کـە بە سەریا هاتووە، ئنجا نزیك بوونەوەی ڕۆژی قیامەت بە پێی ئەوتەمەنە دوورو درێژەیە کە بە سەر ڕۆژا هاتووە واتـە بەشی زۆری ڕۆیشتووەو بەشی کەمی جاوە بە مەلایین ساڵیش بێ، کـە واتـە کەس نازانێ تەمەنی کۆمەڵەی ڕۆژی ئێمـە چەندی ماوە؟ خوانەبێ، خۆ ئەگـەر تەماشا بـکەین کـــە پێغەمبەری ئیسلام دواترینی پێغەمبەرانەو پێغەمبەری ئاخرزەمانە، تێئەگەین کە هاتنی ئەم پێغەمبەرە نیشانەی نزیك کەوتنەوەی قیامەتە •

وَانْشَقَّ الْقَمَرُ (١)

وە لەت بوو مانـگ (١)

( وانشق القمر )وە مانگ لەت ئەبێ ، کە واتە لە ڕۆژی دوایـدا بە هۆی نەمانی هێزی کێشندەوە مانگ لەت ئەبێو ئەکەوێتە خوارەوە ، هەر وەك ئەستێرەکانی‌تر هەڵئەوەرێن وەك لە سوورەی « تـکویر »دا ئەفەرموێ : « اذا الشمس کورت، واذا النجوم انکدرت »[١] •

تەعبیری دایەوە لە لەت‌بوونی مانگ بە کرداری ڕابوردوو وەك لە ئایەتی « أتی امر الله فلا تستعجلوه »[٢] ، بۆ ئەوەی نیشان بدات کـــە ئەو لەت‌بوونە ئەوەندە ڕاستو بێ‌گومانە وەك بووبێو ڕابوردبێ وایە •

ئەم ئایەتە وەڵامی هاوبەش پەیداکەرەکانە کـە داوای لەت‌کردنی مانـگکیان کرد لـە پێغەمبەر بـە موعجیزە لـە سـەر پێغەمبەرێتی خۆی، هـەر وەك هـــەڕەشەیە لەوان بە نزیك کەوتـــەوەی ڕۆژی دوایی‌و لەت‌بوونی مانـگ، کـە لەو ڕۆژەدا تووشی سزای خۆیان ئەبن، ئنجـا هۆی ئـەم وەڵام دانەوەیەیان باس ئەکات بەم ڕەنـگە کـــە ئەگـەر مانگیشیان بۆ لـەت بـکەین ئەوان بە جادووی ئەزانن، وەکو ئەفەرموێ

(١) واتـــە کاتێك کە ڕۆژ پێچرایەوە، وە دەمێك کـــە ئەستێرەکان هەڵوەرین •

(٢) واتە فەرمانی خوا بە بەرپابوونی ڕۆژی دوایی هات پەلە مەکەن •

وَاِنْ يرَوْا آيةً يُعْرِضُوا وَيَقولُوا سِحْرٌ مُسْتَمِرٌ ( ٢ )
وكَذَّبوُا وَاتَّبَعوُا اَهْواءَهُمْ　　وَكُلُ أَمْرٍ مُسْتَقِرٌ (٣)

وە ئەگەر بێبڕواکان موعجیزەیەك ببینن ڕووی لێ وەرئەگێڕن‌و ئەڵێن : ئەمـە جادوویـەکە هەمیشـەیی (٢) بێبـڕواکان قسـەکانی پێغەمبەریان بە درۆ زانی ، وە دوای هەواو هەوەسـی خۆیـان کەوتن ، وە هەمووکارێك سەرەنجامێکی هەیە (٣)

( وان یروا آیة ) ئەگـەر بێبڕواکان موعجیزەیەك ببینن ( یعرضــوا ) ڕووی لێ وەرئەگێڕن ( ویقولوا سحر مستمر ) وە ئـــەڵێن ئەمـــە جادوویەکە وەك جادووەکانی تری، وە ئەمە پیشەی محمدە بە درێژایی ســــاڵ •

ئنجـا پشتیوانی قسەکەی پێشوو ئەکات‌و ئەفەرموێ : ( وکذبوا ) بێبڕواکان قسەکانی پێغەمبەریان بە درۆ زانی ( واتبعـــوا اهواءهم )وە دوای هەواو هەوەسی خۆیان کەوتن •

ئنجا تەسەلای پێغەمبەر ئەداو هەڕەشە لە بێبڕواکان ئەکـــات‌و فەرموێ : ( وکـــل امر مستقر ) هـــەموو کارێـکی ئادەمی دواییەکی هـــەیە، وە لەوێدا ئەوێستێت ، ئنجا ئەگەر چاك بێ ئەوا چاکەی لێ پەیدا ئەبێ، وە ئەگەر خراپ بێ خراپەی لێ دەرئەکەوێ، وە هەموو کەسێك بـــە پێی کردەوی خۆی تۆڵە یا پاداش ئەدرێتەوە •

خۆلاسە ئەو هاوبەش پەیداکەرانە بە گوێی فەرموودەکانی پێغەمبەر

وَلَقَدْ جاءَهُمْ مِنَ الْأَنباء مافیه مُزْدَجَرٌ (٤)
حِكْمَةٌ بالِغَةٌ فَما تُغنِ النُّذُرُ (٥)

بێ‌گومان دەنگ‌و باسی (پێشینانیان ئەوەندە) بۆ هاتووە (لە قورئانا) کە بی‌یانگرێتەوە ( لە بێ‌بڕوایی) (٤) بەڵێ قورئان سەرتاپا حیکمەتێکی تەواوە

ناکەن، وە دوای هەواو هەوەسی خۆیان ئەکەوون، وە شتی ڕاست‌و دروست ناگۆڕێ بە ئینکاری ئەم‌و ئەو، وە پێغەمبەر لە دوایيدا ئەگات بە هەموو ئامانجێکی خۆی •

ئنجا لۆمەی بێ‌بڕواکان ئەکات ئەفەرموێ : (ولقد جاءهم من الانباء ما فیه مزدجر ) بێ‌گومان دەنگ‌و باسی پێشینانیان ئەوەندەیان بۆ هاتووە لە قورئانا کە بی‌یانگێڕێتەوە لەم ئینکاری‌و بێ‌بڕوا یی‌یە • ئنجا ئەم دەنگ‌و باسانە دەنگ‌و باسی ئەو تۆ لەو سزایانە بێ کە خوا ڕشتوویەتی بە سەریانا لە دنیادا، یا دەنگ‌و باسی سزای ڕۆژی دوایی بێ کە قورئان بە سەد جۆر باسی ئەکات‌و ئەیدا بە گوێچکەیانا، بەڵێ قورئان سەرتاپا ( حکمة بالغة ) حکمەتێکی تەواوە ( فما تغن النذر ) بەڵام ترساندنی ترسێنەران بۆ گەلی بێ‌بڕوا هیچ سوودێك نادات، چونکە دەرگای دڵیان داخراوەو قفڵ دراوە •

دوای باسی لاساریی بێ‌بڕوایانی مەککە ئنجا بە پێغەمبەر ئەڵێ کە

فَتَوَلَّ عَنْهُمْ يَوْمَ يَدْعُ الدَّاعِ إِلَى شَيْءٍ نُكُرٍ (٦) خُشَّعاً أَبْصَارُهُمْ يَخْرُجُونَ مِنَ الأَجْدَاثِ كَأَنَّهُمْ جَرَادٌ مُنْتَشِرٌ (٧) مُهْطِعِينَ إِلَى الدَّاعِ

---

بەڵام ترساندنی ترسێنەران ( بۆ گەلی بێ‌بڕوا ) کەڵکی نی‌یە (٥) ئنجا تۆ (ئەی محمد) ڕوویان لێ وەرگێڕە (وە چاوەڕوانی ئەو ڕۆژە بکە) کە بانگ‌کەر بانگی مەردوم ئەکات بۆ شتێکی زۆر ناخۆش ( کە ڕۆژی مەحشەرە) (٦) (تۆ لەو ڕۆژەدا ئەیان‌بینیت هەموو) ڕیسواو چاوشۆڕ ، لە گۆڕ دێنە دەرەوە مانندی کوللەی پەراگەندە (٧) خێرا دوای بانگ کەرەکە ئەکەوون ،

---

خۆتیان لە گەڵا خەریك مەکە وە ئەفەرموێ ( فتول عنهم ) ڕوویان لێ‌وەرگێڕە ( یوم یدع الداع )تا ئەو ڕۆژەی هەرچی مردوو هەیە زیندوو ئەکرێتەوە، وە بانگ‌کەر بانگی مەردوم ئەکات ( الی شیء نکر )بۆ شتێکی زۆر ناخۆش کە ڕۆژی قیامەتە، بە خۆی‌و هەموو ئازارو سزاو سامێکی‌یەوە، ئنجا لەو حەلەدا تۆ ـ ئەی پێغەمبەر ! ـ ئەیان‌بینیت ( خشعا ابصارهم ) چاویان سەر بەرەوژێر لە ترساناو لە شەرمەزاریدا هەموو تەریق‌و ڕیسوا، ناتوانن بڕ بە چاو تەماشابکەن ( یخرجون من الاجداث ) لە گۆڕ دێنە دەرەوە بە زۆریی ( کانهم جراد منتشر ) ئەڵێی کوللەی بەسەر یەکا کەوتووی تێکەڵو پێکەڵن ( مهطعین الی الداع ) بە پەلەو دەستو برد ئەڕۆن بە دەنگ ئەو بانگ‌کەرەوە کە بانگیان ئەکات، ئنجا لەم کاتی کۆبوونەوەو ترس‌و پەلە

يَقُولُ الكافِرُونَ هذا يَوْمٌ عَسِرٌ (٨) كَذَّبَتْ قَبْلَهُمْ قَوْمُ نُوحٍ فَكَذَّبوا عَبْدَنا

بێبڕوایان ( لە بەر خۆیانەوە ) ئەڵێن : ئەمڕۆ ڕۆژێکی زۆر سەختە (٨) لە پێش گەلی محمد گەلی نووح قسەکانی بەندەی ئێمە نووحیان بە درۆ زانی ،

بەلەدا ( یقول الکافرون هذا یوم عسر ) بێبڕوایان لە بەر خۆیانەوە ئەڵێن : ئەمڕۆ ڕۆژێکی ئێجگار سەختە، بەڵام بڕواداری ڕاستی ئەم ترس و بیمەیان بەم ڕەنگە نی یە •

★ ★ ★

ئنجا خوای گەورە داستانی هێندێ پێغەمبەرانمان بۆ ئەگێڕێتەوە لەگەڵ نەتەوە لاسارەکانیاندا کە بڕوایان پێ نەهێناوون، وە باسی ئەوسزاو لە ناوبردنەیان ئەکات کە خوا لە تۆڵە داوێتی بە سەریانا بۆ ترساندنی هاوبەش پەیداکەرەکانی مەککە، وە بۆ دڵخۆشی دانەوەی پێغەمبەر، واتە ئەو خوایەی کە ئەوگەلانەی پێشووی لە ناوبرد ، ئەتوانێ ئەمانیش لە ناو بەرێ وە ئەو خوایەی پێغەمبەرانی پێشووی سەرخست ئەتوانێ تۆش ـ ئەی محمد ! ـ سەربخات، ئنجا هات لە کونترین گەلەوە دەستی پێکرد کە گەلی نووحەو فەرمووی : ( کذبت قبلهم قوم نوح ) گەلی نووح لە پێش گەلی حەزرەتی محمددا ڕۆژی قیامەت و زیندوو بوونەوەیان بە درۆ زانی ( فکذبوا عبدنا )وە قسەکانی

وَقَالُوا : مَجْنُونٌ وَازْدُجِرَ ( ٩ ) فَدَعَا رَبَّهُ : انِی مَغْلُوبٌ فَانْتَصِرْ ( ١٠ ) فَفَتَحْنَا أَبْوابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُنْهَمِرٍ (١١)

وە وتیان ( نووح ) پیاوێکی شێتە ، وە جڵەو گیریی کرا (٩) تابانگی کردە پەروەردگاری خۆی ( ووتی ) بەڕاستی من زەبوونی گەلەکەمم ( خوایە ! ) تۆ یارمەتیم بدە (١٠) ئێمەش هەرچی دەرگای ئاسمان بوو کردمانەوە بە ئاوی بارانی بەخوڕ (١١)

بەندەی ئێمە ( نووح پێغەمبەریان ) بە درۆ دانا ( وقالوا مجنون )وە ووتیان نووح پیاوێکی شێتە ( وازدجر ) وە جڵەوگیری کرا لە ڕاگەیاندنی فەرمانی خوا، واتە هەر چەند بانگی بکردنایە بۆ خوا پەرستی بەردە بارانیان ئەکردو سزایان ئەدا، وە هەڕەشەیان لێ ئەکرد بەکوشتن، وە ئەمە ساڵەهای ساڵ درێژەی سەند، وەچین لە دوای چین ئەمە پیشەیان بوو تا بە تەواوی حەزرەتی نووح نائومێد ما، وە هیچ هیوایەکی نەما، ئنجا ناچار پاڕایەوە لە بارەگای خوا، وە نزای خرابی لێ کردن، وەکو ئەفەرموێ : ( فدعا ربە انی مغلوب ) بانگی پەروەردگاری خۆی کردو ووتی : خوایە! من بە دەست گەلەکەمەوە زەبوونم‌و دەرەقەتیان نایەم ( فانتصر ) یارمەتی دینی خۆت‌و پێغەمبەری خۆت بدە، دەوری من تەواو بوو نۆرەی تۆیە، ئەوەندەی پێ نەچوو ئەم نزایە گەیشتە بارەگای خوای گەورە، وە فەرمان دەرچوو بە کردنەوەی دەرگای ئاسمان لە هەزاران لاوە بە هەڵڕشتنی بارانی لێزمەو بەخوڕ، وە بە هەڵقوڵینی ئاوی زەوی دیسان لە هەزاران لاوە، وەکو ئەفەرموێ ( ففتحنا ابواب السماء بماء منهمر ) ئێمەش هەرچی دەرگای ئاسمان بوو کردمانەوە بە

وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُوناً فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَى أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ (١٢) وَحَمَلْنَاهُ عَلَى ذَاتِ أَلْوَاحٍ وَدُسُرٍ (١٣) تَجْرِي بِأَعْيُنِنَا جَزَاءً لِمَنْ كَانَ كُفِرَ (١٤) وَلَقَدْ تَرَكْنَاهَا آيَةً فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ (١٥)

---

وە لە زەوی چاوگەی زۆرمان هەڵقوڵاند تا ئاوی ئاسمانو زەوی یەك کەوتن لە سەرتۆفانێك ( کە لە ئەزەلدا ) بڕیاری لە سەردرابوو (١٢)وە نووحمان هەڵگرت لە سەر کەشتی‌یەکی قایم ، بە تەختەوبزمار (١٣) ئەڕۆیشت بە چاودێری ئێمە تا بێ‌بڕوایان بە تۆڵەی خۆیان بگەن (١٤) بێ‌گومان ئەوکەشتی‌یەمان بە ساغی بە جێ‌هێشت تابێ بە پەند ، ئنجا ئاخۆ هەبێ پەند وەگرێك ؟ (١٥)

---

ئاوی بارانی سەر بەکلاوە، وە چل شەوو چل ڕۆژ ئەم شەستو بارانە دائەڕژا بە بێ پسانەوە ( وفجرنا الارض عيونا )وە لە زەوی هەزاران کانیو کارێزمان هەڵقوڵاند ( فالتقى المـاء )تا ئاوی ئاسمانو زەوی یەك کەوتن ( على امر قد قدر )لە سەر تۆفانێك کە لە ئەزەلدا بڕیار درابوو ( وحملناه )وە نووحمان هەڵگرت لەگەڵ ئەوانەی کە بڕوایان پێ هێنابوو ( على ذات الواح ودسر ) لە سەر کەشتی‌یەك کە دروست کرابوو لە تەختەی گەورە گەورەو گوڵمێخی ئاسن ( تجری باعيننا )ئەو کەشتی‌یە ئەڕۆیشت بە ئاگاداریی‌و چاودێریی ئێمە ( جزاء لمن كان كفر )بە تۆڵەو سزای ئەوانەی کە بێ‌بڕوابوون ( ولقد تركناها آية ) وە ئەو کەشتی‌یەمان بە جێ‌هێشت تابێ بە نیشانەی پەندو ئامۆژگاری بۆ پاشەڕۆژی ئەو گەلانەی کە بە دوایانا دێن ( فهل من مدكر ) ئایا هیچ پەند وەرگرێك هەیە کە لەم داستانە پەند وەربگرێ ؟ ،

فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ؟ (١٦) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ (١٧) كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ (١٨)

( ئەی بەندەگانی جیهان ! ) تۆڵەو ترساندنم چۆن بوو ؟ (١٦) بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ پەند لێ وەرگرتن ، ئایا هەیە پەند وەرگرێك ؟ (١٧) گەلی عاد فەرموودەی پێغەمبەرەکەیان بە درۆ زانی ، ئنجا بزانن سزاو ترساندنم چۆن بوو ؟ (١٨)

واتە فەلاکەتی زۆر گەورەمان بە سەر هێنانو هەموومان لە ناوبردن، بێ ئەوەی دانەیان لێ دەربکەین ( فکیف کان عذابی ) ئنجا چۆن بوو تۆڵەی من لە دنیادا؟ ( ونذر )وە ترساندنم بۆ ئەوگەلە .

لە پاشا ئەفەرموێ ( ولقد یسرنا القرآن للذکر ) بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ پەند وەرگرتن، واتە پڕمان کردووە لە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوەی بەهرەی لێ وەربگیرێ ( فهل من مدکر ؟ ) ئنجا ئاخۆ پەند وەرگرێك ببێ پەندی لێ وەربگرێ؟ واتە ئەم جۆرە کەسانە کەمن !

دوای ئەوەی کە داستانی گەلی نووحی گێڕایەوە بە هەموو پەندو ئامۆژگاری یەکیەوە، ئنجا* داستانی «عاد»ی خێڵی «هود» ئەگێڕێتەوە کە لە خوارووی دوورگەی عەرەبەوە دانیشتبوون، تا ئاشکرا ببێ گەلی قورەیش کە سەرەنجامی هەموو گەلێکی لاساری سەهەندە هەر لەناو چوونە فەرمووی : ( کذبت عاد ) خێڵی عاد وەك گەلی نووح ئامۆژگاریی پێغەمبەرەکەیان بە درۆزانی، ئنجا پێش ئەوەی ئەم ئایەتە تەواو بکات فەرمووی ( فکیف کان عذابی ونذر ؟ ) واتە گوێ بگرن بزانن سزاو

إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحاً صَرْصَراً فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُسْتَمِرٍ ( ١٩ ) تَنْزِعُ النَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُنْقَعِرٍ (٢٠)فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ؟ (٢١) وَلَقَدْ يَسَّرْنَا القرآنَ لِلذِّكْرِ

---

ئێمە بایەکی توندی بێ پسانەوەمان ناردە سەریان لەڕۆژێکی شووما (١٩) زەلامی هەڵئەکەند وەك بنکە دارخورمای لە بێنج هەڵکەندراو (٢٠) ئنجا ئەبێ سزاوترساندمان چۆن بووبێ ؟ (٢١) بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ پەند لێوەرگرتن ،

---

هەڕەشەی من لە دنیادا چی‌بوو بۆ ئەوان کە وا بە درێژی باسی ئەکات ئەفەرموێ : ( انا ارسلنا ريحا صرصرا في يوم نحس مستمر )ئێمە بایەکی توندو تیژی ساردی پەیوەستی بێ پسانەوەمان ناردە سەریان لە ڕۆژێکی شوومی سەختا ( تنزع الناس ) زەلامی وەك درەخت هەڵئەکەند لە سەر زەوی‌و ئەی‌برد بەئاسماناو سەربەرەو خوار ئەی‌هێناو ئەیدا بەزەویداو هەموو بە مردوویی ئەکەوتن ( كانهم اعجاز نخل منقعر ) وەك بنکە دارخورمای لە بێخ هەڵکەندراو، ئەمە سزای دنیایان بوو ( فكيف كان عذابي ونذر ) ئنجا ئەبێ سزاو هەڕەشەی ئێمە چۆن بێ لە ڕۆژی دوایيدا ( ولقد يسرنا القرآن للذكر ) قورئانمان

فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ (٢٢) كَذَّبَتْ ثمودُ بِالنُّذُرِ (٢٣) فقالوا : أَبَشَراً منا واحِداً نَتَّبِعُهُ ؟

---

ئایا پەند وەرگرێك هەیە ؟ (٢٢) گەلی ( ثمود ) فەرموودەی پێغەمبەرەكەیان بە درۆ زانی (٢٣)و ووتیان ئایا ئێمە دوای ئادەمی‌یەك بكەوێن لە خۆمان ؟

---

ئاسان كردووە بۆ پەند وەرگرتن ، ( فهل من مدكر ) ئنجا ئاخۆ پەند وەرگرێك ببێ پەندی لێ‌وەرگرێ؟ واتە پەندوەرگر كەمە !٠

ئەمەی كە ئەووترێ : فلان ڕۆژ شوومەو فلان ڕۆژ پیرۆزە ، وەلەم ڕووەوە هێندی شت ئەگێڕنەوە لە دەم پێغەمبەرەوە، هەمووی درۆن‌و هیچ بایەخێكیان پێ نی‌یە، ڕۆژ هەمووی ڕۆژی خوان، وە هیچ زەرەرو زیانێكیان نی‌یە لەخۆیانا، یا پیرۆزی‌و شوومی‌یەكیان نی‌یە، هەموو ڕۆژێك ڕۆژی خوایە، هەر ڕۆژێك كەدێت‌و ئەڕوا پیرۆزە بۆ هێندێك‌و شوومە بۆ هێندێكی‌تر، بەپێی ئەو خۆشی‌و ناخۆشی‌یەی كە خوا نیا ئەنێرێ بۆ مەردوم ٠

★ ★ ★

ئنجا باسی داستانی «ثمود» ئەكات ( گەلێك بوون لەسەرووی جەزیرەی عەرەبدا دانیشتوون ) ئەفەرموێ ( كذبت ثمود بالنذر ) خێڵی سەموود وەك خێڵی عاد ئاموژگاریی صالح پێغەمبەریان بە درۆ زانی،وە دەستیان كرد بەگاڵتە پێ‌كردنی ( فقالوا ابشرا منا واحدا نتبعه ؟ )ووتیان

اِنّا اِذاً لَفی ضَلالٍ وسُعُرٍ (٢٤) أَأُلْقِیَ الذِکْرُ عَلَیهِ مِن بَیْنِنا ؟ بَلْ هُوَ کَذّابٌ أَشِرٌ (٢٥) سَیَعْلَمُونَ غَداً مَنِ الْکَذّابُ الْأَشِرُ (٢٦)

---

ئێمە ئەگەر وابکەین ئەبێ گومڕاو شێت بین (٢٤) ئایا لە ناو هەموانا سرووش هەر ئەبێ بۆ ئەو بێ بەتەنیا ؟ ، (وانی‌یە) بەڵکو ئەو درۆزنێکی خودپەسەندە (٢٥) ئەم بێ‌بڕوایانە سبەینێ تێئەگەن کە کێ درۆزنو خودپەسەندە ؟ (٢٦)

---

ئایا ئێمە دوای ئادەمی‌یەك بکەوین لە خۆمانو پەیڕەویی بکەین بێ ئەوەی کە لە ئێمە گەورەتر، یا خوێندەوارترو زاناتر بێ ؟•

ئەگێڕنەوە کە صالح پێغەمبەر پێی ووتن : ئەگەر بە قسەم نەکەنو دوام نەکەوون گومڕا ئەبن، ئەوانیش قسەی پێغەمبەرەکەیان هەڵگێڕایەوە، وە پێیان ووت : ( انا اذا لفی ضلال وسحر ) ئەگەر ئێمە دوای تۆ بکەوین گومڕا ئەبینو ڕێی ڕاست وون ئەکەینو بە شێت ئەژمێررێین •

دوای ئەمە پلەیەکی‌تر پێیان هەڵبڕی لە سەرکێشی‌و لاساری ووتیان: ( أألقي الذكر عليه من بيننا ؟ ) ئایا لە ناو هەموانا سرووش (وحی) بۆ ئەوبێ ؟ ئەمە وانی‌یە ( بلْ هو كذاب أشر ) بەڵکو ئەو پیاوێکی درۆزنی خودپەسەندە، ئەیەوێ خۆی بکا بە سەرۆك بە سەرمانا، تا هیچمان لە فەرمانی دەرنەچین •

ئنجا هەڕەشەیان لێ ئەکات، وە لە پەردەیەکی ئەدەبا قسەکەیان پێ ئەڵێتەوە ئەفەرموێ : ( سيعلمون غدا من الكذاب الاشر ) ؟ لە مەولا

اِنّا مُرْسِلوا النّاقَةِ فِتْنَةً لَهُمْ ، فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ (٢٧)
وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْماءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُحْتَضَرٌ (٢٨)

ئێمە بۆ تاقی کردنەوەی ئەوان حوشترێك ئەنێرین ، ئاگاداریان بەو دان بەخۆتا بگرە (٢٧) وە ئاگاداریان بکە کە ئاوەکەیان لە ناوەندی حوشترەکەو ئەوانا بەش کراوە ، هەموو بەشە ئاوێك با خاوەنی ئامادە بێ لە نۆرەی خۆیا (٢٨)

کەسزایان بەسەرا ڕژا ئەو کاتە تێ‌ئەگەن کێ دروزنی خودپەسەندە ؟ پێغەمبەرەکەیان کە بانگیان ئەکات بۆ خواپەرستی، یا خێڵی سەموود کە بت ئەپەرستن‌و گومڕا بوون •

ئنجا باسی سەرەتای ئەو سزایانە ئەکات کە بەڵێنی پێ‌دا، ئەفەرموێ: ( انا مرسلوا الناقة فتنة لهم ) بەڕاستی ئێمە ئەی صالح پێغەمبەر بۆ تاقی کردنەوەی ئەوان حوشترێکتان بۆ ئەنێرین، ( فارتقبهم ) چاودێری‌یان بکە، وە بزانە لەگەڵ حوشترەکەدا چی‌ئەکەن ؟ ( واصطبر )وە دان بەخۆتا بگرە لە سەر ئازارو سزایان، ( ونبئهم )وە تێ‌یان بگەیەنە ( ان الماء قسمة بینهم ) کە ئاوی بیرەکە بەش کراوە لە ناوەندی ئەوان‌و حوشترەکەدا ، واتە ڕۆژێك لە بەیانی‌یەوە تائێواری بۆ ئەوان‌و ڕۆژێکیش بۆ حوشترەکە ( کل شرب محتضر ) هەموو بەشە ئاوێك خاوەنی خۆی با ئامادە بێ لە نۆرەی خۆیا، واتە لە نۆرەی حوشترەکەدا نابێ کەسی‌تر حازربێ، وە لە نۆرەی ئەوانا نابێ حوشترەکە حازربێ، ئەمەش لە بەر ئەوە بوو کە ئاژاڵی دێیەکە لە

فَنادوا صاحِبَهُمْ فَتَعاطى فَعَقَرَ (٢٩) فَكَيْفَ كانَ عذابى وَنُذُرِ ؟ (٣٠) اِنّا أَرْسَلْنا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً واحِدَةً فَكانوا كَهَشيمِ الْمُحْتَظِرِ (٣١)

---

( لەمە گەلەکە تەنگە تاو بوو ) ، ئنجا هاواریان لە هاوڕێ (خراپە)کەیان کرد ، ئەویش دەستی دایە شمشێرەکەیو چوار پەلی حوشترەکەی پەی کرد (٢٩) ئنجا بزانن تۆڵەو ترساندنی من چی بوو بۆیان ؟ (٣٠) ئێمە یەك هەورەتریشقەمان بۆ ناردن ، وە هەموو بوون بە پووشی ژێر پێی ئاژەڵ (٣١)

---

حوشترەکە ئەترسان، کەئەویان بدیایە لەسەر ئاوەکە ئەوان نەئەهاتن بۆ ئاو خواردنەوە لەمە ئاوایی‌یەکە تەنگەتاو بوونو ویستیان لە حوشترەکە ڕزگاریان بێ ( فنادوا صاحبهم ) ئنجا بانگی هاوڕی‌کەیان کرد ( قوداری کوڕی سالیف ) (فتعاطى) پرکێشی کرد بۆکردنێکی کارێکی گەورەو دەستی دایە شیرێکی تیژ ( فعقر )وە دای بە هەر چوار پەلی حوشترەکەدا یەیی کرد، ئنجا باسی سزاکەیان ئەکاتو ئەفەرموێ ( فكيف كان عذابى ونذر ) واتە گوێ بگرن بزانن‌تۆڵەو هەڕەشەی من لە ﻫﻴﻨﻴادا چی بوو؟ کە وا باسی ئەکاتو ئەفەرموێ ( انا ارسلنا عليهم صيحة واحدة ) ئێمە یەك هەورەتریشقەمان بۆ ناردن ( فكانوا كهشيم المحتظر ) وە بوون بە مانەندی پووشێ کە خاوەن ئاژاڵ کۆی ئەکاتەوە لە ژێر پێی ئاژەڵەکەیا، وە ئەوانیش لە خواردنا پێی پیا ئەنێن تاورد ئەبێ لە ژێر پێ‌یانا .

وَلَقَدْ يَسَّرْنا الْقُرآنَ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ ؟ (٣٢) كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بالنُّذُرِ (٣٣) اِنّا أَرْسَلْنا عَلَيْهِمْ حاصِباً اِلاّ آلَ لُوطٍ نَجَّيْناهُمْ بِسَحَرٍ (٣٤)

---

بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ پەند لێ وەرگرتن ، ئنجا ئاخۆ پەند وەرگرێك ببێ ؟ (٣٢)
گەلی لووت ئامۆژگاریی پێغەمبەرەکەیان بە درۆ زانی (٣٣) ئێمەش بامان ناردە سەریان بە وردە زیخەوە ، خانەوادەی لووت نەبێ کە ڕزگارمان کردن لە بەرەبەیانا (٣٤)

---

( ولقد یسرنا القرآن للذکر ) بەڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ پەند لێ وەرگرتن ( فهل من مدکر ؟ ) ئنجا ئاخۆ پەند وەرگرێك ببێ تا پەندی لێ وەربگرێ ؟ واتە کەمە •

ئنجا پەردە دائەداتەوە بە سەر ئەم تۆڵەیەدا، لە کاتێکاکە لەچاوا چەشمەندازێكو ، لەدڵداتینو تەوژمێکی بە جێ هێشت •

★ ★ ★

ئنجا پەردەیەکیتر هەڵئەداتەوە لە سەر زنجیرەیەکی تازە لەمێژوو لە جەزیرەی عەرب، ئەفەرموێ ( کذبت قوم لوط بالنذر ) گەلی لووت ئامۆژگاریی پێغەمبەرەکەیان بە درۆزانی، ئنجا باسی ئەوفەلاکەتە ئەکات کە ناردوویەتە سەریان ئەفەرموێ ( انا ارسلنا علیهم حاصبا ) بەڕاستی ئێمە ناردمانە سەریان بایەکی توندو تیژ بە وورده بەردو زیخەوە، دەستی لێهەڵنەگرتن تا لە ناوی بردن ( الا آل لوط ) خانەوادەی لووت نەبێ ( نجیناهم بسحر ) کە ڕزگارمان کردن

نِعْمَةً مِنْ عِنْدِنا ، كذلك نَجزِي مَنْ شَكَرَ (٣٥) وَلَقَدْ أَنذرناهُمْ بَطْشَتَنا فَتَماروا بِالنُّذُرِ ( ٣٦ ) وَلَقَدْ راوَدُوهُ عَنْ ضَيْفِهِ

به ڕەحمەتی خۆمان هەر بەو ڕەنگە پاداشی ئەو کەسانە ئەدەینەوە کە سوپاسمان ئەکەن (٣٥) بەڕاستی ، (لووت) گەلەکەی ترساند بـــە سزای سەختی ئێمەوە ، دەمقاڵێیان کرد لەو ترساندنەدا (٣٦) بێ‌گومان (گەلی لووت) داوای میوانەکانیان لێ کرد ،

لە بەرەبەیانا ( نعمة من عندنا )بە ڕەحمەتی خۆمان (كذلك) هــەر بــەم ڕەنــگەی کــە پاداشی لووتو کچەکانیم دایەوە ( نجزی مـــن شـكر ) پاداشی ئەو کەسانە ئەدەینەوە کــە سوپاسی چاکەی‌ئێمە ئەکەن، وە بڕوا ئەهێنن بەو پێغەمبەرانەی کە بۆیان ئەنێرین •

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کــە خوا هەرگیز گەلێــکی لە ناو نەبردووە تاپێغەمبەرێکی بۆ نەناردبن‌و، بە سزای دین‌و دنیا نەی‌ترساندبن فەرمووی ( ولقد انذرهم بطشتنا ) بێ‌گومان لووت پێغەمبەر گەلەکەی خـــۆی ترساند بە سزای خوا، بەڵام گوێیان نەدایە وەکو ئەفەرموێ ( فتماروا بالنذر ) وە حەنەحەپەشێیان کرد لە گەڵیا ، وە پێیان باوەڕ نــەکرد ، وە بێ‌شەرمی‌و داوێن پیسی‌یان گــەیشت بە ئەندازەیەك داوایان لە لووت کرد کــە میوانەکانیان بداتێ تا بچن ئیشی خراپیان لە گـــەڵ بــکەن، ( میوانەکانی چەند فریشتەیەکی جــوان بوون لــە وێنــەی ئادەمیـــدا هاتبوون بۆ زێرەو ژوور کردنی ئەو گــەلە ) وەکو ئەفەرموێ ( ولقـد راودوە عن ضیفە )بێ گومــان گەلەکەی داوای ئــەو میوانەیان لێ کرد

فَطَمَسْنا أَعْيُنَهُمْ فَذوقوا عذابی ونُذُرِ ( ٣٧ ) وَلَقَدْ صَبَّحَهُمْ بُكْرَةً عذابٌ مُسْتَقِرٌ (٣٨)فَذوقوا عَذابی وَنُذُر(٣٩)

ئێمەش پەردەمان بە سەرچاویانا هێنا (وپێمان ووتن) بچەژن سزاو ترساندم (٣٧) وە بێ گومان هێرشی بردە سەریان لە بەرەبەیانا سزایەکی پایەدار (٣٨) ئنجا بچەژن سزاو ترساندنی من (٣٩)

کە لەو ڕۆژەدا هاتبوون بۆ لای لووت، وە ژنەکەی لووت بە دزی یەوە خەبەری بۆ ناردبوون کە چەند کوڕێکی جوان هاتوونو میوانمانن، وە لووت پێغەمبەریش نەی ئەدانێ، تا هێرشیان بردە سەر ماڵەکەی لووتیش دەرگاکەی لێ داخستن، وە ئەوان خەریك بوون قاپی یەکەی بشکێنن، لە دوایدا کە چوونە ژوورەوە خوا کوێری کردن وەکو ئەفەرموێ ( فطمسنا اعینهم ) چاویانمان کوێر کردن بە جۆرێ کە کەس نەبینن ، وە پێمان ووتن لە سەر زمانی ئەو فریشتانە ( فذوقوا عذابی ونذر ) بچەژن ئەم سزای بێ چاوی یە دوای ئەوەی کە هەڕەشەم لێ کردن لە سەر پیسیی کردەوەیان •

ئنجا باسی کاتی سزاکەیان ئەکات ئەفەرمووێ ( ولقد صبحهم بکرة ) بە ڕاستی هێرشی بردە سەریان لە بەرەبەیانا ( عذاب مستقر ) سزایەکی پایەداری بەردەوام کە شوێنەوارەکەی تا ڕۆژی دوایی هەر ئەمێنێ ( فذوقوا عذابی ونذر ) ئنجا بچەژن لە تۆڵەی کردەوە پیسەکانتانا سزای ئەمڕۆ ئەوی کە بە هەڕەشە پێغەمبەرەکەتان بەڵێنی پێ

وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ(٤٠)
وَلَقَدْ جَاءَ آلَ فِرْعَوْنَ النُّذُرُ (٤١)

بە ڕاستی قورئانمان ئاسان کردووە بۆ پەند لێ وەرگرتن ، ئنجا ئاخۆ پەند وەرگرێك بێ(٤٠) بێ گومان هات بۆ سەر فیرعەونو گەلەکەی ترسێنەران (مووساو هاروون) (٤١)

داوون لە ئاگری دۆزەخ ( ولقد یسرنا القرآن للذکر فهل من مدکر ) ئەم ڕستەیە لە دوای ئەم چوار داستانەوە لە هەر چوار داستانەکەدا دووبارە کراوەتەوە ، بۆ ئەوەی نیشان بدات کە هەموو داستانێکی داستانێکی سەر بە خۆیەو مایەی بیرکردنەوەو سڵەمینەوەیە •

ووتنەوەو دووبارە کردنەوەی ڕستەیەکی گرنگ لە زۆر زمانا چ لە هونراوەو چ لە پەخشاندا باوە، ئەم جۆرە ووتنەوەو دووبارەکردنەوەیە لە مەولا لە سوورەی «الرحمن»و «المرسلات»دا دێ، لە یەکەمیاندا «فبأی الاء ربکما تکذبان »و لە دووەمیاندا « ویل یومئذ للمکذبین »ەیە •

دوای باسی ئەم زنجیرانە لە مێژووی جەزیرەی عەرەبیدا باسی زنجیرەیەکی ترمان بۆ ئەکات، زۆر بە کورتیو لە دەرەوەی جەزیرەی عەرەبیداو ئەفەرموێ : ( ولقد جاء آل فرعون النذر ) بە ڕاستی هات بۆ سەر فیرعەونو گەلەکەی ـ ترسێنەری وەك حەزرەتی مووساو هاروونی برای ـ بە نۆ موعجیزەوە کە نیشانەی گەورەیو

كَذَّبوا بِآياتِنا كُلِّها فَأَخَذْناهُمْ أَخْذَ عَزيزٍ مُقْتَدِرٍ (٤٢)
أَكُفّارُكُمْ خَيْرٌ مِنْ أُولئِكُمْ ؟ أَمْ لَكُمْ بَراءَةٌ في الزُّبُرِ ؟ (٤٣)

---

هەرچی نیشانەکانی ئێمە بوو هەموویان بە درۆ زانی ئێمەش گرتمانن بە وێنەی گرتنی زاڵێکی توانا (٤٢) ئایا بێ بڕواکانی ئێوە باشترن لەم گەلانی ڕابوردووە ؟ یا ئێوە ئەماننامەتان بە دەستەوەیە لە نامەی ئاسمانی (٤٣)

---

دەسەڵاتی خوان ( كذبوا باياتنا كلها ) هەرچی نیشانەکانی ئێمە بوو هەموویان بەدرۆ زانی ( فاخذناهم اخذ عزيز مقتدر ) ئنجا ئێمەش بە دەسەڵاتی خۆمان گرتمانن بە وێنەی گرتنی زاڵێکی بە دەسەڵاتی تەوانا .

لەم ئایەتانی پێشوودا باسی گەلی نووحو عادو سەموودو لووتو فیرعەونی کرد کە بە هۆی بێ بڕوایی‌یان بە پێغەمبەرەکانیان خوا لە ناوی بردن، ئنجا تا چەشمەندازی لە ناوچوونی ئەم گەلانە لە بەر چاوە، وە تا تینو تەووزمەکەیان لە دڵا ماوە ، نۆرەی هەڕەشە کردنە لە هاوبەش پەیدا کەرەکانی قورەیش فەرمۆی ( اكفاركم ) ئایا بێ بڕواکانی ئێوە ئەی خەڵکی مەککە ! ( خير من اولئكم ) باشترنو بە هێزترن لەو گەلانی ڕابوردووە کە باسکران ؟ تا دڵنیا بن لەو فەلاکەتانەی کە بە سەر ئەوانا هاتوون ( ام لكم براءة في الزبر ) یا ئێوە ـ ئەی هاوبەش پەیدا کەران ! ـ ئەماننامەتان هەیە لە نامەی ئاسمانی‌دا نووسراوە بۆتان کە ئێوە هیچ جۆرە سزایەکتان لە پێشەوە

أَمْ يَقُولُونَ : نَحْنُ جَمِيعٌ مُنْتَصِرٌ ( ٤٤ )
سَيُهْزَمُ الْجَمْعُ وَيُوَلُّونَ الدُّبُرَ (٤٥)
بَلِ السَّاعَةُ مَوْعِدُهُمْ ، وَالسَّاعَةُ أَدْهَى وَأَمَرُّ (٤٦)

---

یا ئەڵێن ئێمە کۆمەڵێکی سەر کەوتووین؟ (٤٤) زوو کۆمەڵەکەیان ئەشکێو پشت هەڵئەکەن(٤٥) بەڵکو ڕۆژی دوایی وەعدەگاهی ئەوانە ، وەسزای ئەوڕۆژە گەلێ سەختترو تاڵترە (٤٦)

---

نی‌یە، وە لە تۆڵەی هەموو بێ بڕوایی‌یەك بەدوورن ، لە گەڵ ئەمیشە نە لەوان باشترن‌و نە ئەمان‌نامەشتان بۆ هاتۆتە خوارەوە لە نامەی ئاسمانی‌دا، کە واتە ئەوان تووشی چ تۆڵەو سزایە بوون ئێوەش هەروا تووش ئەبن، بەو ڕەنگەی کە خوا بی‌یەوێ ( ام یقولون نحن جمیع منتصر ) یا ئەڵێن : کومەڵێکی یەکگرتووی سەرکەوتووین‌و کەس زەبوونمان ناکات، وە هێزو دەسەڵاتێك نی‌یە لە زوور هێزو دەسەڵاتی ئێمەوە ، وە نازانن کە زوو بە زوو ئەو کۆمەڵە گەورەیە لە جەنگی بەدرا ئەشکێن‌و پشت هەڵئەکەن، وەکو ئەفەرموێ : ( سیهزم الجمع ویولون الدبر ) زوو کۆمەڵەکەیان ئەشکێو پشت هەڵئەکەن •

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە ئەمە لەدنیادا سزایانە بەڵام سزایان لە ڕۆژی دوایی‌دا زۆر توندو تیژو قورس‌و گرانترە وەکو ئەفەرموێ ( بل الساعة موعدهم ) بەڵکو ڕۆژی دوایی وەعدەگای ئەوانە ( والساعة ادهی وامر )وە سزای ئەوڕۆژی دوایی‌یە گەلێ سەختترو تاڵترە لەو سزایانەی کە لەمەولا ئەیان بینن •

اِنَّ الْمُجْرِمِينَ فِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ (٤٧)

بەڕاستی بەدکارانی جیهان ( لە دنیادا ) لە گومڕاییو ( لە ڕۆژی دوایدا ) لە دۆزەخا ئەبن (٤٧)

بەڕاستی خواڕاستی فەرمووە کە گەورە گەورەکانی مەککە شکانو پشتیان هەڵکرد لە غەزای «بەدر»دا کە لە ساڵی دووەمی کۆچیدا بوو لە مەدینە لە کاتیکا کە ئەم سوورەتە لە مەککە هاتۆتە خوارەوە، کە ئیسلام لەو ڕۆژەدا نە لەشکری بوو نە بیری جەنگی بوو بەڵکو مسڵمانەکانی پەرشو بڵاو بوون لە مەککەو لەحەبەشەو لە مەدنیەدا وە لە هەمووڵایەکەوە سزا ئەدران لە لایەن هاوبەش پەیدا کەرەکانەوە، تەنانەت حەزرەتی عومەر ئەفەرموێ : کاتێك کە ئەم ئایەتانە هاتنە خوارەوە نەمزانی ئەم قسەیە چی‌یە ؟ تاڕۆژی بەدر هاتە پێشەوە ، وە پێغەمبەرم دی زرێی لە بەرا بوو وە ئەی فەرموو « سیهزم الجمع ویولون الدبر ، بل الساعة موعدهم والساعة ادهی وامر »، ئنجا تێی گەیشتم کە ئەم ئایەتە وەختی خۆی ئیخبار لە غەیبەوە بووە، وە لە پاش سێ چوار ساڵ لە بەدردا هاتەدی کە حەفتا کەس لەگەورە گەورەکانی قورەیش کوژران کە یەکێکیان « ئەبوجهل» بوو ، وە حەفتاشیان لێ بە دیل گیرا •

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە سزای ڕۆژی دوایی چۆن سەختترو تاڵترە ، ئەفەرموێ : ( ان المجرمين في ضلال وسعر ) بێ‌گومان بەدکارانی جیهان لە دنیادا لە گومڕاییو لە ڕۆژی دوایدا لە ئاگری دۆزەخدا

يَوْمَ يُسْحَبُونَ فِي النَّارِ عَلَى وُجُوهِهِمْ ذُوقُوا مَسَّ سَقَرَ ( ٤٨ ) إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ (٤٩)

ئەو ڕۆژەی كە لە سەر ڕووڕا ئەكێشرێن لە ئاگرا ( وە پێیان ئەووترێ ) : بچەژن سووتانی دۆزەخ (٤٨) ئێمە هەموو شتێكمان دروست كردووە بە ئەندازە (٤٩)

ئەبن ( یوم یسحبون في النار علي وجوههم ) ئەو ڕۆژەی كە ئەو بەدكارانە لە سەر ڕوو ڕائەكێشرێن لە ئاگری دۆزەخا، وە پێیان ئەوترێ ( ذوقوا مس سقر ) بچەژن سووتانو برژانو هەڵقرچانی دۆزەخ •

لە دوای باسی ئەم پێنج زنجیرەیە لە مێژووی پێشینان، ئنجا ڕوو ئەكاتە هەموو ئادەمیبە تێكڕاییو گەلی قورەیش بە تایبەتی بۆ ئەوەی تێیان بگەیەنێ كە هەرچی ڕوو بدات لەم جیهانەدا بە گوترە نییە ، بەڵكو بە تەقدیری خوایە ئەفەرموێ ( انا كل شيء خلقناه بقدر ) بەڕاستی ئێمە هەموو شتێكمان دروست كرپووە بە ئەندازەی خۆی بەبێ زیادو كەم، واتە هیچ شتێك لە بوونەوەردا بە گۆترە دروست نەكراوە بەڵكو هەمووی بە ئەندازەی تایبەتی خۆیەتی چ لە ناوەندی دروستكراوندا «مخلوقات» وە چ لەناوەندی ئەندامی تاقە دروستكراوێكدا لە هەرە ووردیلەوە تا ئەستێرەیەكی گەورە •

ئەم ئایەتە هەرچی شت هەیە ئەیگرێتەوە بەم ڕەنگە هەموو

ووردو درشتێك‌و ڕەنگدارو بێ ڕەنگێك‌و زانراوو نەزانراوێك، بەڵـــكو هەموو شتێك لەم بوونەوەردا دروست کراوە بـــە تەقدیرو ئەندازەی خۆی، هیچ شتێك لـە خۆیەوە یا بەگۆترە یا بەڕێـكەوت پەیدا نەبووە بەڵـكو هەمووی بەڕێك‌و پێـكی‌و بە ئەندازەی خۆی‌و لەکاتی خـــۆیا هاتۆتەدی ئـــەم ئایەتە کورتە ئامـــاژە «ئیشادە»یە بۆ شتێکی ڕاست‌و دروستی زۆرگەورە کە ئەویش ڕێك‌و پێکی‌یە لە ناوەندی شتێکا بـــە ڕێك‌و پێکی‌یەکی زۆر وورد، وەبوونێتی بە ئەندازەی خۆی، وە شاهید لە سەر ئەم‌ڕێك‌وپێکی‌یە بوونەوەرە •

بێ‌گومـــان زانینی نوێ ئـــەم گۆشەیەی بـە تەواوی ڕووناك کردۆتەوە، بە ئەندازەیەك کە زانایانی ئاسمان لە ڕێك‌وپێکیی ئەستێرەکان لـە بابەت قەبارەیان‌و دووری‌یان لە یەکتری‌و، هێـــزی کێشندەیان بۆ یەکتری ـ گەیشتوون بە پایەیەك کە بتوانن شـوێنی ئەو ئەستێرانەی کە هەن‌و هێشتا نەبینراوون، دەست نیشان بکەن، چونـکە هەر بە بوونی ئەو ئەستێرانە لەو شوێنانەدا تەفسیری هێندێ شت ئەکرێ کە دەرئەکەوون لە سووڕانەوەی ئەو ئەستێرانەی کـە لەژێر مـەدای چاودان، کە چی لـە پاشـا کەئەو شتە کـە بە تەواوی ڕوون ئەبێتەوە ، تەماشا ئەکـەن ئەوان چۆنیـان ووتووە وایە، کـە ئەمە نیشان ئەدات کەتێبینێکی ئیجـــگار زۆرو وورد لـە دابەش کردنی ئەم ئەستێرانەدا هەن لەم ئاسمانە کـاکی بە کاکی‌یەدا بەپێی ئەندازەی خۆی، کـە ئەمە مانای وایە ماوەی هەموو ئەستێرەیەك لەگـەڵ ئەستێرەیەکی‌ترا ئەبێ لەوەی کە ئێستا هەیە کەمترو زیاتر نەبێ مەگـــەر بە تێکڕایی •

ئەم زەوی‌یەی کـە ئێمـە لەسەر پشتی ئەژین، بە هەزاران هەزار

شتی وای تیا تێبینی کراوە، ئەگەر یەکێکیان ئەندازەکەی بگۆڕرێ بە زیاد یاکەم، ژیان لە سەر پشتی نامێنێ، قەبارەی ئەرزو دووریی لە ڕۆژەو، قەبارەی ڕۆژو، ئەندازەی گەرمی یەکەی، کلارەی تەوەرەی زەوی بەم ئەندازەیەی کە هەیەو سووڕانەوەی بە دەوری خۆیاو، بە دەوری ڕۆژا بەم ئەندازەیەی کە هەیەتی و، قەبارەی مانگ و دووریی لە زەوی یەوەو، دابەش کردنی ئاوو ووشکانی لە سەر زەوی و، قووڵیی دەریاکان و، هەزاران هەزار شتی تری وا ئەگەر تێك بچێ ژیان لە سەر زەوی نامێنێ •

ئەم تێبینی ئەندازەیەی کە لە دروست کردنی بوونەوەرا کراوە لە ناو گیان لە بەرانیشا هەرکراوە، بەم ڕەنگە مەلی گوشت خۆر وەك بازو هەڵۆو شاهێن ـ کە بەخواردنی مەلی بچووك ئەژین ـ زۆر کەمن، چونکە هێلکە کەم ئەکەن و، بێچوو کەم هەڵ ئەهێنن، جگە لەوەی کە ژیانیان لە هەموو شوێنێك نابێ ، بەڵکو لە هێندێ شوێنی سەختی تایبەتیدا ئەژین • ئەم مەلە گوشتخۆرانە بەرامبەر بەم چۆنێتی یە تەمەنیان درێژە، ئەگەر لەگەڵ ئەمتەمەنە درێژی یەدا بێچوویان زۆر بوایەو، لە هەموو شوێنێکیش بژینایە، مەلی بچووکیان لە سەر زەوی نەئەهێشت، یا خۆ ئەو زۆری یەیان نەئەما کە بۆ خواردنی ئادەمی و مەلانی گوشتخۆر پێویست بێ، وە بۆ گەلێ خزمەتی تر کە پێ یان سپێرراوە •

ئەمە لە بەر حیکمەتێکە کە خوا خۆی تەقدیری کردووە تامایەی مان و نەمان وەك یەك بوەستێتەوە لە ناوەندی مەلی گۆشت خۆرو مەلی بچووکا •

مێشێك بەملیۆن گـەرا دائەنێ، بەڵام خۆی لە دوو هەفتــە زیاتر نامێنێ ، ئەگەر یەك ساڵ بژیایەو گەرای دابنایە بەم پێیە ، مێش ڕووی زەویی دائەپۆشی ـ ئەوکاتە ژیانی زۆر لەگیان بەران، وە لــە پێش هەموویانا ئادەمی ـ بە دەگمەن ئەژیاو ئەمـا ، بەڵام ترازووی ئەندازەو ئەندازیاریی خوا کە هەرگیز سەرناکات لە دەسـتی قودرەتدایـە کـە ئیدارەی ئەم بوونەوەرە ئەکات وەڕێیدا بۆ زۆریی بیچوو، لــە گــەڵ تەمەن کورتیی مێشا، وە ئەمەبوو کە بوو کە وا ئەیبینین •

میکروب کــە لــە هەمووگیان لە بەرێك زەبوونترو تەمــەن کورتترە، بەملیۆنو بەبلیۆن لیی ئەمرێ بە هۆی سەرماو گەرمـــاو ڕووناکیو گەلێ شتیترەوە ئەم میکروبە زاڵ نابێ بە سەر بەشێکی کەما نەبێ لــە ئادەمی، ئەگــەر تەمەنی درێژتر بوایە، یا بەرگەی سەرمـــاو گەرماو ڕووناکیی بگرتایە، ژیان نەئەماو زیندووی نەئەهێشت •

هەموو زیندەوەرێك جۆرە چەکێکی هەیە کە خۆی پێ بپارێزێت لە هێرشی دوژمنانو بیمی لە ناوچوون، ئەم چەکانە گەلێ جۆری هـــەیە، زۆریی ژمارەیان چەکە، هێزو دەسەڵاتی شانو بازوو چەکە، لە ناوەندی ئەم دوانەدا گەلێ جۆری تری هەیە، ماری بچووك چەکەکەی زەهرە کە هەیەتیو خێرا ڕۆیینی لــە دەست دوژمنی، هەژدەهای گـــەورە ، چەکەکەی هێزی زۆرێتی لە بەر ئەوە زەهری کەمە •

ئاسك چەکەکەی چالاکییو ڕاکردنو بازدانێتی، شێر چەکەکەی هێزو هەڵمەتێتی •

هــەر وەها هەموو گیاندارێـــکی گـەورەو بچووك وەك یەکن،

قالۆنچە گیاندارێکی بچووکی بۆن ناخۆشی بەسزمانی بێفڕو فێڵە، ئەو چەکەی کە هەیەتی بۆ پاراستنی لە دوژمن بۆگەنی‌یەکەیەتی کە هەرچی دەستی لێی بکەوێ ئەو بۆگەنی‌یە وەرئەگرێ •

گەرای می‌ینە دوای متوربە بوونی لەگەڵ گیانداری تۆویی « حیوان منوی » ئەچێ ئەنووسێ بە دیواری ڕەحەمەوە، پەڵەیەکی لێ بریندار ئەکاتو سەرچاوەیەك خوێنی گەش بۆ خۆی پەیدا ئەکات، ئەو ڕیخۆڵەیەی کە منالەکەی بەستۆتەوە بە دایکی‌یەوە تا خواردنی لێ وەرگری، هەموو شتێکی تیا تێبینی کراوە بۆ بەجێ هێنانی ئەو کارانەی کە بۆی دانراوە، نە ئەوەندە درێژە کە خواردنی تیا بترشێ، وە نە ئەوەندەش کورتە کە خواردنی زۆری زوو زوو بۆ بنێری‌و ئازاری بدات •

مەمك لە سەرەتای منال بوونا ژەکێکی سپی مەیلەو زەرد ئەدات، ئەم ژەکە بە فەرمانی خوا دروست بووە لە چەند مادەیەکی کیمیایی تەواوە، منالەکە ئەپارێزێ لە تووش‌بوونی هەموو جۆرە نەخۆشی‌یەك، لە دوای لە دایك بوونی منال بە ڕۆژێك شیر دەست ئەکات بە پەیدابوون، وە ئەم شیرە بەپێی گەورە بوونی منالە ڕۆژ بە ڕۆژ زۆرترو خەست‌تر ئەبێ، تا دوای ساڵێك ئەبێ بەلیترو نیوێك لە کاتێکا لە سەرەتاوە نیو لیتر کەمترە •

لەگەڵ ئەم زیاد بوونی شیرەدا ڕۆژ بە ڕۆژ ئەو مەوادانەش کە لەشی ئەو منالە پێویستی بێ بە پێی گەورە بوونی منالەکە زیاد ئەبێ •

خۆ ئەگەر بێنەسەر باسی ئادەمی‌و ئەندامەکانی لەشی ئەم

هەمووکارگانەی کـــە تیـا دانراوە بە خۆیانو پیشەیانو کارکردنیان، ئادەمی سەر سام ئەکـــات •

ژیان لە ڕووەکدا لە ئادەمیو گیانلەبەرانی‌تر لە ژیاندا کـــەمتر نی‌یە، دانانی ئەندازە لە مانا کەمترنی‌یە لە دانانی ئەندازە لەوانا « وخلق کل شیء فقدره تقدیرا »(١) •

ئادەمی ئەگەر زۆر چاك وورد ببێتەوە تێ‌ئەگات کـە تەقـدیری خواو دانانی ئەندازەی بۆ هەموو شتێك گەلێ گەلێ لەمانەی کەووتران گەورەترو ووردترو قووڵترە، جووڵانەوەی ئەم بوونەوەرە بە بەسەرهاتو ڕووداویەوە تەقـدیر کراوەو ئەندازەی بـۆ دانراوە بـە گـەورەو بچووکیەوە، هەموو جووڵانەوەیەك لـە مێژوودا ڕێـکیی حیکمەتێکی خواییی‌یە، ئادەمی کـــە تێی‌گەیشت ســـەری سوڕ ئەمێنێو بە ڕوودا ئەکەوێو ئیمانو بڕوای تازە ئەبێتەوە •

کێ ئەڵێ مـارە کردنی دایکی‌یوسفو بنیامینی برای لـــە لایەن یەعقووب پێغەمبەرەوە ڕووداوێـکی خۆیی «شەخصی» نەبووە، بەڵـــکو تەقدیرێـکی خوایی بووە، بۆ ئەوەی برا باوکی‌یەکانی یوسف حەسەدی پێ بەرنو قینی لێ‌هەڵگرن، وە بە مناڵی بیبەنو بیخەنە ناو بیرێـکەوە تا کاروان دەری بێنێو لە میسر بیفرۆشێ ، تا لە ماڵی عەزیزی میسرا گەورە ببێو، ژنی عەزیزی میسر حەزی لێ بـکاتو، بانـگی بکات بۆ ژووری

---

(١) واتە : خوا هەموو شتێکی دروست کردووەو ئەندازەی بۆ دانـاوە بەئەندازە دانان •

نووستنی خۆی ، بۆ کارێکی ناشیرینی بێشەرعیو، ئەویش مل نەدا تاژنی عەزیز ڕقی لێی هەستێو بیخاتە زیندانەوە، وە ساڵەهای ساڵ تیا بمێنێتەوە، بۆچی ؟ تا لەو زیندانەدا لەگەڵ دوو پیاوەکەی پاشای میسردا کۆببێتەوەو، تەعبیری خەوەکانیان بۆلێك بداتەوە ... بۆچی ؟ تائێرە هیچ وەڵامێك نییە، وە کەس نازانێ ئەمە بۆچییە، هەرکەس ئەم داستانە بخوێنێتەوە ئەڵێ خوایە ! ئەمە بۆچ؟ بۆچی یوسف تووشی ئەم سزایە ببێ؟، خوایە! پێغەمبەرێکی وەك یەعقووب بۆ تووشی ئەم ئازارو خەمو خەفەتە ببێ ، بۆچی ئەم پێغەمبەرە لە وون بوونی حەزرەتی یوسفو، دوور کەوتنەوەی هەردوو چاوی کوێر بێو سپی هەڵبگەڕێن؟ وە بۆچی یوسفێکی پاکی بێگوناه ئەم هەموو دەردی سەرییەببینێ ؟، بۆچی؟، یەکەم جار، وە لە دوای (٢٧) ساڵ جوابێك دەرئەچێ کە قەدەری خوا بەم (٢٧) ساڵە یوسفی ئامادە کرد بۆ ئەوەی ببێ بە گەورەی میسرو گەلانی دراوسێی میسر لە حەوت ساڵی گرانیو بێ بارانیدا ، لە پاشا چی ؟ لە پاشا تابنێرێ بە شوێن دایكو باوكو براکانیا ، وە هەموو لە میسر کۆببنەوە، وە لە وچەو نەوەی ئەمانە گەلی ئیسرائیل کۆ ببێتەوە، وە تاکاتی مووسا بە شەشسەد هەزار کەس، وەفیرعەون لە خاکیمیسر دەریان بکات، وە مووسا پێغەمبەر لە ناویانا گەورە ببێ، وەساڵەهای ساڵ لە گەڵیانا خەریك بێ، وە تقدیرو تەدبیری خوا ئیش بکات تا لە دوایدا بە سەرهاتو ڕووداوانو شتی زۆر گرنگی وا پەیدا ببێ کە ئەمرۆ عالەم بە هەموو هۆشو بیرێکییەوە تیا خەریك بمێنێ ، وە کار بکاتە سەر ڕێگای ژیانی جیهانیان .

کێ ئەڵێ مارەکردنی «هاجـەر»ی میسری لـە لایەن ئیبراهیم پێغەمبەری باپیری یەعقووبەوە ڕووداوێـکی خۆیی نەبووە، وە ئـەوی ڕووی داوە لـە ژیانی ئیبراهیما بووبە هۆی ئەوەی کە ئیبراهیم نیشتمانی خۆی ( کەعیراقە ) بەجێ بێڵێ، وە بە میسردا تێپەڕ بێ تا هاجەر مـارە بـکاتو ئیسماعیلی لێ ببێ، وە ئیسماعیلو هاجـەری دایـکی لەتەنشت کەعبـەوە دابنێ تا لە پاش هەزاران سـاڵ حەزرەتی محمد ( دروودی خوای لێ بێ ) لە جەزیرەی عەرەب ـ کە باشترین شوێنە لـە هەموو ڕووی زەویدا بۆ ئاینی ئیسلام ـ لە پشتی حەزرەتی ئیبراهیم بکەوێتەوە، تا لە پاشە ڕۆژدا ئەو ڕووداوە گەورە گرنـگە ڕوو بدات لـە مێژووی ئادەمیـدا •

ئەمە تەقـدیری خوایە لە پشت سەری هەودایەکی دوورەوە بـۆ هـەموو شتێك کـە پەیدا ببێ •

هێندێ جـار ئادەمی سەری هەودا نزیکەکە ئەبینێ، بەڵام سـەری هەودا دوورەکە نابینێ ، هێندێ جـار زمان درێژ ئەبێتەوە لـە نـاوەندی سەرەتاو دوایی‌یەکەیا وە بەم بۆنەیەوە حیکمەتی تەقـدیر وون ئەبێ، ئەوکاتە پەلە پەل ئەکەینو هێندێ جاریش تووڕە ئەبینو زمان درێژی ئەکەین خوای گەورە لەم قورئانەدا تێمان ئەگەیەنێ کە هەموو شتێك بە قەدەرو بە ئەندازەیە، تا هەموو کارێك حەواڵە بە خوابکەین، ئەو کـاتە دڵنیا ئەبین، وە لەگەڵ قەد ردا پێ بە پێ ئەڕۆین بەڕێكو پێکی •

دوای ئەوەی باسی دروست کردنی هەموو شتێکی کرد بە ئەندازە،

وَمَا أَمْرُنَا إِلَّا وَاحِدَةٌ كَلَمْحٍ بِالْبَصَرِ (٥٠)
وَلَقَدْ أَهْلَكْنَا أَشْيَاعَكُمْ فَهَلْ مِنْ مُدَّكِرٍ (٥١) وَكُلُّ شَيْءٍ فَعَلُوهُ فِي الزُّبُرِ (٥٢)

---

وە فەرمانی ئێمە هەر یەكجارە وەك چاو تروكاندنێك (٥٠)
وە بە بێ‌گومان ئێمە زۆر لە پێشینانی بێ‌بڕوای وەك ئێوەمان لە ناو بردووە، ئنجا ئاخۆ پەند وەرگرێك بێ؟ (٥١) وە هەر چێكیان كردبێ لە نامەی كرداریانا هەیە (٥٢)

---

ئنجا باسی ئاسانی ئەو دروست كردنە ئەكاتو ئەفەرموێ : ( وما امرنا الا واحدة كلمح بالبصر ) وە فەرمانی ئێمە لە جیهانا هەر یەكجارە لەگەڵ ووترا : ببە، خێـــرا ئەبێ لەچاوتروكانێكا، بە ووتەیەكی خوا ئـــەم بووەنەوەرە گەورە هاتۆتە ڕوو، وە بە ووتەیەك هەمووی ئەپێچرێتەوە ، بە ووتەیەك هەرچی زیندوو هەیە پەیدا ئەبن، بەووتەیەك هەموو ئەمرنو، بەووتەیەك هەمووزیندوو ئەبنەوە، بەووتەیەك هەموو كۆئەبنەوە •

هەروا بەووتەیەك گەلانێك كە بڕوا بە فەرموودەی خواو پێغەمبەر نەهێنن لـــە ناو ئەبرێن وەكو ئەفەرموێ : ( ولقـد اهلكنا اشیاعكم ) بەڕاستی ئەوانـەی كە وەك ئێـوە بـوون لـە پێشینـانو ، بڕوایـان بـە پێغەمبەرەكان نەهێناوە هەموویانمان لە ناو بردوون ، ئەی گەلی قورەیش هەر یەكەی بە جۆرێك وەك لە زنجیرەكانی پێشوودا باس كران ( فهـل من مدكر) ئنجا كێ‌بێ پەند وەربگرێ •

ئنجا باسی ئەوە ئەكات كە هەموو كردەوەیـەكی هـاوبەش پەیـدا كەرانو بێ‌بڕوایان تۆمار كراوە لە سەریان ، ئەفەرموێ (وكل شيء فعلوه في الزبر) •

وَكُلُّ صَغِيرٍ وَكَبِيرٍ مُسْتَطَرٌ (٥٣) إِنَّ الْمُتَّقِينَ فِي جَنَّاتٍ وَنَهَرٍ (٥٤) فِي مَقْعَدِ صِدْقٍ عِندَ مَلِيكٍ مُقْتَدِرٍ (٥٥)

---

وە هەموو کردەوەیەکیان گەورە یا بچووك نووسراوە (٥٣) •

بێگومان پارێزگاران لە باخاتو ( کەناری ) سەرچاوەکانی ( بەهەشتا ئەبن ) (٥٤) لە شوێنی پەسەندکراوی بەڕاستیدا ئەبن ، لای پاشای بەدەسەلاتی توانا (٥٥)

---

هەرشتێکیان کردبێ لە نامەی کرداریانا جێگیرە ( وكل صغير وكبير مستطر)وە هەموو کردەویەکیان گەورە یا بچووك نووسراوە •

★ ★ ★

دوای باسی سزای بێبڕوایان ، ئنجا باسی خۆشیی پارێزگاران ئەکات لە ڕۆژی دوایدا ئەفەرموێ (ان المتقين في جنات ونهر) بێگومان پارێزگاران لە باخاتی بەهەشتا ئەبن ، وە لە کەناری کانیو کارێزو جۆگەو چەمو ڕووباری بەهەشتا دائەنیشن ، چونکە لە دنیادا لە خوا ترساوون ، وە لە ترسی خوا کاری خراپیان نەکردووە ، وە خوا دوو ترس لەدڵێکدا کۆ ناکاتەوە ؛ ترس لە خوا لە دنیاداو ترس لە خوا لە قیامەتدا ، ئنجا هەرکەسێك لە خواترسا لە دنیادا ، لە ڕۆژی دوایدا دڵنیا ئەبێ •

لە دوای باسی خۆشیی هەستو ئەندام ئنجا باسی خۆشیی دڵو گیان ئەکات ئەفەرموێ (في مقعد صدق) لەشوێنی پەسەندکراوی هەڵبژێرراوی بەڕاستیدا ئەبن (عند مليك مقتدر) لای پاشای بە دەسەلاتی توانا بە سەر هەموو شتێکا بێخەمو بێخەفەتو ترسو ، بە دڵنیاییەوە •

# سورة الرحمن

## بسم الله الرحمن الرحيم

اَلرَّحْمٰنُ (١) عَلَّمَ القُرآنَ (٢)

## سوورەی (رەحمان)ە

## مەککی یە، (٧٨) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

خوای بەخشندە (١) قورئانی فێر (ی پێغەمبەر ) کرد (٢)



## سوورەی (رەحمان)ە

## مەککی یە، (٧٨) ئایەتە



**بسم الله الرحمن الرحيم**



**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**



مەبەست لەم سوورەتە باسی ئەو نیعمەتانی خوایی‌یەیە ئەکا کە داوێتی بە بەندەگانی خۆی لە دین‌و دنیادا ، جا لە بەر ئەوەی کە گەورەترینیان فێر بوونی قورئان‌و زانینێتی بۆیە پێش هەموو نیعمەتەکانی‌تری خست‌و فەرمووی « الرحمن علم القرآن » •

پێغەمبەر هەرچەند ئایەتێکی قورئانی بەسرووش بۆ بهاتایە بێ‌بڕواکانی مەککە ئەیانووت : « انما يعلمه بشر » واتە ئەوی ئەم قورئانە بۆ محمد ئەهێنێ‌و بە دەرس پێی ئەڵێ ئادەمی‌یە ، وە سرووشی خوانی‌یە ، ئنجا بۆ ئەوەی ئەم قسەیە بباتە دواوە ئەفەرموێ : ( الرحمن ، علم القران ) خوای بەخشندەی میهرەبان قورئانی فێری پێغەمبەر کردو

خَلَقَ ٱلْإِنسانَ (٣) عَلَّمَهُ ٱلْبَيانَ (٤) ٱلشَّمْسُ وَٱلْقَمَرُ بِحُسْبانٍ (٥)

ئادەمی دروستکرد (٣) فێری قسە کردنی کرد (٤) ڕۆژو مانگ بە حسابن (٥)

بە سرووش بۆی نارد ، تا ئەمیش فێری مسڵمانانی بکات ، وە ئەوانیش بیخوێنن‌و لە بەری بکەن‌و ، بەهرەی لێ وەربگرن لە پەندو ئامۆژگاری‌و چیرۆك‌و داستانی‌و ، ڕەوشت‌و خووی‌و ، دەستوورو ئادابی‌و ، یاساو ئەحکامی‌و بیرو باوەڕی •

لە دوای باسی نیعمەتی قورئان ، ئنجا منەت ئەنێ بە نیعمەتی دروست کردنی ئادەمی ، کە ئەم دروست کردنە سەر چاوەی هەموو شتێکە فەرمووی :

( خلق الانسان • علمه البیان ) ئادەمی دروستکرد بەم هەموو جوان‌و ڕێك‌و پێکی‌یە ، وە بەم هەموو زیرەکی‌و وورایی‌و ئامادەیی‌یە ، وە فێری لێکدانەوەی کرد لە هەرچی کە بە دڵیابێ ، ئادەمی بەم قسەو گفت‌وگۆیە لە هەموو گیان لەبەرێك جیا بۆتەوە •

ئێمە ئادەمی ئەبینین قسە ئەکات‌و هەرچی بە دڵیا بێ تەعبیری لێ ئەداتەوە ، وە لەگەڵ ئەم‌و ئەودا قسە ئەکات‌و قسە وەرئەگرێ ، وە ئەمانە لە منالی‌یەوە خوویان پێوە گرتووە ، بۆیە ئەم بەخششە گەورەیەی لە بیر چۆتەوە ، ئنجا قورئان ناو بە ناو بیرمان ئەخاتەوە لە زۆر شوێنا •

★ ★ ★

ئنجا باسی نیعمەتانی خوا ئەکات لە پێشانگای بوونەوەری تێکڕایی‌دا ئەفەرموێ « الشمس والقمر بحسبان » ڕۆژو مانگ بە حسابێکی زۆر

ووردو قووڵو ڕێكو پێـك دێنو ئەچن ، وە بە هۆی ئەم هـاتو چۆیەوە شەوو ڕۆژو هاوینو زستانو پایزو بەهار دێنو دەڕۆن ، وە مەردوم لـە حسابی ڕۆژو مانگو ساڵ ئەگەن ، وە ئیشو کاریان بە ڕێـكو پێـكی ئەڕوات •

ڕۆژ ٩٢٫٥٠٠٫٠٠٠ میـل دوورە لـــە زەوی‌یـــەوە ، تـەوەرە «قطر»ەکەی ٨٦٤٠٠٠ میلە • ئەو گەرمی‌یەی کە لە ڕۆژەوە ئەمـان گاتێ بلەیەکە لـە دوو ملیـۆن پلـەی گـەرمی ڕۆژ • قەبـارەی ڕۆژو پلـەی گەرمایی‌و ، دووری لێمانەوە هەمووی بە حسابە ، حسابێکی زۆر زۆر ووردو قووڵ ، واتە ئەم قەبارەیەی ، وە ئەم دووری‌یەی لە زەوی‌یەوە، وە ئەم پلە گەرمی‌یەی ڕێك «موافق»ی ژیـانە لە سـەر زەوی ، ئـەگەر قەبارەکەی گەورەتر بووایە ، یا پـلەی گەرمی‌یەکەی زیاتر بووایـە ، یان دووری‌یەکەی لە زەوی کەمتر بووایە ، هەرچی ئـاوی دەریـاکان هەیە هەمووی ئەبوو بە هەڵمو ئەچوو بە ئاسمانا ، وە هەرچی لە سـەر زەوی بوو ئەسووتا ، وە ئەگەر قەبارەکەی بچووکتر بووایە ، یا پلـەی گەرمی‌یەکەی کەمتر بووایە ، یا دووری‌یەکەی زۆرتر بووایە ، ئەو کاتە هەرچی لە سەر زەوی بوو ئەی‌بەستو ئەبوو بە سەهۆڵ •

مانگ ٢٣٩٠٠٠ میل لە زەوی‌یەوە دوورە ، تەوەرەی مانگ لـە ٢١٦٠ میل تێ‌ئاپەڕێ • قەبارەی مانگو دووریی لە زەوی‌یەوە ڕێـکی ژیانە لە سەر زەوی ، واتە ئەگەر قەبارەکەی گەورەتـر بووایـە ، یـا دووری‌یەکەی کەمتر بووایە ئەو سەرکەوتن « مد »ەی کە پەیدای ئەکرد لە دەریاکاندا بەس بوو بۆ داپۆشینی هەموو زەوی تەوەرەی ڕۆژ (٤٠٠)

وَالنَّجْمُ وَالشَّجَرُ يَسْجُدَانِ (٦) وَالسَّمَاءَ رَفَعَهَا

گیاو درەخت فەرمانبەریی ( خـوا ) ئەکـەن (٦) ئاسـمانی بەرز کردۆتـەوە

ئەوەندەی تەوەرەی مانگە • دووری ڕۆژ لە زەوی‌یەوە «٤٠٠» ئەوەندەی دووریی مانگە ، لە بەر ئەوە قەبارەی مانگ‌و ڕۆژ لە زەوی‌یەوە بە قـەد یەکن لە بینینـا •

هێـــزی کێشندەی ڕۆژو مانـگ بۆ ڕاگرتنی زەوی نرخێـــکی ئێجگار زۆریان هـــەیە لـە چۆنێتی کوورەی ئەرزا ، واتە لە ڕاگرتنیا لە کاتی ڕۆینیا هەنـگاو بە هەنـگاو لەم ئاسمانە کاکی بە کاکی‌یەدا ، ئـەو ئاسمانەی کـە کۆمەڵەی ڕۆژی ئێمەی تیا ئەڕوات بە تیژی بیست هەزار میل لە سەعاتێکدا ڕوو بە ڕووی « برجی جبار » لـە گـەڵ ئەمیشـــە بە ملیۆن ساڵ بە هیچ ئەستێرەیەکی‌ترا هەڵناتەقێن •

لـەم ئاسمانە کاکی بـــە کاکی‌یەدا هیچ ئەستێرەیەك بە قـــەد موویەك لانادات، وە پاش‌و پێش ناکەوێ •

دوای ئەوەی کە فەرمووی ڕۆژو مانـگ لە ژێر فەرمانی خوادان، وە بە حسابێکی زۆر ورد هاتو چۆ ئەکەن • ئنجا باسی فەرمانبەریی ئـەرز ئەکات ( والنجم والشجر یسجدان )گیـــاو دارو درەخت فەرمانبەریی خوا ئەکـەن بە سرووشت، هـەر وەك ئادەمیی ژیر فەرمانبەریی ئەکـات بە ئارەزووی خۆی • ( والسماء رفعها )ئەم ئاسمانە کاکی بـە کاکی‌یەی بەرز کردۆتەوە بە هـەزار ملیۆن کاکەشانەوە، وە هەر کاکەشانێکیش

وَوَضَعَ المِيزانَ (٧) أَلاَّ تَطْغَوْا فِي المِيزانِ (٨) وَأَقِيموا الوزن بالقِسط ولا تُخسِروا الميزان (٩)

وەترازوو (ی دادی) لە جیهانا دانـاوە (٧) (وە فەرمـانی داوەکە) هەرگیز دەستدرێژی لە ترازوودا نەکەن (٨)وە هەمـوو شـتێك بـە ترازووی داد بکێشن ، وە کەمتان نەبێ لە ترازوودا (٩)

بە سەدها ملیۆن ڕۆژو ئەستێرەوە ( ووضع المیزان ) وە تەرازووی دادو عـەدالەتی هەڵواسیوە لـە ناو ئـەم هــەزاران ملیۆونو بلیۆن ڕۆژو ئەستێرانەدا بە ڕەنگێک کـە هیچ ئەستێرەیەك لە چـەمەرەی خۆی لا نادات ، وە هەناسەیەك پێشو دواناکەوێ، وە ترازووی داد لە ناوەندی ئەم ئەستێرانەدا هــەرگیز لاسەنگ نابێ ، واتە هــەموو شتێك لــە گەورەیی‌و بچووکی قەبارەو ، لە دووریی‌و نزیـکی ماوەو، لـــە تین‌و تەوژمی گەرمی ــ بە ئەندازە دانراوە ، وە نابێ لەوە زیاترو کەمتربێ •

ئنجا ئەم ترازووەی کـە لـە ئاسمان هەڵواسراوە لـە ناو ئــەم ئەستێرانەدا بۆ ئەوەیە کـە ببێ بـــە سەرمەشق‌و چـاوی لێ بـکەن ( الا تطغوا فی المیزان ) وە دەست درێژی لە ترازوودا نەکــەن ( واقیموا الوزن بالقسط )وە هەموو شتێك بە ترازووی دادو عەدالەت بکێشن، وە لــە فەرموودەی شـــەرع لانەدەن ( ولا تخسروا المیزان )وە کـــەم‌و کووڕیتان نەبێ لـە ترازوودا وە سەنگتان سووك‌وکێشتان کەم نەبێ •

بە لێ خوا هەروەك تـرازووی دادی هەڵواسییوە لـە ئاسمانـا ،

وَالأَرْضَ وَضَعَهَا لِلأَنامِ (١٠)

وە زەوی بۆ ئـادەمی ڕاخست (١٠)

ترازووی دادیشی داناوە لـە سـەر زەوی وە فەرمانی داوە کـە هـەموو خاوەن حەقێک حـەقی خۆی بە تەواوی بدرێتێ، وە هـەموو کەسێک ئیش‌و کارو کڕین‌و فرۆتن‌و شت گۆڕینەوەی لە سەر بنیاتێکی یەکسانی بێ ، لەم فەرمانەدا کە خوا ئەیدا بە بەنـدەگانی خـۆی کە ترازوویـان لاسەنگ نەبێ لە هیچ شتێکا دەرئەکەوێ کە دادو عەدالەت وڕاسـتی‌و دەست‌پاکی چەنـد پێویستەبۆ خـۆشی‌و خۆش‌بەختیی تـاکو کۆمـەڵ‌و گـەلان ، وە یەکەم ڕووخانی کۆمەڵە لەتێک چوونی‌ترازووەوە دەست پێ ئەکات • لە پاش بەرز کردنەوەی ئاسمان ئینجا باسی دانانی زەوی ئەکات لـــە ژێر پێی ئادەمیی‌و گیان لەبەرانی‌ترا فەرمووی ( والارض وضعها للانام ) زەمینی ڕاخست بۆ قازانجی گیـــان لـەبەران هێندێـکی ووشـکانی‌و هێندێـکی دەریـاو ، هێندێـکی دەشت‌و هێندێـکی شـاخ‌و داخ‌و ، هێندێـکی گەرم‌و هێندێـکی ساردو، هێندێکی قەڵەوو پڕ لـــە پیت، تا هەموو گیان لەبەرێـکی تیا بژی •

ئێمـەی ئادەمی لە بەر ئەوەی کە لە یەکەم ڕۆژەوە خۆمان گرتووە بـەم هیواشی‌و لە سـەرخۆیی زەوی‌یەوە هەست نـاکەین بەم میهرەبانی خوایی‌یە کە چ ئیسراحەتێکی داوینێ ، مەگەر لـە کاتێـکا نـەبێ کـە بوومەلەرزەیەک ڕووبدات، وە ئەم زەوی‌یە هێمن‌و لەســەر خـۆیە بکەوێتە جونبوش‌و پەلە پەل، ئەو کاتە هەموو کەسێک دەرئەپەرێتـــە

دەرەوە لە خانووی گـەرم‌و گوڕو جێگەی نەرم‌و شلی خۆی، ئینجا ئەو دەمە بیرمان ئەکەوێتەوە کە لە چ ئیسراحەتێکدا بووین .

شایستە بوو بۆ ئادەمی لە هیچ کاتێکا ئەم شتە گرنگەی لـــە بیر نەچوایەتەوە ، ئەگـەر تۆزێ بیری لە لای ئەو زەوی‌یەبوایە کە پڕ بـە چـاو لە ســەری ئەنوێ‌و ئیسراحەتی تیا ئەکات، ئەو زەوی‌یەی کـــە ووردیلەیەکە لەم ئاسمانی کاکی بە کاکی‌یەدا، وە بە هەڵەداوان ئەڕوات، وە بە تیژیی هەزار میل لە سەعاتێکدا ئەسووڕێتەوە بە دەوری خـــۆیا ، وە شەست هەزار میل لە سەعاتێکدا ئەسووڕێتەوە بە دەوری ڕۆژا ، وە نـە گـەڵ ڕۆژو هەموو کۆمەڵەی ڕۆژا بە تیژی‌بیست هەزار میل ئەڕوات ڕووەو « برجی جبار » ، ئەگـەر ئاگای لەمانە بوایە، ئەبوو بـکەوتایە بە ڕوودا بەرەو بارەگای خوای گەورە، وە شکرانەی خوای بژاردایە .

ئەگەر بیرێـکی بکردایەتەوە کە وا بە سەر پشتی ئـەم زەوییەوە ئەڕوات بەم تیژیی‌و هەڵەداوانە، وە لەم ئاسمانە کاکی بە کاکی‌یەدا لنگ ئەداو تەراتێن ئەکات بە بێ پاڵپشت‌و سەنەدگاهێکی خوایی نەبێ ، ئەگەر ئەمـەی لە بیر بوایە، بێ‌گومـان هەمیشە دڵی لە ترسانا لێی ئەدا ، وە چاوو دڵی ئەبڵەق‌و گیـان‌و ئەندامی هەڵ‌ئەلەرزین لە ترسانا ، بـــە هیچ شتێـک دانەئەمرکا بە خوای تاک‌و تەنهای خاوەن دەسەڵات نەبێ کـــە زەوی ڕاخستووە بۆ گیان لەبەران بەم هێواشی‌و لە سەرخۆیی‌یە کـــە ئەڵێی وێستاوەو ناجووڵێت .

بەڕاستی خوا ژیانی ئاسان کردووە بۆ ئادەمی لە ســـەر زەوی وە بێ‌بژێوی بۆ داناوە کە وا لێرەدا یەکەم جار ناوی میوە ئەبات ئەفەرموێ

فِيها فاكِهَةٌ وَالنَّخْلُ ذاتُ الأَكْمامِ (١١) وَالْحَبُّ ذو الْعَصْفِ وَالرَّيْحانُ (١٢)

---

تیایەتی (هەموو جۆرە) میوەو دارخورمای خاوەن پۆرگ (١١) وە دانەوێڵەی خاوەن کاو گیا ، وە ڕەیحانە (١٢)

---

( فیها فاكهة ) هـەیە لەو زەوی‌یەدا میوەهاتی ڕەنگاو ڕەنگ بە ووشکی‌و بە تەڕی ، ئنجا لە ناو میوەهاتا بە تایبەتی ناوی خورما ئەبات چونکە زۆر گرنـگە ، وە ئادەمی بە خورمای ڕووت ئەژی لە کاتێکدا کـە بە گۆشتی ڕووت ناژی ئەفەرموێ ( والنخل ) وە داری خورمـا ( ذات الاكمام ) خاوەنی پۆرگەها، واتە هـەموو دانەیەکی لـە پێشەوە لە پۆرگێکایە ( والحب ) وە هـەموو دانەوێڵەیەك لـە گـەنم‌و جۆوگەڵی شتی‌تر ( ذو العصف ) خاوەنی کاو گیا، کە ئادەمی بە دانەوێڵەکەی‌و ئاژەڵ بـە کـاو پووشەکەی ئەژی •

لە دوای باسی میوەو دانەوێڵە ، ئینجا ناوی ڕێحانە ئەبات کە جگە لەوەی ئادەمی‌و ئاژەڵ ئەیخۆن ، مایەی گەشانەوەی سـەرو مێشـکی ئادەمییشە فەرمووی ( والريحان ) ڕێحانەو هـەموو جـۆرە گوڵێکی بۆن‌خۆشیش لـە زەوی دەرئـەچێ ، واتـە لە زەوی‌دا زۆر نیعمـەتی داونەتێ ، هێندێکیان بۆ خواردن‌و هێندێکیان بۆ بۆن کردن •

لە دوای باسی ئەم هەموو نیعمەتانەی کە کردی، لـە فێرکردنی قورئان‌و درووست کردنی ئـادەمی‌و ، فەقیرکردنی‌و ، ڕێـك‌خستنی

فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (١٣)

به کام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ؟ (١٣)

ڕۆژو مانگ به حسابو ، بەرزکردنەوەی ئاسمانو ، هەڵواسینی دادو ترازوو، و ڕاخستنی زەوی بۆ ئادەمی به خـــۆیو هـــەموو میـوەو، دانەوێڵەو گوڵانی بۆن خۆشی‌یەوە ، ئینجا به ئایەتی سیانزەهەم بانـگ ئەکاتە هـەموو خـــەڵقی به ئادەمیی‌و پەری‌یەوە ئەفەرموێ ( فبأی الاء ربکما تکذبان ) به کـــام نیعمەتی پەروەردگارتان لەم نیعمەتانەی کـــه ڕشتوویەتی به سەرتانا بڕوا ناکەن ؟ واته ئەگەر بڕواتان به نیعمەتەکانی بوایە، بڕواتان بەخۆشی ئەبوو ، وه ئەگـــەر بڕواتان بـــه خۆشی بوایە تەنها عبادەتتان هەر بۆ خۆی ئەکرد ، وه هاوبەشتان بۆ پەیدا نه ئەکرد •

لەم سوورەتەدا (٣١) جـار ئەم ئـایەته ئەوترێتەوە ، چونـکه ئـەم سوورەته هەمووی هەر باسی نیعمەتەکانی خوایە، هەموو جارێک کـــه باسی نیعمەتێک یان زیاتر دەکرێت ئەم ئایەته ئەڵێتەوە تا ئەوانەی دەوری قورئان ئەکەنەوە، یا گوێی لێ ئەگرن بێدار بنەوە له زۆری نیعمەتەکانی خوا ، وەسوپاس‌و ستایشی بکەن •

له سوورەتی «قمر»دا ئایەتی « ولقد یسرنا القرآن للذکر فهل من مدکر » چـەند جارێک ووترایەوە، وه له سوورەی «مرسلات»دا ئایەتی « ویل یومئذ للمکذبین » چەند جارێک ئەووترێتەوە •

ئەم شێوەیه له هەموو زمـانێکدا هەیه که شتێکی گرنگ بێ لـــه

خَلَقَ الانسانَ مِن صَلْصالٍ كَالفَخّارِ (١٤) وخَلَقَ الجانَّ مِنْ مارِجٍ من نار (١٥)

---

ئادەمیی دروست کرد لە گڵێکی ڕەقی وەك سواڵەت (١٤) وە پەریی دروست کرد لە بڵێسەی ئاگرێکی بێدووکەڵ (١٥)

---

ئارادا ، نابینیت زۆر باوك بە کوڕی بێنەزانی خۆی ـ کەزۆری خزمەت کردبێ وە پارەی تیا خەرج کردبێ وە پێی نەزانیبێ ـ ئەڵێ : پێم نەخوێندیت تا خوێندنت تەواو کرد ؟ ئەمەت لە بەرچاو نی‌یە ؟ ئینجا خانووم لە سەر تاپۆ نەکردیت ؟ ئەمەت لە بەرچاو نی‌یە ؟ ئینجا ژنم بۆ نەهێنایت ؟ ئەمەت لە بەرچاو نی‌یە ؟ هەر وا چاکەیەکی خۆی باس ئەکاتو ئەم ڕستەیە ئەڵێتەوە ، چونکە ئەم شێوەیە زۆر بەتینو تەووژمە لە دڵانا .

★ ★ ★

لە دوای منەت‌نان بە سەر ئادەمی‌و پەری‌دا بە نیعمەتانی خوا لە بوونەوەرا ، ئنجا باسی منەتانی ئەکات بە سەریانا بە نیعمەتانی لە خودی خۆیانا، وە لە درووستکردنیانا ئەفەرموێ (خلق‌الانسان) باوکی ئادەمیی دروست کرد کە ئادەمە (من صلصال کالفخار) لە گڵێکی ووشکی ڕەقی وەك سواڵەت کە لەگەڵ شتێکی بەر بکەوێ تەقەی لێوە دێ ( وخلق الجان)وە باوکی پەریی درووستکرد (من مارج من نار) لە زبانەو بڵێسەی ئاگرێکی بێدووکەڵی لە گڕی زەردو سوورو مەیلەو سەوز .

زانینی تازە دۆزیوێتی‌یەوە کە تیشك لە حەوت ڕەنگە تێکەڵە ،

وە «مارج» ئاگرێکی هەڵگیرساوی بزوێنە وەك زبانەی ئـاگرێك کە با لێی بدات ، وە ئاماژەیە بۆ ئەو حەوت ڕەنـگە •

لە باسی دروست کردنی ئادەمی‌دا ، قورئان بە سێ جۆر تەعبیری لێ ئەداتەوە لە سوورەی « ال عمران »دا ئەفەرموێ « ان مثل عیسی عنـد الله کمثل آدم خلقه من تراب »(١) لە سـوورەی «حجر»دا ئەفەرمـوێ «ولقد خلقنا الانسان من صلصال من حمأ مسـنون »(٢) لـە سـوورەی «صافات»دا ئەفەرموێ « انا خلقنـاهم من طین لازب »(٣) لێرەشـا ئـەڵێ «من صلصال کالفخار» ئەمانە هەر یەکێکیان بە ئیعتیبـاری پلەیـەکە لـەو پلانەی کە بە سەر درووست کردنی ئادەما هاتووە لـە کاتی درووسـت کردنیا ، واتە خوا بە دەسەڵاتی خۆی ئادەمیی زیری خاوەن بیری بزوێن «متحرك»ی دروست کرد لە قوڕێکی گەرمی ڕەقی وەك سواڵەت •

ئەمە ئاشکرایە کە زەوی هەشت نۆ هەزار ملیۆن سـاڵ لە مەپێش پچڕاوەو جیا بۆتەوە ، وە هەزاران هەزار ساڵ ئەم زەوییە وەك ئێستای ڕۆژ لەم ئاسمانەدا گڕاوەو کڵپەو بڵێسەی کردووە ، بە هەزاران سـاڵ بارانی بە سەرا باریوە ، بەڵام بارانەکە نەگەیشتۆتە سەرزەوی ، بەڵـکو هەر لە ئاسمانا بۆتەوە بە هەڵمو چۆتەوە بە ئاسمانا ، تـا لـە پاشـا زەوی کەمێك سارد بۆتەوە ، وە ئەو بارانە گەیشتۆتە سەری ، وە هەزاران ساڵ

(١) بە ڕاستی داستانی عیسا لای خـوا وەك داستانی ئادەمە کـە دروستی کرد لە خاك •

(٢) بێگومان ئێمە ئادەمی‌یەکمان دروست کرد لە گڵێکی ووشـکی ڕەشی بۆگەنی تێکچوو •

(٣) بەڕاستی ئێمە ئادەمی‌مان دروست کرد لە قوڕێکی لینجی جیڕ •

فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (١٦)

بەکام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (١٦)

بارانی لێزمەو بە خوڕی بە سەرا باریوە ، تـا بـەرە بـەرە زەوی سـارد بۆتەوە ، وە چڵە چڵە گیای لێ ڕوواوە ، ئنجا گیان لەبەرانی لە سـەر پەیدا بووە ، کە یەکێکیان ئادەمیی‌یە ، ئەم ئـادەمی‌یە لـە دەوری سـارد بوونەوەی زەوی‌دا لە خاکەکەی دروست بووە ، کە ئەمڕۆ زانینی تـازە پشت‌گیری ئەکات ، ئنجا وەك قورئان ئەفەرموێ پـەریش لـە زبـانەی ئاگرەکەی دروست بووە لە کاتێکا کە زەوی لەدەوری گڕانا بووە •

نابینیت بە چاوی خۆت کارێزێك لێ ئەدەیت ، وە چل پەنجا مـەتر ئەڕۆیت دڵۆپ دڵۆپ ئاوی لێ پەیدا ئەبێ ، کە گەیشتە گومانەی کارێزەکە لە هەموو لایەکەوە دڵۆپ دڵۆپ ئاو ئەکەوێتـە خـوارەوە ، وە لـەدەمی کارێزەکەدا ئەبێ بە ئاشگێڕێك ئاو ، لە پاش چەند مانگێك ماسیی لێ پەید ئەبێ ، ئەم ماسی‌یانە لە کوێوە هـاتن‌و چۆن درووسـت بوون ؟ کـەس لەمە سەرسام نابێ ، چونـکە بە چـاو دیویێتی‌و لە گەڵی ڕاهاتووە • یا ئە تەوەرە «قطب»ەکانی لای خواروو سەرووی زەویی هەزاران هەزار سانە بەفر کەوتووە بەسەریەکا ، لە ناو ئەو بەفـرەدا کرم هەڵـدێ ، کرمی درێژی گەورەی سپی ، ئەمانە چونکە بە چاو ئەیانبینین بەشتێکی ئاسایی ئەزانیین، بەڵام پەری‌یەکە چونکە نای‌بینیین تیا دوو دڵیین (فبأي‌ئالاءربکـ تکذبان) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (ئەی ئادەمیی‌و پەری)•

★ ★ ★

رَبُّ الْمَشْرِقَيْنِ وَرَبُّ الْمَغْرِبَيْنِ (١٧) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (١٨)

ئەو خوایەی کەدروستکەری دوو رۆژهەڵاتو دوو ڕۆژئاوایە (١٧) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕواناکەن (١٨)

(رب المشرقين ورب المغربين) خوا پەروەردگاری دوو ڕۆژهەڵاتو دوو ڕۆژئاوایە ، واتە لە شەش مانگەی بەهارو هاوینا ڕۆژ لە ژوور هێڵی یەکسان (خط الاستواء)ە وە هەڵدێ وە ڕۆژگار درێژ ئەبێ ، وە لە شەش مانگەی پایزو زستانا ڕۆژ لە خوار هێڵیﻳەکسانەوە هەڵدێ ، وە ڕۆژگار کورت ئەبێ ، بە برینی ئەم دوانزە کەلووە چوار وەرزە پەیدا ئەبێ ، هەروەك چۆنێتی سەرماو ، هەورو بارانو ، دارو درەختو گژوگیاو ، ئاو ئەگۆڕێ کە ئەمانە هەمووی بۆ قازانجی ئادەمیو گیانلەبەرانە ، ئەگەر ئەم چوار وەرزە نەبووایە ژیان نەئەبوو ، کە وابوو (فبأي آلاء ربكما تكذبان ) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ئەی ئادەمیو پەریی .

★ ★ ★

لە دوای ئەوەی باسی ئەو نیعمەتانەی کرد کە دائەڕژێن بە سەر بەندەگانی خوادا لە وشکانییەوە ، ئینجا باسی نیعمەتانێ ئەکات کە بە سەریانا دائەبارێ لە دەریاوە ، ئەفەرموێ « مرج البحرين يلتقيان » .

هەر وەك خوا هێزی کێشندەی ڕامی ئادەمیی کردووە ، وە هەرچی ڕووباری سەر زەوی هەیە هەمووی بە هێواشیو لە سەر خۆی ئەڕژێتە ناو دەریاکانەوە ، هەروا دەریاکانیشی ڕامی ئادەمیی کردووە ، وە بەهێزی

کێشندە مەهاری کردوون‌و نایەڵێ یاخی ببن ، بەم ڕەنگە بە هۆی بـای بەهێزو سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆیاو بەدەوری ڕۆژا ، ئـاوی دەریاکان بێ بەسەر زەویداو دایپۆشێ ، چونـکە هەرچەنـد بیـەوێ سەر رێژبکات ، خوای گەورە بە لغاوی هێزی کیشندە مەهاری ئـەکات، وە لە بنکی دەریاکانەوە ـ کە نزیـکترین شـوێنن بـە چـەقی‌زەوی ـ باشەوپاش ئەو ئاوە ئەگێرێتەوە بۆ شوێنی خۆی ، ئەگینا ئەو شەپۆلانەی کە پەیتا پەیتا لە ناوەڕاستی دەریاکانەوە دێن ڕووەو قەراغ ، و دەم بـە دەم گەورەترو بەهێزتر ئەبن ، ئەگەر هێزی کێشندە نەی‌گێڕایەتە دواوە بۆ چەقی زەوی ، هەموو ووشکانی دائەپۆشی بە شاخە بەرزەکانەوە •

بێ‌گومان خوای گەورە منەتی ناوە بە سەر ئاد میی‌دا بـەم مەهـار کردنی دەریایانەو چەم‌و ڕووبارانە ، نە دەریاو چەمەکان تێکەڵ ئـەبن ، بەم ڕەنگە دەریا بێ بە سەر چەم‌و ڕووبارەکاناو دایان‌پۆشیی ، وەك لـە سوورەی «فرقان»دا ئەفەرموێ «هو الذي مرج البحرين ، هذا عذب فرات وهذا ملح اجاج ، وجعل بينهما برزخا وحجرا محجورا » •

واتە خوا ئەو خوایەیە کە دوو دەریا لە تەنشت یـەکەوە شـەپۆل ئەدەن ڕووەو یەکتری ، کە ئەمیان شیریـن‌و خـۆش‌و ئەویـان تـاڵ‌و سوێرە ، وەگیراوێتی لە ناوەندیانا دیوارێك‌و سنوورێکی جێگیر «ثابت» ( وەك بەرزایی کەناری دەریاکان بێ •

مەبەس لەم دوو دەریایە ، دەریای سوێرو شیرینە ، سوێرەکەی دەریاکان‌و شیرینەکەی چەم‌و ڕووبار کانە •

مەبەس لە بەرزەخ ئەو بەرزایی‌یەیە کە لە نـاوەندی دەریـــاو

ووشکانی‌دا هەیە ، ئەو ووشکانی‌یەی کە چەمو ڕووبارەکانی پیا ئەڕۆن ٠ مەبەس لە (حجرا محجورا) هێزی کێشندەیە ، لەلایەکەوە لە ناوەندی دەریاو چەقی زەویدا ، کە دەریای لە شوێنی خۆی ڕاگرتووە ، لە لایەکی‌ترەوە دووریی مانگە لە زەوی کە ئەگەر نزیکتر بوایە هاتنو کشانەوە « مد وجزر »ی دەریاکان زۆرترو بە هێزتر ئەبوو ، وە هەموو سەرزەویی دائەپۆشیی ٠

لە بەر ئەوەی کە نیعمەتی دەریا زۆر گرنگە ، چونکە ئەگەر دەریا سەرڕێژ بکات بە سەر ووشکانی‌دا هەرچی نیعمەتی ووشکانی هەیە هەمووی دائەپۆشی ، جاری دووهەم هات بە شێوەیەکی‌تر ئەم باسەی دایەوە بە گوێچکەی ئادەمی‌داو فەرمووێ :

« ام من جعل الارض قرارا ، وجعل خلالها انهارا ، وجعل لها رواسی ، وجعل بین البحرین حاجزا ؟ أ أله مع الله ؟ بل اکثرهم لا یعلمون » (١) ٠

ئینجا کە وابوو نیعمەتانی دەریا لە نیعمەتانی ووشکانی کەمتر نەبوو،

(١) واتە ئایا کێ زەویی گیراوە بە ئارامگا ، وە لە ناویا چەمو ڕووبارەهای ڕەوان کردووە ، وە کیۆەکانی بەرز کردۆتەوە ، وەلەناوەندی دوو دەریادا بەرهەڵستی داناوە ، ئایا لەگەڵ خوادا خوایەکی‌تر هەیە کە ئەمانە بکات، بەڵکو بەشی زۆری (بێبڕوایان) نازانن‌و ئاگایان لەم موعجیزە عیلمی‌یانە نی‌یە ٠

مَرَجَ الْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ (١٩) بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَا يَبْغِيَانِ (٢٠) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ (٢١)

---

دوو دەریای نارد کە بە یەك بگەن (۱۹) لە ناوەندیانا بەرزاییەك هەیە تا دەست درێژی بۆ یەك نەکەن (۲۰) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ؟ (۲۱)

---

وەکو ئەفەرموێ (مرج البحرين يلتقيان) دوو دەریای نارد ، یەکێکیان تاڵو ئەویتریان شیرین تا بەیەك بگەن ، بەڵام بە سەر یەکا تێنەپەڕن ( بينهما برزخ لا يبغيان ) لە ناوەندی ئەم دوو دەریایەدا بەرزییەك هەیە تاهیچیان بە سەر هیچیانا سەرڕێژ نەکەن ، نە تاڵ بە سەر شیرینا بڕواو تاڵی بکاتو نە شیرین بە سەر تاڵا بڕواو شیرینی بکات ، چونکە تاڵەکەشو شیرینەکەش پێوستن بۆ ژیان ، بەم ڕەنگە ئەگەر تاڵەکە زاڵ بێ ئاوی خواردنەوەمان دەست ناکەوێ نە بۆخۆمانو نە بۆ ئاژەڵو دەغڵو دانو باخاتو لەوەڕمان ، ئەو کاتە لە برسانا ئەمرین ، وە ئەگەر شیرینەکە زاڵ بێ بە سەر تاڵەکەدا ئەوکاتە شتێکی وا نابێ کە هەوای سەر زەوی پاك بکاتەوە لە میکرۆبی خراپو دەرداوی ( فبأي آلاء ربكما تكذبان ) بەکام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ئەی ئادەمیو پەری ؟

خوای گەورە ڕووی زەویی دابەش کردووە بەچوار بەش ، سێ بەشی ئاوی تاڵو بەشێکی ووشکانی ، ئەم بەشە زۆرە لە ئاوی تاڵ هەمیشە بوونی پێویستە بە بێ زیادو کەم ، بۆ پاك کردنەوەی هەوای سەر زەویو ئاگاداری کردنی بە جۆرێك کە بشێ بۆ ژیان .

يَخْرُجُ مِنْهُمَا اللُّؤْلُؤُ وَالْمَرْجَانُ (٢٢)

دەرئەچێ لەو دوو دەریایە مرواریو شیلان (٢٢)

بەڵێ هەرچەند هەرچی جۆرە گازێك هەیە بە درێژایی ساڵ هەمووی لە زەوییەوە بڵاو ئەبێتەوە کە بەشی زۆری کوشندەیە ، بەڵام هەوای سەرزەوی پاکە بێ ئەوەی پیس بێ بەو گازە ، وە بێ ئەوەی ڕێژەکەی بگۆڕێ ، ئەو ڕێژەیەی کە پێوستە بۆ ژیانی ئادەمیی ، وە مایەی ڕاگرتنی ئەو هاوسەنگی «موازنە»یەش ئەو ئاوە سوێرەیە کە سێ ئەوەندەی هەموو ووشکانییە •

هەرچی هەڵم هەیە لەم ئاوە سوێرە زۆرە هەڵ ئەستێ بە هۆی تینی ڕۆژەوە ، وە هەر ئەو هەڵمەیە کە بە باران دێتە خوارەوە • وە هەرچی ئاوی شیرین هەیە لەو بارانە پەیدا ئەبێ ، کە بەشی زۆری چەمو ڕووبارەکانە ، وە لە سەر ئەو ئاوە شیرینە وێستاوە ژیانی هەرچی گیاو گیانلەبەرانو ئادەمیی هەیە ، وە بگرە هەرچی ئاوی چەمو ڕووبارەکان هەیە هەمووی ئەڕژێتەوە ناو دەریاکان ، وە سوێریی زەوی ئەشواتەوەو لەگەڵ خۆیا ئەیبا بۆ ناو دەریاکان ، بێ ئەوەی سروشتی دەریاکان تێك بداتو زاڵ بێ بە سەریانا •

ئنجا منەتێکی ترمان بە سەرا ئەنێ بە نیعمەتی دەریا ئەفەرموی (یخرج منهما اللولوء والمرجان) دەرئەچێ ــ لەو دوو دەریایە کە یەکێکیان سوێرو ئەوی تریان شیرینە ــ مرواریو شیلان •

فَبِـأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (٢٣) وَلَـهُ الْجَوارِ الْمُنْشَئاتُ فِي الْبَحْرِ كَالْأَعْلامِ (٢٤)

بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (٢٣) وە بۆ خوایـە ئەو کەشتی یە گەورە دروسـت کراوانـەی کە وەك کـێو چـوون بـە ئاسمانا (٢٤)

زانایان ئەڵێن لۆلۆ و مەرجان لە شوێنێکا بە زۆری ئەبێ کە ئـاوی شیرین بڕژێتە ناو دەریاوە ، ئەو کاتە لە ئاوە شیرینەکە وەك موتوربـەی ئاوی سوێرەکە بکات وایە بۆیە ئەفـەرموێ «منهمـا» وەك لـە نۆکەنـد « خلیج »ی « بصره »و « عمان » لە دەریای هیندی •

بە ڕاستی دەرهێنانی لۆلۆو مەرجان لـەم دەریایـانە گەورەتـرین دەسکەوتە بۆ ئەوانەی کە دەری ئەهێنن ، و ملوانکەی زۆر بە نرخی لێ دروست ئەکەن ، لە بەر ئەوەی کە ئەمەش نیعمەتێکی زۆر گەورەو بـە نرخە بۆیە ئەفەرموێ : ز فبأي آلاء ربكما تكذبان ) •

ئنجا منەتێکی ترمان بە سەرا ئەنێ بە نیعمەتێـك لـە نیعمەتـەکانی دەریا ئەفەرموی : ( فبأي الاء ربكما تكذبان ) •

ئنجا منەتێکی ترمان بە سەرا ئەنێ بە نیعمەتێك لە نیعمەتەکانی تری دەریا ئەفەرموێ : ( وله الجوار المنشآت في البحر كالاعلام ) وە بۆ خوایە ئەو کەشتی یە گەورە دروست کراوانەی کە وەك کێو چوون بە ئاسمانا ، وە هاتوچۆ ئەکەن لە دەریادا بۆ قازانجو سوودی ئادەمیی ، وە هەمـوو

فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ ( ٢٥ ) كُلُّ مَنْ عَلَيْها فانٍ ( ٢٦ )

بەکام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (٢٥) هەر کەسێك لە سەرزەوی‌یە هەموو لە ناو ئەچن (٢٦)

ڕۆژێ بە سەد ها ملیۆن تەن کووتاڵو خواردەمەنیو پێویستانی مەردوم ئەهێننو ئەبەن ، دوای ئەوەی کە دەستوورێکی ڕێكو پێکی داناوە بۆ قەبارەی قورسو گران لە ناو ئاودا ، واتە هەر خوا ئەم پاپۆرە گەورانە ئەبات بە ڕێگادا ، وە بە سەر ئاوا ئەیانهێنێ وە ئەیانبا بە پێی ئەو دەستوورانەی کە داناوە بۆ ئاوو بۆ قورسایی ناو ئاو ، وە ئەو هێزو توانایی‌یەی داوە بە ئاو کە پاپۆری نیو ملیۆن تەنی هەڵگرێ وەك توێکڵە گوێزێك ، بەڕاستی ئەمەش نیعمەتێکی زۆر گەورەو بە نرخە بۆیە ئەفەرموێ ( فبأي آلاء ربكما تكذبان ) بە کام نیعمەتانی خوا بڕوا ناکەن ؟ بە نیعمەتی کەرەسەی پاپۆرەکە بڕوا ناکەن کە خوا بۆی دروست کردوونو ژێر دەستی خستوون ؟ یا بە دەستووری قورسایی لە ناو ئاوا بڕوا ناکەن ؟ یا بە نیعمەتی ئاوو هێزی ئاو بڕوا ناکەن ؟ واتە ئەگەر خوا ئەم دەستوورانەی دانەنایە بۆتان ، ئەم نیعمەتانەتان دەست نە ئەکەوت ، کە واتە ئەمانە هەمووی هەر لە خواوەیە •

★ ★ ★

دوای ئەوەی باسی نیعمەتانی خوای کرد لە دەریاو لە ووشکانیو لە ئاسمانو لە زەوی‌دا ، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە ئەم نیعمەتانە هیچیان نامێنن ، وە هەموو شتێك ئەچێتەوە پەردەی نەبوون تەنها خوا نەبێ ئەفەرموێ (كل من عليها فان) هەر کەسێك لە سەر زەوی‌یە هەمووی

وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الْجَلَالِ وَالْإِكْرَامِ ( ٢٧ ) فَبِأَيِّ آلَاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ( ٢٨ ) يَسْأَلُهُ مَنْ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ ،

وە ئەوەی تەنها بمێنێ پەروەردگاری تۆیە خاوەنی گەورەیی‌و بەخشش (٢٧) بەکام نیعمەتی پەروەردگارتان بێ‌بڕوان (٢٨) هەر کەسێك لە ئاسمانەکان‌و زەویی‌دایە ( هەموو ) داوا لە خوائەکەن ،

لە ناو ئەچێ‌و نامێنێ (ویبقى وجه ربك)وە بە زیندەو پایەدار ئەمێنێتەوە خودی «ذات»ی پەروەردگاری تۆ (ذو الجلال والاكرام) خوای گەورەی خاوەن بەخشش (فبأي آلاء ربكما تكذبان) بە کام نیعمەتی خوا بڕوا ناکەن ؟

بەڕاستی مردن بۆ کۆمەڵی ئادەمیی نیعمەتێکی گەورەیە، چونکە ئەگەر مردن نەبوایە دوای چەند چینێك زەوی پڕ ئەبوو لە ئادەمیی‌و جێگا نەئەما ، ئەو کاتە هیچ جۆرە خواردنێك بەشی نەئەکرد ، مەگەر ئادەمی ئادەمی بخواردایە •

★ ★ ★

دوای ئایەتی پێشوو کە فەرمووی هەرچی لە سەر زەوی‌یە هەموو گیای مردنن ، وە ئەوی بمێنێتەوە هەر خوایە ، ئینجا باسی ئەوە ئەکات کە هەرچی عالەم هەیە هەموو پێوستن بە یارمەتی‌و دەستگیرۆیی خوا ئەفەرموێ ( يسأله من في السماوات والارض ) هەرکەسێك

كُـــلَّ يَوْمٍ هُـــوَ فِي شَأْنٍ ( ٢٩ ) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكما تُكَذِّبانِ (٣٠)

هەر ڕۆژەی خـوا لە کردنی کارێـکایە (٢٩) بـە کام نیعمـەتی پەروەدگارتان بێبڕوان (٣٠)

لە ئاسمانەکانو زەوییدایە هەمـوو داوای پێویستانی خۆیان ئەکەن لـە خوا نەك لەیەکێکی‌تر ، چونـکە ئەویەکە نەئەمێنیو نەهیچی بەدەستە ، وە ئەویش هـەر داوا لە خوا ئەکات ، ئینجا ئەم داواکردنە بە دەم بێ یا بەزبانی حـــاڵ بێت •

بەکێك کـە دەستی دایە کارێكو هەوڵی بۆ داو خۆی تیا مـــاندوو کرد ، ئەوە مانای داوا کردنە لـە خوا کە لەو کارەدا سـەری بخـاتو بە ئامانجی خۆی بگەیەنێت ( کل یوم هو في شأن ) هەر ڕۆژەی خوا لـە کردنی کارێـکایە ، دەمێ شـەو ئەکات بە ناو ڕۆژاو دەمێ ڕۆژ بـە ناو شـەوا ، دەمێ یەکێك لـە نوێ ئەهێنێتە دنیاوەو یەکێك لـــە دنیـــا دەرئەکات، دەمێ ساغ نەخۆش ئەخاتو دەمێ نەخۆش چاك ئەکاتەوە ، دەمێ هـەژار دەوڵەمەند ئەکاتو دەمێ دەوڵەمەند هەژار ئەکات ، دەمێ بێ نەوا بەرز ئەکاتەوەو دەمێ بەرز بێنەوا ئەکات، دەمێ خەفەتبــــار کەیف خۆش ئەکاتو دەمێ کەیف خۆش خەفەتبار ئەکات •

بەڵێ خــوا تەگبیری هــەموو بوونەوەر ئەکات، ئاگای لە ماسییە لـە دەریاداو، لـەو جانەوەرانە لەبێشەو لانیاناو، لەو مەلانە لـە هێلانەو کولانەیاناو ، لەو مارو مێرووە لـە قەڵەشو کونیانا ، بەڵـکو ئاگای لـــە ئیشو کاری هەموو ئادەمییو پەرییەکە لە ئاسمانو لـە زەویدا ( فبأي آلاء ربکما تکذبان ) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟•

سَنَفْرُغُ لَكُمْ اَيُّهَا اَلثَّقَلانِ (٣١)

خۆمتان بۆئامادە ئەكەم ئەی ئادەمیوپەری (٣١)

★ ★ ★

دوای هەڵژماردنی نیعمەتانی خوا لە ئاسمانو زەوی‌و لـــە دەریاو ووشكانی‌دا ، فەرمووی ئەم نیعمەتانە تا دوایی نامێنن ، بەڵكو هەرچی لە ڕووی ز وی‌دایە هەمووی ئەچێتەوە پەردەی نەبوون ، ئنجا باسی ئـەوە ئەكات كە هەموو كەسێك لە ڕۆژی دوایيدا پاداشی كردەوەی خـۆی ئەدرێتەوە، چاكەی بە چاكەو خراپەی بە خراپە، وە كەس ناتوانێ لـــەو ڕۆژەدا هەڵبێ‌و لـە دەست ســـزای خوا ڕابـكات، وە ئەوانەی كـــە هاوبەش پەیداكەرن، تۆڵەیان ئاگرێ دۆزەخە، ئنجا كـە وابوو خـۆتان ئامادە بـكەن بۆ ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی پەشیمان بنەوە، فەرمووی «سنفرغ لـكم ایها الثقلان »[1] ئەی ئادەمیی‌وپەری خۆمتان بۆ ئەمادە ئەكـەم ،

(١) لە تەفسیری ئەم ئایەتەو ئایەتی «یامعشر الجن٠٠»دا بەشی زۆری تەفسیر نووسەكان ئەڵێن : ئەم ئایەتانە هەڕەشەن لـە ئادەمی‌و لە پەری، كە هیچ كامێكیان ناتوانن لە ڕۆژی دوایی، وە لە كـاتی پرسینەوەو محاسبەدا كە دەور ئەدرێن بە پۆلی فریشتە پۆل لـــە دوای پۆل ـ دەربازبن‌و هەڕاكەن لە تۆڵەو سزای ئەو ڕۆژە ، وە لە هێزی كیشندەی ئاسمانو زەوی بچنە دەرەوە، بەڵام من لام وایـە كە ئەم ئایەتانە بۆ دنیـان نـەك بـۆ ڕۆژی دویی ، بـە چەنـــد بەڵگەیەك :ـ

یەكەم : ئەمەیە كە دوا بەدوای ئایەتی « یسأله من في السماوات والارض »دێ كە لە باسی دنیادایە ٠

دووەم : كەوتۆتە پێش ئایەتی « فاذا انشقت السماء فـــكانت وردة كالدهان » كە لە باسی سەرەتای ڕۆژی دوایی‌دایە كـە هێشتا =

واتە بـە ووردی لێتان ئەپرسمەوەو تۆڵەتان ئەدەم ، مەبەست لـە خــۆ ئامادە کردن ئەم هەڕەشەیەیە ٠

ئەم شێوەیە لـە ناوئێمەشا هــەر بۆ هەڕەشەیە، وەك بـــە یەکێك بڵێیت : بوێستە تادەستم بەتاڵ ئەبێ، لـە کاتێـکا کەهیچ ئیشێکت نی‌یـەو

---

= حساب‌و پرسینەوە دەستی پێ نەکردووە ٠

سێیەم : تەفسیر «طبری» : یەکێك لە ماناکانی ئەوەیە کـە ئەم ئایەتە لە باسی مردنایە، کە مردنیش لە دنیادایە، واتە کــــەس ناتوانێ لە مردن ڕابکات، وە لە ئاسمان‌و زەوی بچێتە دەرەوە، واتە بۆ هەر کوێ‌یەك بچن مردن ئەیانگاتێ، ئنجا بەم پێ‌یە چەند جوانە کە بڵێن « کل یوم هو في شأن » هەڕ ڕۆژەی خـــوا لـــە کردنی کارێکایە، بەم ڕەنگە هەمیشە الهامی هەڵکەوتووانی ئادەمی ئەکات بۆ دۆزینــەوەی شــتێکی تــازەی گرنگ « اکتشافی عیلمی » وەك دۆزینەوەی کارەباو ڕادیۆو تەلەفزیۆن‌و هەزاران هــەزار شتی‌تر کە گرنگ ترینیان دەرچوونە لە هێزی کیشندەی ئاسمان‌و زەوی وە چوونە بۆ ناو هێــزی کیشندەی ئەوی‌تریان ، وەکو ئەفەرموێ « سنفرغ لکم ایها الثقلان ، فبأي آلاء ربکما تکذبان » خۆمتان بـۆ ئامادە ئەکەم ئەی ئادەمیی‌و پەری، واتە ماوەیەکی دووری ئــەوێ بۆ ئەوەی ئادەمی ئامادە ببێ بۆ دەرچوونی لـــە هێزی کیشندەی زویی‌و چوون بۆ مانگ‌و ئەستێرە، بەڵێ دوای هاتنەخوارەوەی ئەم ئایەتە بە پانزە چەرخ ئنجا ئادەمی گەیشتە ئەم پلەیە کـە بچێت بۆ مانگ ، بەم فەرموودەی « سنفرغ لـکم ایها الثقلان »ە ئەمــەی گەیاند کـە ئەم مــادە دوورو درێژە پێویستە بۆ ئەم ئامادە بوونی ئادەمی‌یە ٠

« یا معشر الجن والانس » ئەی کۆمەڵی پەری‌و ئــادەمیی « ان استطعتم » ئەگەر ئەتوانن «ان تنفذوا من اقطار السماوات والارض» کە دەرچن لە کەنارەکانی ئاسمان‌و زەویی ( فانفذوا ) فـــەرموو دەرچن، واتە ئێستا چونکە ئامادە نین ناتوانن ، ئنجا ئەفەرموێ =

بە هیچەوە خەریك نیت، بەڵکو هەر هەڕەشـــەو ترساندنت مەبەستە، لێرەشا مەبەس هــەر ئەوەیە کــە بڵێ : ئەمەوێ حسابتان لە گەڵ بـکەم بە حسابێکی قورس‌و گران •

---

=

« ولا تنفذون الا بسلطان » لەمەولاش دەرناچن مەگــەر بە هێزی زانیاری‌و دەسەڵاتی دارایی، واتە ئەم دوانەتان کــە بوو ئەتوانن دەرچن ، وە بگەنە مانگ‌و ئەستێرەی تر •

تا ئێستا ئەیشتونەتە مانگ کە نزیـكترین ئەستێرەیــە بــە زەوی، وەوەختێ خۆشی هەر لە زەوی بچڕاوە، ئنجا بزانبین کەی ئەگەنە ئەستێرەیەکی‌تر ، بەلام بە نیشـانەی ئـەم ئـایەتە کـــە ئەفەرموێ « یرسل علیـــکما شواظ مـــن نار ونحاس ) زبانەی ئـاگری گڕو مسی تواوەتـان ئـەنێررێتە سەر «شهب»و «نیازك» جێیان پێ لــەق ئەکــەن لەو ئەستیرانەدا، بە ڕەنگێك کـــە سەرکەوتوو نەبن لە کارەکەیانا، وەکو ئەفەرموێ « فلا تنتصران » «فبأي آلاء ربکما تکذبان» ناتوانن لە خـۆتانی دوور بخـەنەوە وە یارمەتی یەکتریی تیابدەن، چونکە ئەو ئەستیرانەی کە بە دەوری ڕۆژا ئەسووڕێنەوە هیچیان پشتێنەی ئاگریین « حزامی ناری » یان نی‌یە وەك زەوی هەیەتی ، لە بەر ئەوە «شهب»و «نیازك»بە زۆری ئەگەنە ئەوان ، بەلام ناگەنە زەوی، چونکە لە گەڵ گەیشتنە ئـەو پشتینەیە خێرا ئەسووتێن‌و ئاگریان تێبەر ئەبێ وەکو بەچـــاو ئەیان بینین •

ئەگەر بڵێین : ئەی بۆچی چوونە مانگ‌و هیچیش ڕووی نەدا؟ ئەڵێم ئەمەندە نەماونەتەوە تا بزانن ڕووئەدات یان نا •

ئەم خاوەن تەفسیرانە کە مانایان بەم ڕەنگە لێ نەداوەتەوە ، لەبەر ئەوەیە کــە کەسیان بە بیریانا نەهاتووە کە ڕۆژێ ئـــەبێ ئادەمی بچێتە مانگ‌و بێتەوە •

بەڵێ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٦١م لە لایەن دەوڵەتی ڕووسەوە «گاگارین» دەرکرا لە هێزی کێشندەی زەویی بۆ شوێنێك کــــە

=

فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (٣٢)

بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێ بڕوان (٣٢)

خوای گەورە بە هیچ کارێکەوە خەریك نییە، هەرچێکی بوێ ئەفەرموێ : ببەو ، ئەبێ ، وەك خۆی ئەفەرموێ : « انما امره اذا اراد شیئا ان یقول له کن فیکون » واتە خوا کە شتێکی ویست هەرئەوەندەی پێ ئەڵێ : کە ببە ئیتر ئەبێ • وەك خۆی ئەفەرموێ « وما امرنا الا واحدة کلمح بالبصر )(١) ( فبأی آلاء ربکما تکذبان ) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟•

= قورسی شتی تیا نامێنێ، وە دووری خستنەوە لێی بە جۆرێك کە بە کوورەی زەوییدا سووڕایەوە ، دوای رووس ئنجا ئەمەریکا ناردی ، دوایی هەر دوولا چوون بۆ مانگ‌و هاتنەوە •

خوا زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ لەمەپێش ئەم خەبەرەی داوە کە لە مەولا ئەگونجێ لە هێزی کیشندەی زەوی دەرچن ، وەبچنە ناو هێزی کیشندەی ئەستێرەیەکی ترەوە کاتێك کە هێزی زانیاری‌و دەسەڵاتی داریی‌تان تەواو بێ • تا ئەم خەبەرە ببێ بە معجزەیەکی علمی بۆ پێغەمبەر •

هەروەك لە سوورەی ( نحل ) دا زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ لە مەپێش خەبەری داوە بە دروست‌کردنی ئۆتومبیل‌و شەمەندەفەرو فڕۆکەو هەرچی لە مەولا دروست بکرێ بۆ هاتو چۆو گواستنەوەی شت‌و مەڕو کەڵ‌و پەل بە ئایەتی « والخیل والبغال والحمیر لترکبوها وزینة ویخلق ما لا تعلمون » واتە ئەسپ‌و ئێستر‌و کەری بۆ دروست کردوون تا سواریان ببن‌و ئارایشتی خۆتانی پێ بدەن ، وەشتی واتان بۆ دروست ئەکات لە مەولا ، کە ئێستا نازانن چیین •

(١) واتە فەرمانی ئێمە هەریەك‌جارە وەك چاوترووکانێك •

يَا مَعْشَرَ الْجِنِّ وَالْإِنْسِ إِنِ اسْتَطَعْتُمْ أَنْ تَنْفُذُوا مِنْ أَقْطَارِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ فَانْفُذُوا ، لَا تَنْفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَانٍ (٣٣)

---

ئەی کۆمەڵێ پەریو ئادەمیی ئەگەر ئەتوانن کە دەرچن لە کەنارەکانی ئاسمانانو زەوی بڕۆن دەرچن ، دەرناچن مەگەر بەهێزو دەسەڵات (٣٣)

---

لەم نیعمەتانەیە بێدار کردنەوەی مەردوم بەو هەڕەشانەی کە ئەیانکات لێرەو لە ئایەتی « یا معشر الجن •• » «ویرسل علیکما •••» و « فاذا انشقت السماء ••• » و « فیومئذ لا یسأل ••• » و « ویعرف المجرمون •• »و « هذه جهنم التي•• »دا بەو سزاو تۆڵانەی کە لە مەولا تووشیان ئەبێ، تا خۆیانی لێ بپارێزن بە پەشیمان بوونەوە •

ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە هیچ کەسێك ناتوانێ لە تۆڵەو سزای ڕۆژی دوایی خۆی دوور بخاتەوە، ئەفەرموی ( یا معشر الجن والانس ) ئەی کۆمەڵەی ئادەمیو پەری ( ان استطعتم ) ئەگەر ئەتوانن ( ان تنفذوا من اقطار السماوات والارض) کە دەرچن لە کەنارەکانی ئاسمانو زەوی، وە ڕەو «فرار» بکەن لە سزای خوا ( فأنفذوا ) بڕۆنو دەرچن ، ئینجا ئەفەرموێ ( لا تنفذون الا بسلطان ) ناتوانن دەرچن مەگەر بەهێزو دەسەڵات، کە ئەمەش کەس نییەتی لەو ڕۆژەدا • م

هەموو ئەزانیین کە هەڕەشەو گوڕەشە زۆر قازانجی هەیە بۆ ئادەمی، وە مەردومی خراپ زۆر جار ئەگێڕێتەوە لە خراپە، وە لە

فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ ( ٣٤ ) يُرْسَلُ عَلَيْكُما شُواظٌ مِنْ نارٍ وَنُحاسٌ فَلا تَنْتَصِرانِ (٣٥) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ ( ٣٦ )

---

بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٣٤) ئەنێرێتە سەرتان زبانەی ئاگرو مسی تواوە كە ناتوانن دووری بخەنەوە (٣٥) بەکام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕواناکەن ( ٣٦ )

---

چورتمێکی زۆر گەورەو ڕزگاری ئەکات ، ئینجا ئەبێ نیعمەت لەو جۆرە هەڕەشانە باشتر چی بێ ؟ بۆیە لە دوای ئەم هەڕەشە قورسەوە فەرمووی ( فبأی آلاء ربکما تکذبان ) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟

هەروا لەم هەڕەشانەیە کە ئەفەرموێ ( یرسل علیکما ) ئەنێررێتە سەر بێبڕواو هاوبەش پەیدا کەرانتان ئەی ئادەمیی‌و پەری ( شواظ من نار ) زبانەی ئاگری گڕ ( ونحاس )و دووکەڵی ڕەشی خەست ( فلا تنتصران ) ناتوانن لە خۆتانی دوور بخەنەوەو یارمەتی یەکتریی تیا بدەن ( فبأی آلاء ربکما تکذبان ) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێ بڕوان ؟

لێرەوە تا دوای سوورەتەکە باسی ڕۆژی قیامەت ئەکات، کە ئەم بوونەوەرە گەورەیە لە سەرەتای ڕۆژی دواییەوە تێک ئەچێ، وە حساب‌و پرسینەوە دەست پێ ئەکات ، وە تۆڵەی خواو سزای دێتە

فَإِذَا انْشَقَّتِ السَّمَاءُ فَكَانَتْ وَرْدَةً كَالدِّهَانِ (٣٧)

کاتێك کە ئاسمان لەت بووە ، وە سوور هەڵگەڕا( و تووایەوە ) وەك ڕۆن (٣٧)

پێشەوە، ئەفەرموێ ( فاذا انشقت السماء ) کاتێک کە ئاسمان لەت بوو ( فكانت وردة )وە سوور هەڵگەڕا وەك گوڵاڵە سوورە ، وە تووایەوە ( كالدهان ) وەك ڕۆنی قاڵ‌کراو، ئەو ڕۆژە لە کردەوەی بەدی خـــۆت پەشیمان ئەبیتەوە •

ئەم ڕەنـــگە سوورە کـە بە ســەر بوونەوەرا دێ ـ وەك زانایان ئەڵێن ـ ئاماژەیە بۆ تیشکی سوور ( اشعة حمراء ) کە لە هەموو تیشکێك بە هێزترو بە دەوام‌ترە •

هەموو ئایەتەکانی قورئان کە لە باسی ڕۆژی قیامەتا هاتوون، وەك ئـەم ئایەتەی کــە وا تەفسیری ئەکەین ، وەك « اذا رجت الارض رجا ، وبست الجبال بسا ، فكانت هباء منبثا »(١) وە ئایەتی « فاذا برق البصر ، وخسف القمر وجمـــع الشمس والقمر »(١) وە ئایـەتی « اذا الشمس كورت ، واذا النجوم انكدرت ، واذا الجبال سيرت ، واذا العشار عطلت

---

(١) واتە کاتێك زەوی کەوتە جووڵەو لەرزینی بەتووندی، وە کیوەکان ووردبوون بەووردیی وە بوون بە تۆزو کەوتنە هەوا •

(١) کاتێك چاو ئەبڵەق بوو، وە مانگ گیـــرا، وە مـانگ‌و ڕۆژ کۆ کرانەوە •

واذا الوحوش حشرت ، واذا البحار سجرت»(١) وە ئایەتی « اذا السماء انفطرت ، واذا الکواکب انتثرت ، واذا البحار فجرت»(٢) وە ئایـــەتی « اذا السـماء انشقت ، واذنت لربهـا وحقت (٣) وە ئایەتی « اذا زلزلت الارض زلزالها واخرجت الارض اثقالها ، وقال الانسان ما لها ، یومئـذ تحدث اخبارها ، بأن ربك اوحی لها » (٤) ئەمانە هەموو نیشان ئەدەن کە وێرانی‌یەکی تەواو دێ بە سەر بوونەوەرا، وە ئەم دەستوورەی کـــە ئێستا هــەیە هەمووی ئەپێچرێتەوە، وە هەرچی ئەستێرەی ئاسمان هەیە هەمووی سوور هەڵ ئەگەرێن‌و ئەتوێنەوە، وەك ڕۆنی قاڵ‌کراو دێنـــە خوارەوە • ئنجا لە ڕۆژێـکا کە ئەم فەلاکەتە گەورەیە قەومـا وە هەموو کەسێك بە چاوی خۆی دیی ، ئیتر نە بێ‌بروایی ئەمێنی‌و نە بە درۆ زانینی

---

(١) دەمێك ڕۆژ پێچرایەوەو ئەستێرەکان هەڵوەرین‌و کێوەکان بوون بە تۆزو کەوتنە هەوا، وە هەورەکان لە باران‌خران‌و جانەوەران‌کۆ کرانەوەو دەریاکان هەڵگیر سێنران •

(٢) کاتێك ئاسمان لەت بوو ، وە ئەستێرەکان هەڵوەرین وە دەریاکان تێـــکەڵ کران •

(٣) ساتێك ئاسمان لــەت بوو ، وە ملکەچی کرد بۆ پەروەردگاری خۆی‌و شایستەی فەرمانبەری بوو، وە دەمێك کـــە زەوی پان کرایەوە، هەرچی‌یەکی تیابوو فڕێ درایە دەرەوە، وە ملکـەچی کرد بۆ پەروەردگاری خۆی وە شایستەی ئەو ملکەچی‌یە بوو •

(٤) کاتێك زەوی هاتە لەرزین بە لەرزینی خۆی، وە هەرچی لە ناویا بوو فڕێی دایە دەرەوە، وە ئادەمی ووتی : ئەوە زەوی چی‌یەتی : لـەو ڕۆژەدا زەوی دەنـــگ‌و باسی خـــۆی دەگێڕێتەوە، کـــە پەروەردگاری تۆ وای سرووش بۆ کردووە ( و فەرمانی پێ‌داوە )•

فَبِأَیِّ آلاءِ رَبِّکُما تُکَذِّبانِ (٣٨) فَیَوْمَئِذٍ لا یُسْأَلُ عَنْ ذَنْبِهِ اِنسٌ وَلا جانٌّ (٣٩) فَبِأَیِّ آلاءِ رَبِّکُما تُکَذِّبانِ (٤٠) یُعْرَفُ المُجْرِمُونَ بِسِیماهُمْ ،

به کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (٣٨) ئنجا ئەو ڕۆژە پرسیار لە گوناهی هیچ ئادەمیی‌و پەریی‌یەك ناکرێ (٣٩) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (٤٠) بەدکاران بە ڕوخساریانا ئەناسرێنەوە ،

فەرموودەی پێغەمبەران، وەکو ئەفەرموێ ( فبأی آلاء ربکما تکذبان ) .

ئنجا ئەم تێکچوونی بوونەوەرە بە تەقین « انفجار » بێ ، یا بە هەڵتەقینیان بێ بە یەکا ، یا بە نەمانی هێزی کێشندە بێ ، زانایانی ئاسمان ئەڵێن نەوت‌و بەنزین کە داگیرسان ، چۆن هەمووی ئەبێ بە ڕووناکی‌و هیچی نامێنێ، ئەم ڕۆژو ئەستێرانەش ڕۆژ بە ڕۆژ ئەبن بە ڕووناکی‌و خۆیان کەم ئەبنەوە، وە ئەڵێن ڕۆژ لە یەك‌مانگا بە ملیۆن تەن کەم ئەبێتەوە وە لەم ڕووەوە . ( فیومئذ ) ئنجا لەو ڕۆژەدا کە ئاسمانی تیا لەت ئەبێ ( لا یسأل عن ذنبه انس ولا جان ، فبأی آلاء ربکما تکذبان ) پرسیار ناکرێ لە گوناهی هیچ ئادەمی‌و پەری‌یەك، چونکە کارەکە زۆر ئاشکراو نمایانە پێویست بە هیچ ناکات وەکو ئەفەرموێ ( یعرف المجرمون بسیماهم ) بەدکاران بە ڕوخساریانا ئەناسرێنەوە کەوا هەموو ڕووڕەش‌و چاو زەرد، یا خەمبارو خەفەت‌بار لە دوورەوە

فَيُؤْخَذُ بِالنَّواصي وَالْأَقدامِ (٤١) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبان (٤٢)

ئنجا ڕائەکێشرێن بە مووی پێشانیو بە قاچیان ( بۆ ناو دوزەخ ) (٤١)
بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ؟ (٤٢)

دیارن ( فیؤخذ بالنواصی ) ئنجا ڕائەکێشرێن دەمێ بە مووی پێشانیی یانو فڕێئەدرێنە دۆزەخەوە • (والاقدام فبأي آلاء ربكما تكذبان) وە دەمێ بە قاچیان، واتە لنگیان ئەگرنو فڕێیان ئەدەنە ناو ئاگرەوە ، ئنجا لەم کاتەدا نە بێبڕواییو نە بە درۆ زانینی پێغەمبەران ئەمێنێ •

لە ڕۆژی قیامەتا ـ چونکە ڕۆژەکە زۆر دوورو درێژە ـ زۆر هەڵوێستگەی تێئەکەوێ ، بەم ڕەنگە لە هەڵوێستگەیەکیا پرسیار ئەکرێ لە مەردوم وەك قورئان ئەفەرموێ « ولتسئلن عما كنتم تعملون » لە هەڵوێستێکی تردا دەمەقاڵێ ئەکەن وەك ئەفەرموێ « يوم تأتي كل نفس تجادل عن نفسها » لە یەکێکی ترا ڕێگا نادرێن بە قسەکردنو دەمقاڵێی کردن وەك ئەفەرموێ « يوم يأتي لا تكلم نفس الا بأذنه » لە یەکێکی ترا پرسیاریان لێ ناکرێ وەك لێرەدا، خولاسە هەر شوێنەی بە جۆرێکە ، وە دژیی لە ناوەندی ئایەتەکانا نییە •

لە کاتێکا کە بێبڕوایان بەم ڕیسوایییە ڕائەکێشرێن بە مووی پێشانیو بە قاچ ، وەفڕێ ئەدرێنە ناو دۆزەخەوە ، لەو کاتەدا بۆ

هـذه جهنم التي يكذب بها المجرمون ( ٤٣ ) يطوفون بينها وبين حميم آن ( ٤٤ ) فبأي آلاء ربكما تكذبان (٤٥) ولمن خاف مقام ربه جنتان ( ٤٦ ) فبأي آلاء ربكما تكذبان (٤٧)

ئەمە ئەو دۆزەخەیە کە بەدکاران بە درۆیان ئەزانی (٤٣) هاتوچۆ ئەکەن لە ناوەندی ئـەوو ئـاوی لـە کوڵیـا (٤٤) بـە کـام نیعمـەتی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (٤٥) بۆ ئەو کەسـەی کە لـە هەڵوێستگەی خۆی بترسێ لە بەردەمی پەروەردگاریا ـ دووباخچـەی (زۆر خۆش) هەیە (٤٦) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن (٤٧)

سەرکۆنەو چووزاندنەوەی لووتیان پێیان ئەڵێن ( هذه جهنم التي ) ئەمـە ئەو دۆزەخەیە کە ( یکذب بها المجرمون ) بەدکاران بە درۆیان ئەزانیو بڕوایان پێ نەئەکرد ( یطوفون بینها ) هاتو چۆ ئەکەن لە ناوەندی ئاگری دۆزەخ (وبین حمیم آن)و ئاوی گەرمی لـە کوڵیـا • واتـە وا چوونەتـە ناویەوە ، وە بە چاوی خۆتان دیتان ، ئنجا دەمێ بچن بـەگڕەو کـڵپەو بڵێسەکەی خۆتان ببرژێنن ، کە تینوشتان بوو بچن لە ئاوی لەکوڵو بـە جۆشی بخۆنەوە • ئایا خوا لە دنیادا کە پێشەکی ئەیترساندن بەم ئاگرە ، ئایا گەورەترین نیعمەت نەبوو لە خواوە بۆ ئێوە ئـەگەر بـە قسەتـان بکردایە ؟ ( فبـأي آلاء ربکمـا تـکذبان ) کە واتـە بـە کام نیعمەتـانی پەروەردگارتان بڕوا ناکەن ؟

لە دوای باسی چەند ڕووبەڕەیەك لە سزای دۆزەخ ئنجا هاتە سـەر باسی نازو نیعمەتانی بەهەشت، فەرمووی (ولمن‌خاف‌مقام‌ربه‌جنتان، فبأي آلاء ربکما تکذبان) کەسێك لە هەڵوێستگە «موقف»ی خۆی بترسێ لە بەردەمی

پەروەردگاریا ، دوو باخچەی زۆر خۆشی دەست ئەکەوێ ، واتە ئەوانەی کە لە خوای خۆیان ئەترسن ، وە بێ گومانن کە لە سەر هەموو کردەوەیەك پاداشی ئەداتەوە ، چاکەی بە چاکەو خراپەی بە خراپە ، وە ئەگەر جارێك هاتە سەر کردنی کارێکی خراپ ، خێرا خوای بیر ئەکەوێتەوە ، وە لە ترسی خوا دەست لەو کارە خراپەیە هەڵئەگرێ •

وەك « سید قطب » ئەفەرموێ : ئەمە یەکەم جارە لە قورئانا کە ناوی دوو باخچەی تایبەتی ئەبات لە بەهەشتا ، وا دیارە ئەم دوو باخچەیە دوو باخچەی زۆر جوانو تایبەتین، هەر لەناو بەهەشتە گەورە تێکڕاییەکەدا، بەڵام بە تایبەتی ناوی بردن لە بەر جوانیو خۆشیو بەرزیی پایەیان •

لەمەولا لە سوورەتی «واقعة»دا ئەفەرموێ : ئەوانەی ئەچنە بەهەشت، دوو دەستەی گەورەن ، یەکەمیان پێشینیان نزیکانی بارەگا « السابقون المقربون »و دووەمیان دەستەی لایڕاست « اصحاب الیمین »ن ، بۆ هەموو یەکێکیان جۆرە نازو نیعمەتو خۆشیو ڕابوواردنێك هەیە ، لێرەشا هەر بەو ڕەنگە دووباخچە ناو ئەبات کە ئەو دووانە بۆ دەستەیەکن کە خاوەنی پلەو پایەیەکی بەرزن ، کە ئەگونجێ دەستەی پێشینانی نزیکانی بارەگابن کە ناو براوون لە سوورەی « واقعة »دا •

لە پاشدا دوو باخچەی‌تر ناو ئەبات لە دوانەکەی پێشوو نزمتر • وا دەرئەکەوێت کە ئەم دوانە بۆ دەستەیەکن کە دێن لە دوای دەستەکەی پێشووەوە کە ئەگونجێ دەستەی لای ڕاست بن •

ذَواتا أَفْنانٍ (٤٨) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبانِ (٤٩) فِيهِما عَيْنانِ تجريان (٥٠) فبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبانِ (٥١) فيهما مِنْ كُلِّ فاكِهَةٍ زَوْجانِ (٥٢) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبان ( ٥٣ ) مُتَّكِئِينَ على فُرُشٍ بَطائِنُها مِنْ إِسْتَبْرَقٍ وَجَنَى الْجَنَّتَيْنِ دانٍ (٥٤)

خاوەنی دارو درەختی زۆر (٤٨) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٤٩) تێیانا هەیە دوو سەرچاوەی ڕەوان (٥٠) بەکام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٥١) هەیە لە ناویانا لە هەموو میوەیەك جۆر جۆر (٥٢) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٥٣) پاڵیان داوەتەوە لە سەر جۆرە دۆشەکێك کە بەرەکانیان لە قەیفەو ئاوریشمە ، وە میوەچنینی ئەو دووباخچەیە نزیکە دەستە (٥٤)

ئنجا باسی ئەو دوو باخچەیە ئەکات ئەفەرموێ ( ذواتا أفنان ، فبأي آلاء ربكما تكذبان ) خاوەنی هەموو جۆرە دارو درەختو میوەهاتێکی ڕەنگاو ڕەنگە ( فيهما تجريان ، فبأي آلاء ربكما تكذبان ) لەو دوو باخچەیەدا هەیە دوو سەرچاوەی گەورەی سازگاری ڕەوان ، وە هەر یەکێکیان لە یەکێکیانان (فيها من كل فاكهة زوجان ، فبأي ئالاء ربكما تكذبان ) هەیە لەو دوو باخچەیەدا لە هەموو میوەیەك جۆر جۆر •

لە دوای باسی خواردەمەنی بەهەشتییان ئنجا باسی دۆشەكو پشتیو ژێرەخەریان ئەکات ئەفەرموێ (متكئين على فرش) پاڵیان داوەتەوە لە سەر جۆرە دۆشەکێك ( بطائنها من استبرق ) کە بەرەکانیان لە قەیفەی نەرمو شلە ، ئنجا ئەبێ ڕووەکانیان لە چی بێ ؟ ( وجنى الجنتين دان ،

فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (٥٥)

فِيهِنَّ قاصِراتُ الطَّرْفِ لَمْ يَطْمِثْهُنَّ إِنْسٌ قَبْلَهُمْ وَلا جانٌّ (٥٦) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (٥٧) كَأَنَّهُنَّ الْياقُوتُ وَالْمَرْجانُ (٥٨) فَبِأَيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (٥٩)

---

بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٥٥)

لەو باخچانەدا هەن حۆرییانێك کە چاو لە دەرەوەنین ، دەستی کەسیان لێنەکەوتووە نە لە ئادەمیو نە لە پەری (٥٦) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٥٧) ئەڵێیت یاقوتو مەرجانن (٥٨) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٥٩) •

---

فبأي آلاء ربکما تکذبان ) وە میوەو چنینی ئەو دوو باخچەیە نزیکە دەستە ، واتە لقەکانیان شۆڕ بۆتەوە ، وە بە بێ ئەرك دەست ئەبەیتو ئەیکەیتەوە •

وا نەزانن کە نازو نیعمەتی ناو ئەو باخچانە هەر ئەمانەن بەڵکو (فیهن) لە ناو کۆشكو ژوورەکانی ئەو باخچانەدا هەن ژنانی ( قاصرات الطرف) کورت چاوان ، واتە چاویان لە دەرەوە نییە ، بەڵکو هەر چاویان لە مێردەکانی خۆیانەوەیە (لم یطمثهن انس قبلهم ولا جان ، فبأي الاء ربکما تکذبان ) دەستی کەسێکیان لێ نەکەوتووە نە لە ئادەمییو نە لە پەری ، واتە هەمووکچی سەر بە مۆرن •

ئەم حۆرییانە لەوپەڕی جوانیو سوورو سپێتییەوەن وەکو ئەفەرموێ ( کأنهن الیاقوت والمرجان ، فبأي آلاء ربکما تکذبان ) ئەڵێیت

هَلْ جَزاءُ الاِحْسان اِلاّ الاِحْسانُ (٦٠) فبأيِّ آلاءِ رَبِّكُما تُكَذِّبانِ (٦١) وَمِنْ دونِهما جَنَّتانِ (٦٢) فبأيِّ آلاءِ رَبِّكما تكذّبان (٦٣) مُدْهامَّتانِ (٦٤) فبأيِّ آلاءِ رَبِّكُما تكذّبان(٦٥)

ئایا پاداشی چاکە هەر چاکە نیىە ؟ (٦٠) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێبڕوان (٦١) لەو دوو باخچەیە پەستتر ، دوو باخچەیترن (٦٢) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟ (٦٣) دوو باخچەی سەوزی تەڕو پاراو (٦٤) بەکام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟ (٦٥) •

یاقووت مەرجانن ، واتە سەرگۆنایان ئەڵێیت یاقووتو ئەندامیان ئەڵێیت مەرجانە لە سافو لووسیو بریقە دانەوەدا •

ئەمانە هەمووی پاداشی ئەو کەسانەن کە لە دنیادا لە خوا ترساوون، وە لە ترسی خوا دەستیان لە هەموو گوفتارو کردارێکی بێشەرعی هەڵگرتووە ، ئەمانە لە دنیادا چاکەیان کردووە ، وە پاداشی چاکەش هەر چاکەیە ، وەکو ئەفەرموێ •••

( هل جزاء الاحسان الا الاحسان ، فبأي الاء ربكما تكذبان ) ئایا پاداشی چاکە هەر چاکە نیىە ؟ واتە بەڵێ هەر چاکەیە •

دوای ئەوەی باسی دوو باخچەکەی پێشووی کرد لەگەڵ باسی دانیشتوانی ئەو دوو باخچەیەدا، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە دوو باخچەیتر هەن لە خوار دوو باخچەکەی پێشووەوە ، ئەفەرموێ ( ومن دونهما جنتان ، فبأي الاء ربكما تكذبان ) لەو دوو باخچەیە نزمتر کە باس کران دوو باخچەیترن بۆ لە خواترسان ( مدهامتان ، فبأي الاء ربكما تكذبان )

فیهما عینانِ نَضّاخَتانِ (٦٦) فبأیِّ آلاءِ رَبِّکُما تکذّبان (٦٧)
فیهما فاکهةٌ ونَخْلٌ ورُمّانٌ (٦٨) فبأیِّ آلاءِ رَبِّکما
تکذّبان (٦٩) فیهنَّ خَیْراتٌ حِسان (٧٠) فبأیِّ آلاءِ رَبِّکما
تکذّبان (٧١) حورٌ مَقْصوراتٌ في الخِیامِ (٧٢) فبأیِّ آلاءِ رَبِّکُما
تکذّبان (٧٣)

لەو باخچانەدا هەن دوو کانی هەڵقوڵاو (٦٦) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟ (٦٧) •
لەو باخچانەدا هەن هەموو جۆرە میوەیەك نەخوازەڵا خورماو هەنار (٦٨) بە کام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێبڕوان (٦٩) تێیانایە ژنانی هەڵبژاردەی جوان (٧٠) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٧١) کە ئەوژنانە حۆری پەردەنشینی ناو خێوەتن (٧٢) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان (٧٣)

دوو باخچەی سەوزی تەڕو پاراو، کە لەبەر زۆرسەوزیی بە سەر ڕەشیدا ئەڕوانن (فیهما عینان نضاختان، فبأي آلاء ربکما تکذبان) لەو دوو باخچەیەدا هەن دووکانی کە لە شوێنی خۆیان هەڵ ئەقوڵێن بێ ئەوەی کە بە زۆریی لە بەریان بڕوا، وە ئەم دوو کانییە هەر یەکێکیان لە باخچەیەکیانان (فیهما فاکهة ونخل ورمان فبأي الاء ربکما تکذبان) لەم دوو باخچەیەدا هەن هەموو جۆرە میوەیەك ، نە خوازەڵا خورماو هەنار ( فیهن خیرات حسان فبأي الاء ربکما تکذبان ) لەو باخچانەدا هەن ژنانی هەڵبژاردەی جوان ( حور مقصورات في الخیام ، فبأي الاء ربکما تکذبان ) کە ئەو ژنانە

لم يَطْمِثْهُنَّ اِنسٌ قَبْلَهُمْ وَلا جانٌّ (٧٤) فبأَيِ آلاءِ ربِكُما تكذّبان (٧٥)

مُتَّكِئين عَلى رَفرَفٍ خُضْرٍ وَعَبْقَرِيٍّ حِسانٍ ( ٧٦ ) فَبِأَيِ آلاءِ ربِكُما تُكَذِّبان ( ٧٧ ) تَبارَكَ اسمُ رَبِّكَ ذِي الْجَلالِ وَالاِكْرامِ (٧٨)

---

دەستی کەسیان لێ نەکەوتووە پێش ئەوان ، نە لە ئادەمیو نە لە پەری (٧٤) بەکام نیعمەتانی پەروەردگارتان بێ بڕوان ؟ (٧٥)

پاڵ ئەدەنەوە لە سەر دۆشەكو پشتی سەوزی نەرمو شلو فەرشی جوانی نایاب (٧٦) بە کام نیعمەتی پەروەردگارتان بێبڕوان ؟ (٧٧) ناوی پەروەردگاری خاوەن گەورەییو بەخشست پیرۆزە (٧٨)

---

حۆری پەردەنشینی ناو خێوەتن ( لم يطمثهن انس قبلهم ولا جان ، فبأي الاء ربكما تكذبان ) دەستی هیچ کەسێکیان لێ نەکەوتووە نە لە ئادەمییو نە لە پەریی ، واتە حۆریی هەردوو باخچەکە وەك یەك وان لە پاكو تەمیزیدا •

لە پاشا ئنجا باسی چۆنێتی دانشتووانی ئەو دوو باخچەیە ئەکات ئەفەرموێ ( متكئين على رفرف خضر ) دانیشتوانی ئەو دوو باخچەیە پاڵ ئەدەنەوە لەسەر دۆشەكو پشتی نەرمو شلی سەوز (وعبقري حسان ، فبأي الاء ربكما تكذبان ) وە فەرشی جوانی زۆر نایاب ( تبارك اسم ربك ذي الجلال والاكرام ) گەورەو پیرۆزە ناوی پەروەردگاری تۆ ، کە خاوەنی گەورەییو بەخششە بۆ بەندەگانی بە ترسی خۆی •

# سورة الواقعة

## بسم الله الرحمن الرحيم

اِذا وَقَعَتِ الواقِعَةُ (١) لَيْسَ لِوَقْعَتِها كاذِبَةٌ (٢)

---

## سوورەی (واقعة)یە

## مەککی یە (٩٦) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

کاتێـك کە ڕووداوی ( قیـامەت ) ڕوویـدا (١) لە بوونیـا هیـچ درۆیەکی تیانییە (٢)

---


## سوورەی (واقعة)یە

## مەککی یە (٩٦) ئایەتە


**بسم الله الرحمن الرحيم**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

( اذا وقعت الواقعة ) کاتێك کە ڕووداوی گەورە ڕوویدا ـ کـە ڕۆژی قیامەتە ـ ، وە ئەو ڕۆژە هات بە خۆیو هەمـوو سـامو تـرسو بیمێکییەوە ـ سزاو تۆڵەی خوا دەست پێ ئەکات بە جۆرێـك کە زبـان لاڵو قەڵەم کۆڵە لە باسیا، ئنجا بڕیاری بوونەکەی ئەدات ئەفەرموی (لیس لوقعتها کادبة ) لە بوونیا هیچ درۆو گومانێکی تیا نییە ، ئنجا بە دوو ووتە

خافِضَةٌ رافِعَـــةٌ (٣)
اِذا رُجَّتِ الأَرضُ رَجّاً (٤) وَبُسَّتِ الجِبالُ بَسّاً ( ٥ )
فَكانَتْ هَباءً مُنْبَثّاً (٦) وَكُنْتُمْ أَزْواجاً ثَلاثَةً (٧)

نزم کەرەوەی بەرز کەرەوەیە (٣)دەمێك کە زەوی هێنرایـە لەرزە بـە لەرزینێـکی تونـد (٤) وە شاخەکان وورد کران ڕێزە ڕێزە (٥) وە بوون بە گەردو چـوون بـــە ئاسمانا (٦) وە بوون بە سێ دەستە (٧)

بەسەرهاتی ئەو ڕۆژە ئەگەیەنی ، ئەفەرموێ ئەو ڕۆژە (خـافضة رافعة) گەلێ کەس پەستو نزم ئەکاتو گەلێ کەسیش بەرزو بڵند ئەکاتەوە ، واتە زۆر کەس کە لە دنیادا بەرزو بەڕێـز بوون لـەو ڕۆژەدا پەسـتو بێنرخو ڕیسوان ، وە زۆر کەسیش لە دنیادا بێناوو نیشان بوون ، لەو ڕۆژەدا بەرزو بڵندو ناودار ئەبن ، واتە هێندێك ئەبێ بە کۆتەرەو بزووتی دوزەخو هێندێکیش ئەبێ بە دانیشتووی باخو باخاتی بەهەشت •

ئنجا ئاخۆ ئەم زەوی‌یەی کە ئێمەی لە سەر پشتین ، وە هـەزاران هەزار سـاڵە بەم نـەرمو نیانی‌یـە ئەسووڕێتـەوە بـــە ئاسمانـا ـ لەو ڕۆژەدا چی لێ بێ ؟ وە بەشی چی بێ لەو کاتـەدا ؟ ئەفەرموێ :

( اذا رجت الارض رجا ) ئەو دەمەی کە زەوی ئەخرێتە لەرزەو تەکان خواردن ، بە جۆرێك کە هەرچی شاخو داخو کێوو بەرزی هەیـە هەمووی دائەڕووخێو تەخت ئەبێ ، وەکو ئەفەرموی ( وبست الجبـال بسا ) وە شاخەکان ووردکران بە ووردی ، بە ڕەنگێـکی وا کە ببێ بـە تۆزو بچێ بە ئاسمانا ، وەکو ئەفەرموێ ( فـکانت هباء منبثا ) وە بووبـە گەردو چوو بە ئاسمانا ( وکنتم ازواجا ثلاثة ) وە ئێوە ئەی ئادەمی بوون

فَأَصْحابُ الْمَيْمَنَةِ ما أَصْحابُ الْمَيْمَنَةِ (٨) واصحابُ الْمَشأَمَةِ ما أَصْحابُ الْمَشْأَمَةِ (٩) والسابقونَ السابقونَ ( ١٠ ) أُولئِكَ الْمُقَرَّبونَ (١١) في جَنّاتِ النَّعيمِ (١٢)

ئنجا دەستەی لای ڕاست ، کام دەستەی لای ڕاست ؟ (٨) وە دەستەی لای چەپ ، کام دەستەی لای چەپ ؟ (٩) وە پێشکەوتوکان ، ئەوانەی لە بڕوادا لە پێشەوەن (١٠) ئەوانەن نزیکانی بارەگا (١١) لە بەهەشتانی نازو نیعمەتان (١٢)

بە سێ دەستە ، کە دوانیان ئەچن بۆ بەهەشتو یەکێکیان ئەچێ بۆ دۆزەخ

ئنجا ناوی ئەم دەستانە ئەبات بە جۆرێك کە ئەحواڵیان لە خۆشیو ناخۆشی بگەیەنێ بە بێ باسو تەعریفیان ئەفەرموێ ( فاصحاب المنة ) یارانی لای ڕاست کە نامەی کردەوەیان ئەدرێتە دەستی ڕاستیان ( ما اصحاب الميمنة ) کام یارانی لای ڕاست ؟ واتە لە خۆشی یەکی ئەوەندە گەورەدان نە باس ئەکرێو نە هەڵئەژمێررێ •

( واصحاب المشأمة ) دەستەی لای چەپ کە نامەی کردەوەیان ئەدرێتە دەستی چەپیان ( ما أصحاب المشأمة ) چ ئەحواڵێکیان بێ دەستەی لای چەپ ، وە لە چ ناخۆشیو سزایەکابن ؟ واتە سزاو ناخۆشی یەکەیان ئەوەندە زۆرە باس ناکرێ •

ئنجا باسی دەستەی سێهەم ئەکات ئەفەرموێ ( والسابقون ) پێش کەوتووەکان لە دنیادا بۆ بڕواهێنان لە ئوممەتی هەموو پێغەمبەرەکان ( السابقون ) پێش کەوتوون لە ڕۆژی دوایدا بۆ چوونە بەهەشت ، وەکو ئەفەرموێ ( اولئك المقربون ) هەر ئەوانەن نزیکانی بارەگا ( في جنات النعيم ) لە بەهەشتانی پڕ لە نازو نیعمەتان •

ثُلَّةٌ مِنَ الأَوَّلِينَ (١٣) وَقَلِيلٌ مِنَ الآخِرِينَ ( ١٤ ) على سُرُرٍ مَوْضُونَةٍ (١٥) مُتَّكِئِينَ عَلَيْهَا مُتَقَابِلِينَ ( ١٦ ) يَطُوفُ عَلَيْهِمْ وِلْدَانٌ مُخَلَّدُونَ (١٧)

---

دەستەیەکی زۆرن لە گەلانی پێشینان (١٣) وە کەمێکن لە پاشینان (١٤) لە سەر کورسیی داکوتراو بە زێـڕو مرواریو گەوهـەر (١٥) پاڵئەدەنەوە لە سەری ڕوو بە ڕووی یەك (١٦) کوڕانی (جوانی پاكو تەمیز) کە هەتا هەتایە هەر لەو تەمەنەدا دەمێننەوە ( ١٧ )

---

بۆچی بەشی سێهەمی دواخست لە دوانەکەیتر لە ناوبردنا ؟ ، لەگەڵ ئەوەی کە لە هەموان گەورەترن ، تا لە باس کردنیان بە درێژی یەکەمین بن ، ئنجا ئەم نزیکانی بارەگایە ، ( ثلة من الاولین ) دەستەیەکی ئێجگار زۆرن کە لە ژمارە نایەن لە ئوممەتانی پێشینان ، لە ئادەم پێغەمبەرەوە تـا حەزرەتی محمـد ( وقلیل من الاخرین ) وە کەمێکن لـە پاشینـان لـە ئوممەتی محمد •

ئنجا باسی خۆش ڕابواردنیان ئەکات ئەفەرموی : کـۆڕ ئەبەسـتن ( علی سرر موضونة ) لە سەر کورسیو تەختی داکوتراو بـە یـاقووتو مرواریو زێڕ ، ( متکئین علیها متقابلین ) پـاڵ ئەدەنـەوە لە سـەر ئەو تەختو کورسییانە ڕوو بە ڕووی یەك بە خۆشیو پێکەنین ، بێ ئـەوەی خەمێکیان لە دڵا بێ ، یا لە شتێك بترسن ، یا کەمو کووڕییەکیان بـێ ( یطوف علیهم ولدان مخلـدون ) کوڕانی جـوانی پـاكو تەمـیز ، وەك

بِأَكْوابٍ وَأَباريقَ وكَأْسٍ مِنْ مَعينٍ (١٨)
لا يُصَدَّعونَ عَنْها وَلا يُنْزِفونَ (١٩) وفاكِهَةٍ مِمّا يَتَخَيَّرونَ (٢٠) وَلَحْمِ طَيْرٍ مِمّا يَشْتَهونَ (٢١)

---

بە دەوریانا ئەگەڕێن بە پەرداخو سوراحیی پڕ لە شەرابی سەرچاوی ڕەوان (١٨)

نە سەریەشە ئەهێنن‌و نە سەرخۆشی ئەدەن (١٩) وە بە میوەیەك کە خۆیان هەڵیبژێرن (٢٠)و گوشتی باڵندەیەك کە حەزی لێ بکەن (٢١)

---

پێش‌خزمەت بە دەوریانا دێن کە بە درێژایی ساڵ ( واتە هەمیشەیی‌و ئەبەدی ــ م ــ ) لە یەك تەمەنان ، وە هەرگیز گەورەتر نابن ، وە لەو تەمەنە تێ‌ناپەڕن ، ئنجا ئەسووڕێنەوە ( باكواب واباريق وكأس من معين ) بە پەرداخو سوراحی‌و گەلاسی پڕ لە شەرابی ڕەوان ، واتە شەرابی بەهەشت وەك شەرابی دنیا نی‌یە لە ترێ یا لە خورما •• بگیرێ ، بەڵكو وەك كانیی ساردو سازگارو ساف‌و ڕەوان دێت‌و ئەڕوات ( لايصدعون عنها ) نە سەریەشە ئەهێنن ( ولا ينزفون)و نە سەرخۆشی ئەدەن‌و نەژیریی لائەبەن •

لە دوای باسی خواردنەوەی شەراب ئنجا باسی خواردنیان ئەكات ئەفەرموێ ( وفاكهة مما يتخيرون ) ئەو پێش خزمەتانە ئەگەڕێن بە سەریانا بە هەموو جۆرە میوەیەكەوە ، هەر كەسێك چی ئارەزوو بكات هەڵی ئەگرێ ( ولحم طير مما يشتهون ) وە بە گوشتی باڵندە لەوەی كە

وَحُورٌ عِينٌ (٢٢) كَأَمْثالِ اللُّؤْلُؤِ المَكْنُونِ (٢٣)
جَزاءً بِما كانُوا يَعْمَلُونَ (٢٤) لا يَسْمَعُونَ فِيها لَغْواً وَلا
تَأْثِيماً (٢٥) إِلاّ قِيلاً سَلاماً سَلاماً ( ٢٦ )

---

وە حۆریانی چاو جوان (٢٢) مانەندی مرواریی ناو پوڕگ (٢٣)
( ئەم نیعمەتانە ) پاداشی کردەوەی خۆیانە (٢٤) نابیەن لەو
بەهەشتانەدا نەقسەی بێهوودەو نە قسەیەك کە گوناه بێ (٢٥) مەگەر
قسەی ئاشتیو سڵاو (٢٦)

---

ئارەزووی ئەکەن •

لە دوای باسی خواردنو خواردنەوەیان ، ئنجا باسی ژنانیان ئەکات ئەفەرموێ : (وحورعین) وە حۆرییانی چاو جوان بە دەوریانا ئەسووڕێنەوە ، کە لە جوانیو سپێتیو پاكو تەمیزیدا ( كأمثال اللؤلؤ المكنون ) وەك دوڕو مرواریی ناو پوڕگ وانە ، نە دەستیان لێ کەوتووەو نە بەرچاو کەوتوون •

ئنجا هۆی ئەم نازو نیعمەتانەیان باس ئەکات ئەفەرموێ خوا ئەم هەموو نازو نیعمەتانەی بۆ ئامادە کردوون لە بەهەشتا ( جزاء بما كانوا يعملون ) لە پاداشی ئەو خێرو چاکانەی کە کردوویانە •

لە پاشا ئەم نزیکانی بارەگایە لەو بەهەشتانەدا ئەژین بە ژینێکی بێ نە بێدەنگیو بێقڕەییو ئاژاوە کە ئەمە لە هەموو شتێك خۆشترە ، وەکو ئەفەرموێ ( لايسمعون فيها لغوا ) نابیەن لەو بەهەشتەدا نە قسەی بێهوودە (ولا تأثيما) وە نە قسەیەك کە گوناه بێ ( الا قيلا سلاما سلاما ) مەگەر

وَأَصْحابُ اليَمينِ مـــا أَصْحابُ اليَمينِ ؟ (٢٧)
في سِدْرٍ مَخْضودٍ ( ٢٨ ) وطَلْحٍ مَنْضودٍ ( ٢٩ ) وَظِلٍّ مَمْدودٍ (٣٠)

---

وە یارانی لای ڕاست ، کام یارانی لای ڕاست ؟ (٢٧)
لەژێر سێبەری درەختی نەبقی بێ دڕك (٢٨) وە داری مۆزی پڕ هێشوو (٢٩) وە سێبەری دوورو درێژ (٣٠)

---

قسەی ئاشتیو سڵاو ، بەم ڕەنگە فریشتە لە هەموو لایەکەوە سڵاویان لێ ئەکەن ، وە خۆیان لە ناو خۆیانا سڵاو لە یەکتری ئەکەن ، وە خواش سڵاویان بۆ ئەنێرێ •

ئنجا باسی خۆشیو نازو نیعمەتی دەستەی دووهەم ئەکات ئەفەرموێ : ( واصحاب الیمین ) دەستەی لای ڕاست ( ما اصحاب الیمین ) چ ئەحواڵێکی خۆشیان بێ ئەم دەستەیە •

ئەم ئەصحابی یەمینە هەر (هەمان ــ م) ئەصحابی مەیمەنەن کە لە سەرەتاوە باسی‌کردن ، بەڵام باسی نازو نیعمەتانی دواخست بۆ ئێرە ئەم یارانی لای ڕاستەش جۆرە نازو نیعمەتێکیان هەیە کە لە نازو نیعمەتی دەشت‌نشین ئەچێ ، وە زووتر ئارەزووی دڵی ئەوان بەجێ دێنێ ، ئنجا ئەم یارانی لای ڕاستە ( في سدر مخضود ) لە ژێر سێبەری درەختانی داری نەبقی بێ دڕك (وطلح منضود)وە لە ناو باخاتی مۆز کە هێشووەکانی لە بەر زۆریی مۆزەکەی قەدی لاسکەکەی دیار نییە ( وظل ممدود ) وە

وَمَاءٍ مَسْكُوبٍ (٣١) وفاكِهَةٍ كَثِيرَةٍ (٣٢) لا مَقْطُوعةٍ ولا مَمْنُوعةٍ (٣٣) وَفُرُشٍ مَرْفُوعَةٍ (٣٤)
اِنّا أَنْشَأْناهُنَّ اِنشاءً (٣٥)

---

و ئاوی دارژاو (٣١)و میوەی زۆر (٣٢) کە لە هیچ کاتێکا نەبڕێ‌و لە کەس قەدەغە نەکرێ (٣٣)وە قاڵی‌و نوێنی بەنرخ بۆ حەسانەوەو ڕاکشانی حۆری‌و ژنان(٣٤)

کە دروستمان کردوون بە دروست‌کردن (٣٥)

---

لە ناوسێبەری دوورو درێژ ( وماء مسکوب ) وە ئاوی دارژاو بۆ خوارەو ٠

ئەمانە ۆزرتر مایەی خۆشیی دێهاتی‌و دەشت‌نشینن، وە هەمیشە یادی ئەکەن‌و ئاواتی بۆ ئەخوازن ( وفاکهة کثیرة )وە لە ناو میوەی زۆران ( لا مقطوعة ) کە لە هیچ کاتێکا نەبڕێ ( ولا ممنوعة ) وە لە کەس قەدەغە نەکرێ ( وفرش مرفوعة ) وە قاڵیی بە نرخ‌و نایاب کە ڕاخراوون لە شوێنی بەرزو خۆش‌و چەشمەنداز بۆ حۆری‌و ژنانی دنیا کە (انا انشأناهن انشاء) ئێمە دروستمان کردوون بە دروست‌کردنێکی زۆر جوان، ئنجا هەرچێکو حۆرین دروست‌کراوون بە بێ زاوزێ، وە هەر چێکو ژنانی دنیاشن با بە پیریش مردبن خوا لە قیامەتا دروستیان ئەکاتەوە بە جوانترو ڕێك‌و پێکتر، وە بە ڕەووشت‌و خووتر لە دنیا، وە

فَجَعَلْنَاهُنَّ أَبْكَاراً (٣٦) عُرُباً أَتْرَاباً (٣٧)
لِأَصْحَابِ الْيَمِينِ (٣٨)

وە گێڕاومانن بـە کچان (٣٦)ی خۆ خۆشەویست کەرانی هاوتەمەنـان (٣٧) بۆ یـارانی لای ڕاست (٣٨)

هەموو بە کچی‌و بەهاوتەمەنی ئەچنە بەهەشتەوە وەکو ئەفەرموێ(فجعلناهن ابـكارا ) ئنجا گێڕاومانن بە کچان ( عربا ) خۆ خۆشەویست کەران لای مێردیان ( اترابا ) هاوتەمەنان ( لاصحاب اليمين )بۆ یارانی دەستـەی لای ڕاست •

« طبرانی » لە « ام سلمە »ی خێزانی پێغەمبەر ئەگێڕێتەوە کـە ڕۆژێ لـە پێغەمبەر ئەپرسێ ئەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ژنانی دنیـا گەورەترو باشترن یا حـۆریی بەهەشت ؟ پێغەمبەر ئەفەرموی : ژنانی دنیا، ام سلمە ئەڵێ : بۆچی ؟ پێغەمبەر ئەفەرموێ چونکە نوێژو ڕۆژوو، خێرو، خوا پەرستی‌یان بووە لە دنیادا، بەڵام ئەوان ئەمانەیان نەبووە ، ئنجا لێی ئەپرسێ ئەڵێ : ئەی پێغەمبەری خوا ! ژنانی وامان زۆرە کـە لـە دنیادا دوو سێ شوویان کردووە، وە ئەمرن‌و ئەچن بۆ بەهەشت ، وە مێردەکانیشیان ئەچنـە بەهەشت، ئەم ژنانە بەکـام مێردیان ئەدرێن ؟ فەرمووی ژنەکە لە خوو ڕەوشتی کام لایان ڕازی بێ بەوەیان ئەدرێ ، لە پاشا پێغەمبەر فەرمووی ئەی « ام سلمە » ڕەوشت‌و خووی جـوان خێروخۆشیی دنیـا ئەبا بۆ خۆی •

ثُلَّةٌ مِنَ الأَوَّلِينَ (٣٩) وَثُلَّةٌ مِنَ الآخِرِينَ (٤٠)
وَأَصْحابُ الشِّمالِ ، ما أَصْحابُ الشِّمالِ ( ٤١ )

کۆمەڵێکن لە گەلانی پێشینان (٣٩) وە کۆمەڵێکن لە گەلانی پاشینان (٤٠) دەستەی لای چەپ ، کام دەستەی لای چەپ (٤١)

ئەگێڕنەوە کە پیرەژنێك ئەچێتە خزمەت پێغەمبەر ( دروودی خوای لە سەر بێ ) ئەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا ! نزام بۆ بکە کە خوا بمباتە بەهەشت، پێغەمبەریش ئەیەوێ گاڵتەیەکی لە گەڵ بکات، ئەفەرموێ : داپیرە! پیرێژن ناچێتە بەهەشت، ژنە دەست ئەکا بە گریان، پێغەمبەر ئەفەرموێ : پیرێژن بە پیرێژنێتی ناچێتە بەهەشت، بەڵکو هەموو جوان ئەبنەوەو بە کچی ئەچنە بەهەشت، خوا ئەفەرموێ « انا انشأناهن انشاء فجعلناهن ابكارا عربا اترابا » •

ئنجا باسی ئەندازەی دەستەی لای ڕاست ئەکات لە پێشینانو پاشینان ئەفەرموێ : ( ثلة من الاولين ) دەستەیەکن لە گەلانی پێش ئیسلام ( وثلة من الاخرين )وە دەستەیەکن لە گەلانی موسڵمانانی ئوممەتی محمد (د،خ) •

پێشینانی ئوممەتانی پێشوو لە پێشینانی ئوممەتی محمد زۆرترن دەستەی لای ڕاستی پێشینان وەك دەستەی موسڵمانان وان، واتە هەردووکیان ئێجگار زۆرن •

لە دوای باسی دەستەی یەکەمو دووهەم، ئنجا باسی دەستەی سێهەم ئەکات ئەفەرموێ ( واصحاب الشمال ) دەستەی لای چەپ ( ما اصحاب

في سَمُومٍ وَحَمِيمٍ (٤٢) وَظِلٍّ مِن يَحْمُومٍ (٤٣) لا بارِدٍ وَلَا كَرِيمٍ (٤٤) إِنَّهُمْ كانوا قَبْلَ ذٰلِكَ مُتْرَفِين (٤٥)

لە گڕی ئاگرو ئاوی لە کوڵ (٤٢)و سێبەری دوو کەڵی ڕەشـان (٤٣) نە فێنـکەو نەسوودبەخش (٤٤) چونکە بەڕاستی ئەمانە لە مەپێش زۆر بە نازو نیعمەت بوون (٤٥)

الشمال ) چ ئەحواڵێکی ناخۆشیان بێ ئەم دەستەیە •

ئـەم ئەصحابی شیمالە هـەر هەمان ئەصحابی مەشئەمەیە کـە لـە سەرەتاوە باسی کردن، بەڵام باسی سزاو تۆڵەیانی هەڵگرت بۆ ئێرە کـە ئەفەرموێ ئەم د ستەیە ( في سموم ) لە گڕەی دۆزەخ (وحميم)و ئـاوی لە کوڵ ( وظل من يحموم )و سێبەری دووکـەڵی ڕەش‌و خـەستی دۆزەخان ، کە ئەو سێبەرە ( لا بارد ) نە فێنـکە وەك سێبەرانی‌تر ( ولا كريم )وە نە سوود بەخشە •

ئەم هەموو سزاو دەردی سەری‌یە کە ئەدرێن لە بەر سێ شتە :

یەکەم : ( انهم كانوا قبل ذلك مترفين ) ئەمانە بەڕاستی لە مەپێش لـە نازو نیعمەتێکی زۆرا بوون، لە خواردن‌و خواردنەوەو خانووبەرەو ناو ماڵی چاکی ڕێك‌و پێك، لـە جیاتیی ئەوەی کە سوپاسی خوا بـکەن‌و بی‌پەرستن، کـە چی هاوبەشیان بۆ پەیدا کرد ، وە دارو بەردو زیندوو مردوویان کرد بە هاوبەشی، وە داوای ئەو شتانەیان لێ ئەکردن کە هەر لە خوا داوا ئەکرێ •

وكانوا يُصِرّونَ على الحِنْثِ العَظيمِ (٤٦) وكانوا يَقولونْ أَئِذا مِتْنا وكُنّا تُراباً وَعِظاماً أَئِنا لَمَبْعوثون ؟ (٤٧) أَوَ آباؤُنا الأَوَّلونَ (٤٨)

---

وە درێژەیان بووە لە سەر گوناهە گەورەکە ( کە هاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوا ) (٤٦) وە ئەیانووت : ئایا ئێمە کە مردین‌و بووین بە ئێسکی ڕزیو ، ئایا ئێمە زیندوو ئەکرێینەوە ؟ (٤٧) لەگەڵ باوو باپیرانی پێشینانمان ؟ (٤٨)

---

دووهەم : ( وكانوا يصرون على الحنث العظيم ) ئەوان ئەمانەوە لە سەر گوناهە گەورەکە کە هاوبەش پەیدا کردنە بۆ خوا، کە ئەمەش هەڵوەشاندنەوەی ئەو پەیمانەیە کە خوا لە ئادەمیی وەرگرتووە لە کاتێکا لە پشتی باوکیانا بوون، وەك قورئان بۆمان ئەگێڕێتەوە بە ئایەتی « واذ اخذ ربك من بنى آدم من ظهورهم ذريتهم واشهدهم على انفسهم الست بربكم ؟ قالوا بلى شهدنا »[1] .

سێهەم : ( وكانوا يقولون )وە ئەیانووت ( أئذا متنا وكنا ترابا وعظاما ) ئایا ئێمە کە مردین‌و بووین بە ئێسکی ڕزیو ( أئنا لمبعوثون أو آباؤنا الاولون ) ئایا ئێمەو باوو باپیرانی پێشینانمان زیندوو ئەکرێینەوە ؟ .

---

(١) واتە کاتێك کە پەروەردگاری تۆ هەرچی نەوەی ئادەمیزاد هەیە دەری هێنان لە پشتی باوکیان‌و کردنی بە شاهید لە سەر خۆیان کە ئایا من پەروەردگاری ئێوە نیم ؟ هەموو ووتیان پەروەردگاری ئێمەیت ، وە شاهیدین لە سەر خوایەتیی تۆ .

قُلْ اِنَّ الأَوَّلِينَ والآخِرِينَ (٤٩) لَمجَمْوعونَ اِلى ميقاتِ يَوْمٍ معلوم (٥٠) ثُمَّ اِنَّكُم أَيُّها الضَّالُونَ المكذِّبونَ (٥١) لآكِلونَ من شَجَرٍ من زَقّومٍ (٥٢) فَمالِئونَ مِنها البُطونَ (٥٣) فَشاربون عَلَيهِ مِن الحميم (٥٤)

بڵێ (ئەی پێغەمبەر !) : هەرچی پێشینان‌و پاشینان هەیە (٤٩) هەموو کۆ ئەبنەوە بۆ کاتێکی دیاری کراو لە ڕۆژی زانراوا (٥٠) لە پاشا ئێوە ـ ئەی گومڕایانی بێ‌بڕوایان ـ (٥١) بێ‌گومان لە درەختی زەقنەمووتی (ناو) دۆزەخ ئەخۆن (٥٢) لە برسانا وورگی لێ پڕ ئەکەن (٥٣) ئنجا لە ئاوی لە کوڵی ئەکەن بە سەرا (٥٤)

دوای ئەوەی کە باسی ئەم ئینکارەی کردن ئنجا فەرمان ئەدات بە پێغەمبەر کە قسەکەیان بداتە دواوە فەرمووی ( قل ان الاولين والاخرين ) ئەی پێغەمبەر بڵێ هەرچی پێشینان (و پاشینان ـ م) هەیە (لمجموعون الى ميقات يوم معلوم) هەموو کۆن لە کاتی تایبەتی ڕۆژێکی دیاری کراوا ، کە ئەو ڕۆژە دوایی دنیاو سەرەتای ڕۆژی قیامەتە کە بڕوانەوەی نی‌یە.

ئنجا باسی خواردن‌و خواردنەوەی دەستەی چەپ ئەکات ئەفەرموێ ( ثم انكم ايها الضالون المكذبون ) لە پاشا بە ڕاستی ئێوە ئەی گومڕایانی هاوبەش پەیداکەرانی بێ‌بڕوایان بە ڕۆژی دوایی‌و زیندوو بوونەوە، سزا ئەدرێن لە دۆزەخا، وە خواردنتان لەوێ لە داری «زەقووم» ە وەکو ئەفەرموێ ( لآكلون من شجر من زقوم ) بێ لە درەختی تاڵی زەقوومی ناو دۆزەخ ئەخۆن ( فمالئون منها البطون )وە لە برسانا وورگی لێ پڕ ئەکەن ( فشاربون عليه من الحميم ) ئنجا لە ئاوی تاڵی لە کوڵی بۆگەنی

فَشارِبونَ شُرْبَ الْهیمِ (٥٥) هذا نُزُلُهُمْ یَوْمَ الدین (٥٦) نَحْنُ خَلَقْناكُمْ فَلَوْلا تُصَدِّقون ! (٥٧)

ئەیخۆنەوە بە وێنەی خواردنەوەی تینوو (٥٥) ئەمە میوانداریی ئەوانە لە ڕۆژی سزادا (٥٦)

ئێمە ئێوەمان دروست کردووە ئەی بۆ بڕوا بە دروست کەرەکە ناکەن (کە خوایە ؟ ) (٥٧)

دۆزەخ ئەخۆنەوە بە سەریا ( فشاربون شرب الهیم )بە ڕەنگێك ئەیخۆنەوە لە تینوانا، وەك حوشترانی تینوو کە ئاو ئەخۆنەوەو هەرگیز تیر ئاو نابن تا ئەتەقن، ئەمە خواردنو خواردنەوەتانە، یەکەم جار لە ناو دۆزەخا، وە ئەمە سفرەو خوانێکە کە یەکەم جار بۆتان ئامادە کراوە، وەکو ئەفەرموێ ( هذا نزلهم یوم الدین ) ئەمە میوانداریی ئەوانە لە ڕۆژی سزادا •

لە دوای ئەوەی کە باسی هەر سێ دەستەکەی پێشووی کرد لە گەڵ باسی نازو نیعمەتی نزیکانی بارەگاو دەستەی لای ڕاست ، وە باسی سزاو تاڵاوی دەستەی لای چەپی کرد ، وە فەرمووی ئەم سزاو تاڵاوە کە ئەدرێن لە بەر ئەوەیە کە هاوبەش بۆ خوا پەیدا ئەکەن، وە بڕوایان بە زیندوو بوونەوەو تۆڵەو سزای ڕۆژی دوایی نی یە، ئنجا بەڵگە ئەهێنێتەوە لە سەر خوایەتیی خوا بە دروست کردنتانو ڕۆزیی دانتان بە خواردنو خواردنەوە ئەفەرموێ ( نحن خلقناکم ) ئێمە ئێوەمان بەم جوانیو ڕێكو پێکی یە دروست کردووە، وە خۆتان ئینکاری ناکەن ( فلولا تصدقون ) ئەی بۆچی بڕوا

أَفَرَأَيْتُمْ مَا تُمْنُونَ ؟ ( ٥٨ ) أَنْتُمْ تَخْلُقُونَهُ أَمْ نَحْنُ الخالِقون (٥٩)

ئایا دیتان ئەو دڵۆپە ئاوەی کە ئەیڕیژنە ناو ڕەحمەوە ؟ (٥٨) ئایا ئێوە دروستی ئەکەن (و ئەیکەن بە ئادەمی‌یەکی تەواو ) یا ئێمەین دروست‌کاران ؟ (٥٩)

بە دروست کەرەکە ناکەن کە خوایە، واتە ئەو خوایەی کە ئێوەی یەکەم جار دروست کردووە، وە لە هیچە ئێوەی هێناوەتە دی، دووهەم جار باشتر ئەتوانێ دروستان بکاتەوە، کە واتە با بڕواتان بێ کە ئێمە لە ڕۆژی دوایدا زیندووتان ئەکەینەوە، هەروەها دان ئەنێن بەمەدا کە یەکەم‌جار دروستمان کردوون، ئنجا ئەم بەڵگەیە ئەڵێتەوە بە جۆرێکی‌تر، وە بە درێژتر لە پێشوو ئەفەرموێ ( افرأیتم ما تمنون ) ئایا دیتان ئەو دڵۆپە ئاوەی کە ئەڕژێتە ناو ڕەحمی ئافرتەوە ( ام انتم تخلقونه ) ئایا ئێوە دروستی ئەکەن‌و ئەندازەی ئەگرن‌و نەقشی ئەکێشن‌و ڕەنگی ئەڕێژن بە ئادەمی‌یەکی تەواوی جوانی ڕێك‌و پێکی شەنگ‌و شۆخ ( ام نحن الخالقون )یا ئێمە دروستی ئەکەین ؟ هەموو ئەزانن کە ئێوە دروستی ناکەن، وە نازانن چۆن دروست‌ئەبێ • ئیشی پیاو لە دروست‌کردنی ئەم ئادەمی‌یەدا هەر ئەوەیە کە ئەو دڵۆپە ئاوە بڕژێنێتەناو ڕەحمی ئافرەتەوە، ئیتر ئیشی ئەو پیاوو ژنە تەواو ئەبێ، دوای ئەوە دەستی خوا ئەکەوێتە کار لەو دڵۆپە ئاوەدا •

ئەو ئاوەی کە لە پیاوەوە ئەڕژێتە ناو ڕەحمی ئافرەتەوە لە

نَحنُ قَدَّرنا بَيْنَكُمُ الْمَوْتَ وَما نَحنُ بِمَسْبوقينَ (٦٠) عَلى أَنْ نُبَدِّلَ أَمْثالَكُمْ

ئێمه بڕیاری مردنمان دا له ناوتانا ، وه کەس پێش دەسەڵاتی ئێمه ناکەوێ (٦٠) تا له شوێنی ئێوه چینێکیتر بێنینه جێتان ،

بەك‌چوونه لایا، سێ سەد ملیۆن گیانداری تۆوی « حیوان منوی »ی تیایه، چالاکترینی ئەم سێ سەد ملیۆنه له پێش ئەوانیکەیترا سەر ئەکات به ناوی گەرای ژناو ئەبن به یەك، وه لێرەوه بناغەی ئادەمی‌یەکی تەواو دائەمەزرێ .

ئایا ئەزانن ئەو خوایەی ئادەمی‌یەکی ژیری خاوەن بیری بەرز دروست بکات له دلۆپی ئاوی بێ نرخ، ئەتوانێ ئەو ئادەمی‌یەش به جۆرێکیتر له ڕۆژی دوایدا دروست بکاتەوه دوای ئەوەی که باسی ئەو ڕووبەڕانەی کرد که بەسەر ئادەمی‌دا دێ له پێش بوونیا ، ئنجا باسی ئەو ڕووبەڕانە(١) ئەکات له لەدوای بوونی بەسەریا دێ کەمردنه ئەفەرموێ : ( نحن قدرنا بينكم الموت ) ئێمه بڕیاری مردنمان دا له ناوتانا، بۆ هەریەکێك له کاتی تایبەتی خۆیدا (وما نحن بمسبوقين)وه کەس پێش دەسەڵاتی ئێمه ناکەوێ، واته لەو مردنەی که دامانناوه ڕزگاری نابێ ( على ان نبدل امثالكم ) بۆ ئەوەی دوای مردنتان وێنەی

(١) وشەی ڕووبەڕانه لێرەدا دووجار دووباره بۆتەوه ، له یەکەمیاندا له دەستنووسەکەدا حەوتی (٧) لەژێر ڕێی دووەمدا داناوەو لە دووەمیاندا دای نەناوه . نازانم کامیانه ؟ . (م) .

ونُنْشِئَكُم في ما لا تَعْلَمونَ (٦١) ولَقَدْ عَلِمْتُمُ النَّشْأَةَ الأَولى فَلَولا تَذَكَّرونَ (٦٢)

وە دروستتان بکەینەوە لە چەند پەردەو قۆناغێکا کە هیچی لێ نازانن (٦١) ئێوە بێ‌گومان لە دروست‌کردنی یەکەمی خۆتان تێ‌گەیشتن، بۆ بیرناکەنەوە ؟ (٦٢)

ئێوە بینینە شوێنتان، واتە چینێك لە ئێوە ئەمرێنم‌و چینێکی‌تر لە جیاتی ئەو ئەهێنم بۆ ئاوا کردنەوەی سەرزەوی •

ئەو خوایەی کە مردنی داناوە، هەر ئەو خوایەش ژیانی داناوە، مردنی داناوە تا ئەوی ئەمرێ یەکێکی‌تر بێتە جێی، تا ژیانی دنیا ئەبڕێتەوە، ئەو کاتە ژیانی دوایی دەست پێ‌ئەکات، وەکو ئەفەرموێ ( وننشئکم ) دروستتان بکەینەوە ( في ما لا تعلمون ) لە دنیایەکی‌ترا ـ وەك قیامەت بێ ـ کە ئادەمی هیچی لێ نازانێ ، مەگەر ئەوەندەی کە خوا خۆی خەبەری لێ دابێ، ئنجا دروست کردنی یەکەم چەند ئاسان بوو لە سەرمان ـ وەکو دیتان بە چاوی خۆتان ـ دروست کردنی دووهەمیش هەروا ئاسانە ، بەڵکو ئەمیان ئاسانترە وەك لە سوورەی «روم»دا ئەفەرموێ « وهو الذي يبدأ الخلق ثم يعيده وهو اهون عليه(١) ، ولقد علمتم النشأة الاولى » ئێوە لە دروست کردنی یەکەمی خۆتان تێ‌گەیشتن ، وە بە چاوی خۆتان دیتان، ئیتر بۆ دەمقاڵێ ئەکەن لە دروست کردنی دووهەمتانا؟ ( فلولا تذکرون ) بۆچ بیرناکەنەوەو پەند وەرناگرن ؟•

(١) واتە خوا ئەو خوایەیە کە یەکەم جار خەڵقی دروست کردووە ،

أَفَرَأَيْتُم مَا تَحْرُثُونَ ( ٦٣ ) ءَأَنْتُمْ تَزْرَعُونَهُ أَمْ نَحنُ الزَّارِعونَ ؟ (٦٤)

---

ئایا دیتان ئەو تۆوەی کە ئەی‌چێنن (٦٣) ئایا ئێوە ئەی‌ڕوێنن یا ئێمە ئەی‌ڕوێنین ؟ (٦٤)

---

★ ★ ★

ئنجا بەڵگەیەکی‌تر ئەهێنێتەوە لەو تۆوەی کە ئەکرێن بە ژێر خاکەوەو ئەڕوێن ئەفەرموێ ( أفرأيتم ما تحرثون ) ئایا نابینن ئەو زەوی‌یەی کە ئەیکێڵن‌و تۆی پێوە ئەکەن ، ( أأنتم تزرعونه ام نحن الزارعون ) ئایا ئێوە ئەیروێنن یا ئێمە ئەیروێنین ؟ هەموو ئەی‌بینن بە چاوی خۆتان کە خوا ئەی‌ڕوێنێ، وە ئێوە نازانن چۆن ئەڕوێ، ئیشی کشتیار لە سەوزبوونی کشت‌و کاڵەکەیا هەر ئەوەندەیە کە ئەو زەوی‌یە بکێڵێ‌وتۆوی پێوە بکات، بەمەندە ئیشی ئەو تەواو ئەبێ، دوای ئەوە دەستی خوا ئەکەوێتە کار ، بەم ڕەنگە گڵ خۆراکی خۆی ئەداتێ‌و ئاو تێراوی ئەکات‌و تیشکی ڕۆژ گەرمی دائەهێنێ‌و با ئەی‌بووژێنێتەوەو ئەیخاتە شنە ، ئنجا دانەی ئەو تۆوە ڕێی خۆی ئەگرێ بۆ چاودێریی تەحر «نوع»ە کەی‌و هێنانەوەی جارێکی‌تر بۆجیهان، وە بەوڕێگایەدا

---

= لە پاشا دروستی ئەکاتەوە ، وە دروست کردنەوەکەی ئاسانترە لای خوا چونکە لە سەرنموونەیە ، بەڵام یەکەم جار بێ نموونە بووە • ( بە پێی عەقڵی ئێمە ـ نەك بە پێی عیلم‌و دەسەڵاتی خوا ـ جیاوازی‌هەیە لە نیوان ئیعادە وئیبداع ( دووبارە کردنەوەو داهێنان)دا • مەبەستی شێخ لەم پەراوێزەدا ئەوەیە مـ‌ئەردەڵانی)

لَوْ نَشاءُ لَجَعَلْناهُ حُطاماً فَظَلْتُم تَفكَّهونَ (٦٥) إنّا لمغرَمونَ (٦٦) بَلْ نَحنُ مَحْرومونَ (٦٧)

ئەگەر بمانویستایە ئەمانگێڕا بە پووشی شکاو، ئنجا دەستتان ئەکرد بە قسەی بێهوودە (٦٥) (وە ئەتان ووت) بەڕاستی ئێمە زەرەر مەند بووین (٦٦) بەڵکو ئێمە لە ڕۆزیی بێبەشین (٦٧)

ئەڕوا بە وێنەی ڕۆێنی ژیرێکی دانای ئاگادار بە هەموو قۆناغەکانی ئەو ڕێگایەدا، بە جۆرێك کە هەرگیز هەڵە نەکات، بەڵێ دەستی خوا بە دەستی ئەو دەنکە تۆوەیە، وە هەنگاو بە هەنگاو ئەیبا بەڕێوە، تا ئەیگەیەنێتە قوناغ •

کاتێك کە ئەمە وا بوو ئیتر ئادەمی چیی ڕواندووە ؟ لەمە زیاتر کە زەوی‌یەك بکێڵێ‌و تۆوی پێوە بکات، چی‌تری کردووە؟ ئەمانە هەموو خوا ئەیکات، ئیتر چۆن ئینکاری دەستەڵاتی ئێمە ئەکەن بە سەر زیندوو کردنەوەی ڕۆژی دوایيدا، ئێمە ئەگەر بمانەوێ کشت‌و کاڵەکەتان دوای سەوز بوون‌و بەرز بوونەوەی سیسی ئەکەین‌و ووشکی ئەکەین وەکو ئەفەرموێ ( لو نشاء لجعلناه حطاما ) ئەگەر بمانویستایە ئەمانگێڕا بە گیایەکی ووشکی تێك‌شکاو، یا بە کایەکی بێ‌دان ( فظلتم تفکهون ) ئەو کاتە سەرسام ئەبوون لە کاری خوا، وە بەداخ‌و خەفەتەوە دەستتان ئەکرد بە قسەی بێهوودە، وە ئەتان ووت ( انا لمغرمون ) بێ‌گومان ئێمە زەرەرمەندین، وە تۆوەکەمان‌و ڕەنجەکەمان زەرەری کرد ( بل نحن محرومون ) بەڵکو لە ڕۆزیی ساڵەکەمان بێ بەش‌و نائومێد بووین،

أَفَرَأَيتُمُ الماءَ الذي تَشرَبونَ ؟ (٦٨) ءَأَنتم أَنزَلتُموهُ مِنَ المُزنِ أَمْ نَحنُ المنزِلُونَ ؟ (٦٩) لَوْ نَشاءُ جَعَلْناهُ أُجاجاً

ئایا ئێوە لە هەورەوە ناردووتانەتە خوارەوە ؟ یا ئێمە ناردوومانەتـە خوارەوە ؟ (٦٩) ئەگەر بمانویستایە ئەمان کرد بە ئاوێکی تاڵ

بەڵام خوا بە میهرەبانی خۆی کشتو کاڵەکەتان بۆ پێدەگەیەنێ، تا بـە تەوای بەری خۆی ئەدات •• ئەمە وێنە «صورة» یەکە لە وێنەکانی ژیان کـە دەسەڵاتی خوا هەموو ساڵێك نیشانمان ئەدات، ئیتر ئەبێ لە دروست کردنەوەی ڕۆژی دوایدا چ گرانی‌یەك بێ •

★ ★ ★

ئنجا باسی ئاوی شیرین‌و خۆشیی بارانمان بۆ ئەکات، کـە بە دوای چـەند کردارێـکی سەیر ئەو ئاوە پەیدا ئەبێ ، کە کرداری زینـــدوو کردنەوەی ڕۆژی دوایی لـــەم کردارە سەیرتر نی‌یە، ئەفـــەرموی : ( افرأیتم الماء الذی تشربون ) ئایا دیتـــان ئەو ئاوەی کە ئەیخۆنەوە بۆ لابردنی تینوێتی‌و مانەوەی ژیان، ئایا ئێوە گـەرمیی ڕۆژتان بۆ نارد؟ وە بەو گەرمی‌یە بووبە هەڵمو سەرکەوت بۆ ئاسمان ؟ ئایا ئێوە ئەم پارچـــە هەورانەتان کۆ کردەوە لە ئاسمان‌و لـــە یەکتان‌دان‌و ئاوێتەتان کردن‌و کردتانن بـــە هەوری بارقورس بە ئاو؟ ( أأنتم انزلتموه من المزن ) ئایا ئێوە ئەم ئاوەتان بە باران نارده خوارەوە لە هەور ؟ ( ام نحن المنزلون )یا ئێمـە ناردوومانەتە خوارەوە ؟ ئێوە ئەمانەتان هیچ نەکردووە، بەڵـــکو هەمووی هـەر خوا کردوونی، ئیشی ئێوە هەر ئەوەیە کـــە تینووتان بوو ئاوەکە بخۆنەوە ( لو نشاء جعلناه اجاجا ) ئەگەر بمانویستایە ئەمان کرد

فَلَوْلا تَشْكُرُون (٧٠)

بۆ سوپاس ناکەن ؟ (٧٠)

بە ئاوێـکی شۆرو تاڵ وەك ئاوی دەریا •

تاڵ بوونی ئاوی باران بە پێی ئەو زانیاریانەی ئێستا دۆزراوەتەوە بەم شێوەیە کە کردارێـکی سروشتی (کیمیایی)یە نەك خەرقی عادەیە •

ئاوی باران پاکترین ئاوە، بەڵام دروست بوونی لە هەور وای لێ ئەکات تاڵ ببێ، لـە بەر ئەوەی لـە هەوادا گازی نایتروجین هەیە، بـە ڕێژەی چواربەش لە پێنج بەشی هەوا، ئەم گازە بە هۆی گرە کارەباوەیەك ئەگرێ لە گەڵ ئوکسجینی هەوداو ئۆکسیدەکانی نایتروجین پێك دێنێ کە لە ئاوی بارانەکەدا ئەتوێتەوەو ترشی نتریك پێك دێنێ کـــە ئەبێتـــە هۆی تاڵو ترشی ئاوی بارانەکە •

کە واتــە منەتنانی خوا بە سەرئادەمیدا لەو گوشەیەوەیە کە ئەم هۆیانە بە جۆرێك ئەڕەخسێنێ ئاوی بارانەکە تاڵ نەبێ بۆیە ئەفەرموێ : ( فلولا تشکرون ) بۆ سوپاسی خـوا ناکەن ؟ وە دان نانێن بەوەدا بڵێن : ئەو کەسەی کـــە بتوانێ ئـــەم کردارانە بـــکات، ئەشتوانی مردوو زینـدوو بـــکاتەوە •

★ ★ ★

لـــە دوای باسی دروست کردنی ئادەمی لە دڵۆپی ئاوو، ڕواندنی دانەوێڵە لە ژێر خاکاو، ناردنە خوارەوی ئاوی باران لە هەورەوە، ئنجـا

أَفَرَأَيْتُمُ النَّارَ الَّتِي تُورُونَ (٧١)
ءَأَنتُم أَنْشَأْتُم شَجَرَتَها أَمْ نَحنُ المُنشِئونَ (٧٢)

ئایا دیتان ئەو ئاگرەی کە هەڵی ئەگیرسێنن (٧١)
ئایا ئێوە درەختەکەتان دروست کردووە ( بە جۆرێك کە لە یەکتاندان ئاگربێنن ) یا ئێمە دروستمان کردووە ؟ (٧٢)

باسی ئاگر ئەکات لە درەختێکی تەڕ ئەفەرموێ ( افرأیتم النار التی تورون ) ئایا دیتان ئەو ئاگرەی کە هەڵی ئەگیرسێنین ( ءأنتم انشأتم شجرتها ) ئایا ئێوە درەختەکەیتان دروست کردووە بە جۆرێك کە لە یەکتدان ئاگر بێنن ؟ ( ام نحن المنشئون ) یا ئێمە بە دەسەڵاتی خۆمان وامان دروست کردووە •

دۆزینەوەی ئاگر لە لایەن ئادەمییەوە کارێکی زۆر گەورەو گرنگە لە ژیانی ئادەمیدا ، بەڵکو گەورەترین ڕووداوە کە شارستانێتیی ئادەمی لە دۆزینەوەی ئەوەوە دەست پێ ئەکات (١) • بەڵێ ئادەمی ئاگر هەڵئەگیرسێنێ بە لەیەك خستنی لقی داری «عەفار» لە داری «مەرخ» بەڵام کێ ئەودرەختەی وا دروست کردووە کە ئاگر بێنێ •

(١) بەڕاو بوچوانی من : خوای گەورە کە ئینسانی دروست کرد ئاگرونانو پێداویستەکانی ژیانی پیشاندانو ڕانموونیی کردن بۆ ئەو پێداویستانە ، نەك لە ڕێگای (تجارب)ەوە دۆزرابنەوە ، ناچێتە عەقڵەوە : خوا مرۆڤ دروست بکاو بێداتە دەستی قەدەرو نەیخاتە سەر ڕێگای بەختەوەریی ژیان ! (م) ئەردەڵانی •

دوو درەخت هەن پێیان ئەڵێن «مەرخ»و «عەفار» زۆر لە کۆنەوە مرۆڤ ئەهاتن ئەم دوو دارەیان لە یەك ئەخستو ئاگریان پێ ئەکردنەوە ، بەم ڕەنگە پارچە دارێکیان ئەهێنا لە درەختی عەفارو پارچە دارێکی پانیشیان ئەهێنا ، لە درەختی مەرخ ، لە ناوەڕاستی ئەم دارەیانا چاڵێکیان هەڵئەکەند وە پارچە دارەکەی تریان ئەخستە ناو ئەو چاڵەوە ، ئنجا کوڕێکی گەنج ئەهات دەستی ئەخستە سەر داری عەفارەکە ، وە بە توندی ئەیجووڵاندو ئەیخست لەداری «مەرخ»ەکە ، کە ئەم کوڕە هیلاك ئەبوو یەکێکی‌تر ئەهات ، ئەمیش وەك ئەوی پێشووی ئەکرد ، هەر بەو ڕەنگە تا دارەکە ئاگری ئەگرت •

★ ★ ★

ئەم کردەوەیە زۆر قورس‌و گرانە بە هەموو ماڵێك نەئەکرا، لە بەر ئەوە هەرماڵێك تروسکەی ئاگری بدیایە لە ماڵێکی‌تر ، ئەچوو بزووتێکی لێ ئەخواستن •

ئامازە بۆ ئەم کردەوەیە کراوە (١) کە خوا لە قورئانا لە باسی حەزرەتی مووسادا ــ کە لە دوور ئاگرێکی بەدی کرد ــ ئەفەرموێ : « قال لاهله امکثوا اني آنست نارا لعلکم اتیکم منها بقبس أو جذوة من النار لعلکم تصطلون » (٢) •

بە بۆنەی هەڵگیرساندنی ئاگرەوە جێی بیرکەوتنەوەی ئاگری

(١) لە دەستنووسەکەدا ئاوانووسرابوو : (ئامازە بۆ ئەم کردەوەیەیە ) منوشەی (کراوە)م بۆ زیادکرد (م) •

(٢) واتە حەزرەتی مووسا بە خێزانەکەی ووت : ئێوە لێرە بوێستن من ئاگرێکم بەدی کردووە ، ئەڕۆم شایەد دەنگ‌و باسێك وەرگرم ، یا بۆ گەرم بوونەوەی ئێوە بزووتێك بێنم ئاگری پێ بکەمەوە •

نَحنُ جَعَلْناها تَذْكِرَةً ومتاعاً للمقوين (٧٣)
فَسَبِّحْ باسمِ رَبِّكَ العظيمِ (٧٤)

ئێمە گێڕاومانە بە پەند بۆڕەوتەنی (٧٣)
( ئەی بەندەی بێ ئاگا ) پەروەردگاری گەورەی خۆت بە پاكو تەمیز ڕابگرە (٧٤)

دۆزەخە بۆیە ئەفەرموێ : ( نحن جعلناها تذكرة ) ئێمە ئەو ئاگرەمان دروستكردو گێڕامان بە پەند بۆ ئەوانەی كە بیر ئەكەنەوە ، تا بەم ئاگرە ئاگری دۆزەختان بیر بكەوێتەوە ، ئەو ئاگرەی كە هەمیشە ئێوەم پێ ترساندووە ، وەتێبگەن ئەو كەسەی كە لە دنیادا ئاگری بۆدروست كردوون ، وە زور خزمەتتان ئەكات ، ئەتوانێ لەم ئاگرە ئاگرێكی بەتینترو گەرمتر دروست بكات ، تا لە ڕۆژی دوایدا سزاتانی پێ بدات، (ومتاعا للمقوين) وەگێڕاومانە بە مایەی ژیان بۆ هەموو كەسێك ، نەخوازەلا بۆ ئەوانەی كە لە ڕێو بان چێشتی پێ لێئەنێنو خۆیانی پێ گەرم ئەكەنەوەو شەوی تاریكی پێ ڕووناك ئەكەنەوە •

كاتێك كە ئەم نیعمەتانەی باس كران زۆر بە كەڵك بوون بۆ مەردوم كە واتە ( فسبح بحمد ربك العظيم ) ئەی بەندەی بێئاگا پەروەردگاری گەورەی خۆت بە پاكو تەمیز ڕابگرە ، مناڵو هاوبەشی بۆ پەیدا مەكە ، وە وامەزانە كە دەسەلاتی زیندوو كردنەوەی مردووی نییە •

★ ★ ★

دوای ئەوەی كە چەند بەڵگەیەكی هێنایەوە لە سەر خوایەتیی خواو

فَلا أُقسِمُ بِمَواقِعِ النُّجومِ (۷٥)

سوێند ناخۆم بە شوێنی ئەستێرەکان (۷٥)

ڕاستیی ڕۆژی زیندوو بوونـەوە ، ئنجـا بەڵـگە ئەهێنێتـەوە لـە سـەر پێغەمبەرێتیی پێغەمبەرو ڕاستیی قورئان ، وە سوێندی لە سەر ئەخوات بەو ئەستیرانەی کە هەمیشە ئەیانبینین لـە هـەڵاتن‌و ئاوابوونـا فەرمـووی « فلا اقسم ••• »

باو بووە لە ناو عەرەبا هەرکاتێك یەکێك بیویستایە سوێند بخوات لە سەر شتێکی ئاشکرا کە پێویست بەسوێند نەبوایە ئەیان ووت «لا اقسم» واتە سوێند ناخۆم کە ئەم شتە وایە ، واتە ئەوەندە ئاشکرایە پێویست بـە سوێند ناکات ، هێندی جار کە بیانویستایە سوێند بە شتێکی زۆر گەورەو بەنرخ بخۆن ئەیانووت «لا اقسم» واتە ئەم شتە من بەسوێند پێ خواردنی گەورەی ناکەم ، چونکە خۆی لە خۆیا گەورەیـە ، سوێندی پێ‌بخـۆم یاپێی‌نە خۆم ، وەك لێرەدا کە ئەفەرموێ ( فلا اقسم بمواقـع النجـوم ) سوێند ناخۆم بە جێی هەڵاتن‌و ئاوابوون‌و ڕۆینی ئەستێرە کە گەورەترین نیشانەن لە سەر دەسەڵاتی خوا • ئنجا مەبەستەکە هەرکامێکیان بێ لــە « لا اقسم » هەر سوێند خواردنە لە مانادا •

زانایانی ئاسمان ئەڵێن ئەم هەموو ئەستێرانەی کە بـە ئاسمانـەوەن ـ کە هەزاران ملیۆن‌و بلیۆنن ـ هێندێکیان بە چاو ئەبینرێـن‌و زۆریـان بەڕوانگە نەبێ نابینرێن ، وە زۆریشیان ڕوانـگە نایبینێ بـەڵام هەسـتی

ـ وانَّهُ لَقَسَمٌ ـ لَوْ تَعْلَمونَ ـ عَظيمٌ (٧٦) انَّهُ لَقُرآنٌ كَريمٌ (٧٧)

ئەم سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە (٧٦) ئەم قورئانە نامەیەکی زۆر گەورەو بەفەڕە (٧٧)

پێئەکات ، ئنجا ئەم هەموو ئەستێرانە هەر یەکێکیان بە حساب دانراوە لە شوێنی خۆی ، وە ماوەی بەینی هەموو دوو ئەستێرەیەکیش هەر بە حسابێکی تایبەتی‌یە ، نابێ هیچیان لەو ئەندازەیەی کە هەیە زیادو کەمی ببێ •

هەموو ئەستێرەیەك دوو هێزی هەیە ، یەکێکیان هێزی کێشندەو ئەوی‌تریان هێزی پاڵپێوەنان «دافعە» هەموو ئەستێرەیەك وا دانراوە کە هێزی کێشندەو پاڵ پێوەنانی بە قەد یەك بێ ، وە کار بکاتە سەر هەموو ئەستێرەکانی‌تر ، بەم ڕەنگە ئەم کێشندەی تێکرایی‌یە «جذبي عام» هاتۆتە دی ، وە هەموو ئەستێرەیەك لە سەر چەمەرەی خۆی ئەسووڕێتەوە بێ ئەوەی کە لەو سووڕانەوەدا لە خەتی خۆی دەرچێ ، کە ئەمەیە نهێنی‌و وێستانی بوونەوەر ، بۆیە فەرمووی ( وانه لقسم لو تعلمون عظيم ) ئەم سوێندە ئەگەر بزانن سوێندێکی زۆر گەورەیە • دیارە گەورەیی ئەم سوێندە لە بەر گەورەیی سوێند پێخوراوەکەیە کە شوێن ئەستێرەکانە •

وورد بەرەوە ئەی خوێندەواری بەڕێز لەم ئایەتە پیرۆزە کە چۆن نهێنی وێستانی بوونەوەری کۆ کردۆتەوە لەم دوو ووتەیەدا «مواقع النجوم» واتە سوێند بە شوێنی ئەستێرەکان ( انه لقرآن كريم ) ئەوەی

فِي كِتَابٍ مَكْنُونٍ (٧٨) لَا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ (٧٩)
تَنْزِيلٌ مِنْ رَبِّ الْعَالَمِينَ (٨٠)

لە ناو نامەیەکی شاراراوەدایە (٧٨) دەستی فریشتەی پاکان نەبێ نایگاتێ (٧٩) نێرراوەتە خوارەوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە (٨٠)

کە پێغەمبەر بۆتانی ئەخوێنێتەوە ـ قورئانێکی زۆر گەورەو بەفەڕە ، نە جادووەو ، نە شیعرەو ، نە قسەی پڕوپووچی پێشینانە ، وەك بێبڕواکان ئەڵێن « ان هذا الا أساطير الاولين » وە نەشەیتان بە وەحی بۆی هێناوە وەك ئەڵێن : « تنزلت به الشياطين » ، بەڵکو موعجیزەیەکی عیلمی‌یەو ، مایەی ڕێنموونیی ئادەمی‌یە ، ئەو قورئانە ( في كتاب مكنون ) لە نامەیەکی شاراراوەدایە ـ کە عیلمی غەیبی خوایە ـ بۆی ناردوین ، وە بۆی ئاشکرا کردووین دەستی کەسی ناگاتێ ، وەك ئەفەرموێ ( لايمسه الا المطهرون) دەستی فریشتەی پاکان نەبێ ناگاتە ئەم نامەیە ، وە هەر فریشتەی پاکان ئەتوانن بە سرووش بی‌بەن بۆ پێغەمبەر «درووودی خوای لێ بێ» ( تنزيل من رب العالمين) نێرراوەتە خوارەوە لە پەروەردگاری جیهانیانەوە بۆ دواترینی پێغەمبەران .

بەشی زۆری زانایانی ئیسلام لایان وایە دروست نی‌یە بۆ لەش‌پیس‌و بێ‌دەستنوێژ دەست‌دان لە قورئانەوە ، بەڵام ئیمامی « اعظم » لای وایە کە دروستە ، هەر کامێکیان بێ چاك وایە کە بەدەستنوێژەوە دەستی لێ بدرێ .

سوێند بێ‌خوراو ئەم هەزاران بلیۆن ئەستێرانەن کە بەم ڕێك‌وپێکی‌یە

أَفَبِهذا الحديثِ أنتم مُدْهِنون ؟ (٨١)

ئایا ئێوە بەم قورئانە بێبڕوان ؟ (٨١)

ئەم هاتوچۆیە ئەکەن ، وە هیچیان لە چەمەرەی خۆیان ناچنە دەرەوە •

سوێند لە سەرخوراویش ئەم قورئـانە گەورەیـەیە کـە نەقشەی بوونەوەرە ، بەڵکو زۆر لە بوونەوەر گەورەترە چونکە مەردوم ئـەگەر جارێك دەستەوسان بێ بەرامبەر بە بوونەوەر ، دوو جار دەستەوسـانە بەرامبەر بە قورئـان :

یەکەم : کەس ناتوانێ نامەیەکی وەك قورئان بەو شێوەو ئـاهەنگە دابـنێ •

دووهەم : ئەگەر گیرام(١) داشیءنا ، ناتوانێ ئیخبـار لـە غەیبـەوە بدات وەك قورئان داوێتی ، واتە : سونێد پێخوراوەکەش‌و سـوێند لـە سەرخوراوەکەش هەردووکیان زۆر زۆر گەورەن •

★ ★ ★

دوای ئەوەی کە باسی گەورەیی قورئانی کرد و سـوێندی لەسەر خوارد ، وە فەرمووی ئـەم قورئانە لـە خـوای ئاگاداروخـەبەردارەوە هاتووە ، ئنجـا سەرکۆنەی ئەوکەسانە ئەکات کە ئاگاداریی فەرموودەو فەرمانەکانی ناکەن ، با بە زبانیش بە ئەدەب بن لـە گەڵیـا ، ئەفەرموێ ( افبهذا الحدیث انتم مدهنون ) ئایا ئێوە بەم قورئانەی کە ڕێی ڕاسـتان

(١) لە دەستنووسەکەدا (گیرەم)بوو • (م) •

وَتَجْعَلُونَ رِزْقَكُمْ اَنَّكُمْ تُكَذِّبُونَ (٨٢)
فَلَوْلا اِذا بَلَغَتِ الحُلْقُومَ (٨٣) وانتم حينئذٍ تَنْظُرونَ (٨٤)

وە لەجیاتی سوپاستان بۆ خوا لە سەر ڕۆژیتان فەرموودەی خوا بە درۆ ئەزانن ؟ (٨٢) بۆچی ئێوە لە کاتێکا کە گیانی نەخۆشەکەتان ئەگاتە قورقوڕاگە (٨٣) وە ئێوە لەو دەمەدا تەماشا ئەکەن (٨٤)

نیشان ئەداتو جڵەوگیریتان لێ ئەکات لە گومڕاییو سەرگەردانی بێبڕوان ، بازۆر بە بێ پەردەش نەیکەن ، وە لە پەردەی پرسیارا بڵێن : « أ ئذا متنا وكنا ترابا وعظاما ، أ انا لمبعوثون ؟ او آباؤنا الاولون ؟ » خوا ئەم قورئانەی بۆ ناردوون بە مایەی بڕواو خۆراکی گیانو دڵی ئاد می ، هەر وەك ئاوو کشتو کاڵ مایەی ژیانو خۆراکی جەستەیەتی ، پێویست بوو لە سەرتان کە سوپاسی خوا بکەن ، کەچی لە جیاتی سوپاسی فەرموودەکانی بەدرۆ ئەزانن وەکو ئەفەرموێ ( وتجعلون رزقكم انكم تكذبون ) لە جیاتی سوپاستان لە سەر ڕۆزیی پێدانتان ، فەرموودەی خوا بە درۆ ئەزانن ، واتە بە درۆ زانینی فەرموودەی خواتان داناوە لە جیاتی سوپاس بۆ کردنی، یا کردووتانە بە مایەی مانەوەتان لە جێگا بەرزەکانتانو قازانجو دەستکەوتەکانی جارانتان کە پێی ئەژیان •

ئنجا دوایی سوورەتەکە ئەهێنێ بە باسی مەردوم لە کاتی مردنا ، وە پێیان ئەڵێ : چی ئەکەن لەو دەمەی کە ئەکەونە گیانەڵاو چەناگە کوتان ، و لە سەر دووڕێیانی دنیاو قیامەت ئەوێستنو پشت لە دنیاو ڕوو لە قیامەت وەکو ئەفەرموێ ( فلولا اذا بلغت الحلقوم ) بۆچی ئێوە لە کاتێکا کە گیانی نەخۆشەکەتان ئەگاتە قورقوڕاگە ( وانتم حينئذ تنظرون ) وە ئێوە بە هەمو خەمو خەفەتێکەوە لەو دەمەدا تەماشا ئەکەن وە

وَنَحنُ أَقرَبُ إلَیهِ مِنکُمْ وَلَکِن لا تُبْصِرونَ ( ٨٥ )

وە ئێمە لە ئێوە نزیکترین بە مردۆکە ، بەڵام ئێوە ئێمە نابینن (٨٥)

ئاهو هەناسەی ساردی بۆ هەڵئەکێشن ، وە ئەگەر لێتان وەربگیرێ هەرچێکتان هەیە ئەیدەن بۆ ئەوەی نەخۆشەکەتان چاك ببێتەوە .

لەم کاتەدا کەگیان لە دنیا دەرئەچێ، وە هەرچی هەیە بە جێ ئەمێنێ، وە ڕووئەکاتە عالەمێکی تاریكو نووتەك کە هیچی لێ نازانێ ، وە هیچی بەدەستەوە نی‌یە ، بۆ ئەو ڕۆژەی مەگەر کردەوە نەبێ . ئنجا سا یا باش یا خراپ .

لەم کاتەدا گیانەکەی لە عالەمی ئەولا شت ئەبینێ ، بەڵام ناتوانێ باسی بکات ، لاشە لەوێدا کەوتووە ، دانیشتوان ئەی بینن ، بەڵام نازانن گیانەکەی بۆ کوێ چوو ، وە چی بە سەر هات ؟ .

لێرەدا دەسەڵاتی ئادەمیو زانینی ئەوێستێ ، وە پەردە دائەدرێتەوە لە ناوەندی زیندووەکانو مردووەکەدا ، لێرەدا هەر خوا خۆیو دەسەڵاتی خۆی ئەمێنێ ، وەکو ئەفەرموێ (ونحن اقرب الیه منکم) ئێمە لە ئێوە نزیکترین بە مردووەکەوە ( ولکن لاتبصرون ) بەڵام ئێمە نابینین ـ و لامی ئەم «لولا»یە ووتەی «ترجعونها»یە ، لە دێڕی دوایدا ، واتە ئەگەر ئێوە دروستکەرتان نی‌یە ، وە خۆتان دروستکەرن ، بۆچی گیانی مردووەکانتان ناگێڕنەوە بۆ ناو لاشەکانیان ؟ .

دووبارە ئەم هانە هانەیە ئەڵێتەوە ئەفەرموێ : « فلولا ان کنتم ...»

فَلَوْلا إِنْ كُنْتُمْ غَيْرَ مَدِينِينَ (٨٦) تَرْجِعُونَهَا إِنْ كُنْتُمْ صادِقِينَ (٨٧)

ئنجا ئەگەر (لە لایەن خواوە) بڕیاری مردنتا نەدراوە (٨٦) بۆچی گیانی (مردۆکەتان) ناگێڕنەوە ؟ ئەگەر ڕاست ئەکەن (٨٧)

واتە ئەگەر وەکو ئێوە ئەڵێن نە قیامەت هەیەو نە پرسینەوەو نەسزا ، وە ئێوە سەر بەستو بەرەڵلان ، وە لە لای خواوە فەرمان بەسەرا دراو نین ، وە لە ژێر فەرمانو دەسەڵاتی ئەوا نین ـ مەیەڵن گیانی نەخۆشەکەتان دەرچێ ، وەکو ئەفەرموێ : (فلولا ان كنتم غير مدينين ، ترجعونها ان كنتم صادقين ) ئنجا ئەگەر لە لایەن خواوە بڕیاری مردنتان نەدراوە ؟ بۆچی لە کاتی گیانەڵادا گیانی نەخۆشەکەتان ناگێڕنە دواوە ؟ ئەگەر ڕاست ئەکەن کە ئەڵێن : نە ڕۆژی دوایی هەیەو نە حساب هەیەو نە سزا •

ئنجا کە دەستەوسان مانەوەو هیچتان پێ‌نەکرا نابێ تێ‌بگەنو بزانن کە هەموو کارێك هەر بە دەست خوایە ، وە هەر ئەوە فەرمانڕەوا لەدینو دنیادا ، وە نابێ لێی‌بترسنو لە فەرمانی دەرنەچن ؟ •

دوای ئەوەی کە باسی حاڵی ئادەمی‌یەکی کرد کە لە گیانەڵادابێ ، ئنجا باسی حاڵی ئادەمی ئەکات لە دوای مردنی لە هەر سێ دەستەکەی پێشوو کە لە سەرەتای سوورەتەکەوە باسی کرد بە ئایەتی « وكنتم ازواجا ثلاثة » ئەفەرموێ :

فَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُقَرَّبِينَ (٨٨) فَرَوْحٌ وَرَيْحَانٌ وَجَنَّةُ نَعِيمٍ (٨٩) وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ (٩٠) فَسَلَامٌ لَكَ مِنْ أَصْحَابِ الْيَمِينِ (٩١) وَأَمَّا إِنْ كَانَ مِنَ الْمُكَذِّبِينَ الضَّالِّينَ (٩٢)

ئنجا ئەگەر ئەو مردووە لە نزیکانی بارەگایە (٨٨) ئەوە بۆ ئەو ڕەحەتیو بۆنی خۆشو (مژدەدان بە) بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت (٨٩) وە ئەگەر لە دەستەی لای ڕاستە (٩٠)

بێ زیانی بۆ تۆ (ئەی مردۆکە) تۆ لە یارانی دەستی ڕاستی (٩١) وە ئەگەر لە بێ بڕوایانی گومڕایانە (٩٢)

١ ـ ( فاما ان كان من المقربين ) ئنجا ئەگەر ئەو مردووە لە نزیکانی بارەگایە بەمڕەنگە هەرچی خوا فەرمانی پێداوە کردوونی ، وە هەرچیش جڵەوگیریی لێ کردووە نەی کردوون (فروح) بۆ ئەوە ڕەحەتیو دڵنیاییو حەسانەوە (وریحان)وە بۆنخۆشی (وجنة نعيم)و مژدەدان بە بەهەشتی پڕ لە نازو نیعمەت •

٢ ـ (وا ما ان كان من اصحاب اليمين )وە ئەگەر ئەو مردووە لە دەستەی لای ڕاستە (فسلام لك من اصحاب اليمين ) سەلامەتیو بێزیانی بۆ تۆ ئەی ئەو کەسەی کە لە دەستەی لای ڕاستیت •

٣ ـ ( وا ما ان كان من المكذبين الضالين )وە ئەگەر ئەو مردووە

فَنُزُلٌ مِنْ حَمِيمٍ ( ٩٣ ) وَتَصْلِيَةُ جَحِيمٍ (٩٤) إِنَّ هـــذا لَهُوَ حَقُّ اليَقِينِ ( ٩٥ ) فَسَبِّحْ بِاسْمِ رَبِّكَ العَظِيمِ (٩٦)

میوانداری یەکەی لە ئاوی لە کوڵە (٩٣)و چوونە ناو دۆزەخەوە (٩٤) ئەمـەی (کە لـەم سـوورەتەدا ووترا ) ڕاستو بێگومانە (٩٥) ئنجا (ئەی پێغەمبەر) تۆ بە پـاکی یـادی پەروەردگاری خۆت بکە (٩٦)

لە بێبڕوایانو گومڕایانی ڕێی ڕاستە ( فنزل من حميم ) میوانداری‌یەکەی لە ئاوی لە کوڵی دۆزەخ (وتصلية جحيم)و چوونە ناو دوزەخە (ان هذا) ئەوەی کە لەم سوورەتەدا وتـرا لـە باسی زینـدوو بونـەوەو ئەحـواڵی نزیکانی بارەگاو دەستەی لای ڕاستو دەستەی گومڕایـان ( لهو حـق اليقين ) شتێکی ڕاستو دروستو بێگومانە (فسبح باسم ربك العظيـم ) ئنجا ئەی پێغەمبەر تۆ بە پاکی یادی پەروەردگاری گەورەی خۆت بـکە گوێ مەدەرد بێبڕوایان پێت باوەڕ بکەن یا نەیکەن ئەوی کە لە سـەر تۆ پێویستە هەر ڕاگەیاندنەو هیچی‌تر •

# سورة الحديد

## بسم الله الرحمن الرحيم

سَبَّحَ لِلَّهِ ما في السَّموات والأَرْضِ

## سوورەی (حدید)ە

## مەدەنی‌یە (٢٩) ئایەتە

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

هەرچی لە ئاسمانەکانو زەویدایە هەموو بە پاکی یادی خوا ئەکەن

سوورەی (حدید)ە

مەدەنی‌یە (٢٩) ئایەتە

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان**

( سبح لله مـا في السموات والارض ) هەرچی لـە ئاسمانـەکانو زەویدایە هەموو بە پاکی یادی خودا ئەکەن ، واتە ئەوانـەی کە ژیـرن وەك ئادەمی‌و فریشتە ، خوا بە پاك ئەناسن لە هەموو کەم‌و کوورِی‌یەك ، وە دووری ئەخەنەوە لە هەموو شتێکی وا کە شایستەی ئەو نەبێ ، وەك هاوبەش بۆ پەیدا کردنو ، دانانی فریشتە بە کچـانی ئەوو ، دانـانی « عیسا » بە کورِی ، وە ئەوانەی کە ژیریش نین تەسبیحاتەکەیان دەلالەت

کردنی بوونەکەیانە لە سەر گەورەیی‌و دەسەڵاتی خوا ، ڕامیی «مسخری»و فەرمان بەری‌یانە بۆ خوا •

ئەم دەلاڵەت کردنە وەك ئامازە «ئیشارە» کردنت وایە بە دەست یا بە سەر یا بە چاوو برۆ بە جۆرێکی تایبەتی بۆ یەکێك کە بی‌یەوێ کارێك بکات ، تۆش ئامازەی بۆ بکەیت کە پەلە نەکات‌و تۆزی دان بە خۆیا بگرێ ، دوای ئەوە ئامازەیەکی‌تری بۆ بکەیت بە جۆرێکی‌تر کە کارەکە بکات یا نەیکات ، ئەم دەلاڵەت کردنە لەم دوو کاتەدا هاوڕێکەت تێ‌ئەگەیەنی وەك تێ‌گەیاندنی بە قسە ، بەڵکو باشتر ، تا چەند ئامازەی زۆر هەیە لای ئادەمی بە دەست یا بە سەر یا بەچاوو برۆ ••• کە هەر یەکێکیان جۆرە مانایەکیان هەیە کە مەردوم بە بێ پەردە تێی ئەگەن •

ئنجا لە کاتێکا ئەمە حاڵی ئادەمی بێ ـ کە زانین‌و تێ‌گەیشتنی زۆر کەم‌و کووڕ ، وە لە چەمەریەکی ئێجگار بچکۆلانەدایە ـ ئەبێ ئەوەی کە خوا ئامازەی پێ ئەکات بۆ ئادەمی‌و تێ‌یان ئەگەیەنێ بە ئامازەی جوان‌و پڕمانا لە ئاسمان‌و زەویدا ـ ئەبێ ئەو چۆن بێ ، ئەگەر تۆ ـ ئەی ئادەمی ! ـ بە دڵێکی پاکی ڕووناکی بێ‌گەردەوە وورد ببێتەوە لە هەڵاتن‌و ئاوا بوونی ئەستێرەکان بە ئاسمانەوە لە ئێوارەوە تا بەیانی ، یا وورد ببێتەوە لە مانگ نەخوازەڵا لە شەوی چواردەو پانزەدا ، وە لە تریفە تریفی بە ئاسمانەوە ، کە تارایەکی زیوین ئەدات بە سەر زەویدا ، وە ئەو شەوە تاریکەت بۆ ڕووناك ئەکاتەوە •

یا وورد ببینەوە لە ڕۆژ کە وەك شاهەنشای جیهان هەڵدێ بە هەموو لەشکری شان‌و شکۆهێکی‌یەوە ، وە ڕووناکی‌و گەرمی‌و گەلێ جۆرە

تیشکت بۆ ئەنێرێ ، وە یا ئادەمیو گیان لەبەرانو دارو درەختو گوڵو گوڵزارو گژو گیات بۆ زیندوو ئەکاتەوەو ژیانیان ئەداتێ ـ ئەگەر لەمانە وورد ببیتەوە تێئەگەیت کە هەموو لایەکیان ئەچرپێنن بە گوێچکەتا کە خوایەکی تاكو تەنیای دانای ، ئاگاداری ، ئەندازیاری دەست ڕەنگینی ، بە دەسەڵاتی ، فەرمانڕەوای ، بەخشندەی میهرەبان هەیە ، هەرچی بە تۆو بە زیانی تۆ پێویست بێ هەمووی بۆ دروست کردوویت ، وە ڕۆژێ لە ڕۆژان ـ ئەگەر خۆت ژیرو تێگەیشتوو بیت ـ لە سەر هیچ شتێك بەکت نەکەوێت ، بەڵکو سەڵتەنەتیشی پێوە لێبدەیت •

یا ئەگەر بچیتە ناو باخێکی تێراوی پاراوی پڕ لە گوڵو گوڵزارو لالەزار ئەبینیت وا دەستی پەروەردگار ئارایش ئەدات ، لە لایەکەوە چاوی گوڵاڵە ئەڕێژێ ، لە لایەکیترەوە سووراوی سەر گۆنای گوڵاڵە سوورە ئەکات ، لەلایەکی ترەوە پرچی بنەوشە دائەهێنێو بە شانەی ئەکات ، لەلایەکی کەوە پیاڵەی زێڕینی نێرگس پڕ ئەکات لە ئاوی شەونم ، لە لایەکیترەوە قاڵیی گوڵو نەسرین لە ژێر پێدا ڕائەخات ، وە بۆنی خۆشی عەترو عەبیری بە سەرا ئەڕێژێ •

هەر گوڵێك ئەگەر باش لێی ووردبیتەوە، بێگومان خوای پێ ئەدۆزیتەوە، وە بەزمانی حاڵ بانگت ئەکات بۆ سەجدە بردن بۆ بارەگای خوای گەورە، هەر وا لە هەرگۆشەیەك لە جیهان وورد ئەبیتەوە بە زمانی حاڵ تەسبیحاتی خوا ئەکات واتەگەورەییو دەسەڵاتی خوات نیشان ئەدات، بە ڕاستی قورئانی پیرۆز ڕاست ئەکات کە ئەفەرموێ : « تسبح له ما في السماوات السبع والارض ومن فيهن ، وان

وَهُوَ العَزِيزُ الْحَكِيمُ (١) لَهُ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يُحْيِي وَيُمِيتُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (٢)

وە ئەوزاڵو ڕاست کردارە (١) خـاوەنی **ئاسمانـەکانو زەوی‌یە** زیندوو ئەکاتو ئەمرێنێ ، وە ئەو بە سەر هەموو شتێکا توانایە (٢)

من شيء الا يسبح بحمده ولـكن لا يفقهون تسبيحهم »[١] •

( وهو العزيز )وە ئـەو زاڵە بە سەر هەرشتێکا کـــە بی‌یەوێ،و هەموو شتێك مل‌کەچی فەرمانی ئەوون ( الحكيم ) ڕاست کردارە، واتـە هـەموو شتێکی بـە پێی حیکمەتو فەلسەفەیە ( لـــە ملك السماوات والارض ) خاوەنی ئاسمانو زەوی‌یە، کەس لەم خاوەنداری‌یەدا دمقاڵی لـە گـەڵ ناکاتو بە سـەریا زاڵ نابێ، لـە نیشانەیٔ ئەم خاوەنداری‌یەیە ئەمــە کەمردنو ژیانی داناوە، وەکو ئەفەرموێ ( يحيي ويميت ) زیندوو ئەکاتو ئەمرێنێ، واتـــە ئەندازەی ژیانو مردنی داناوە بۆ هـــەموو زیندەوەرێك ، نە ژیانی زۆرتر ئەبێ لەو ئەندازەیەی کە بۆی دانراوە ، نە مردنی پاشو پێش ئەکەوێ لەو کاتەی کە بۆی دەست نیشان کراوە •

دەسەڵاتی خوا هەر ئەمەندە نی‌یە، بەڵکو لەمە زۆرترو گەورەترە، وەکو ئەفەرموێ ( وهو على كل شيء قدير )وە خوا بە سەر هەموو شتێکا توانایە ، وە هەرچیی ویست ئەبێ ، وە هەرچیشی نەویست نابێ •

---

(١) **واتە هەر حەوت ئاسمانو زەویو هەرچی لە ناویانان هـــەموو بەستایشو پاك ڕاگرتنی خواوە خەریکن ، هیچ شتێك نی‌یە کـــە تەسبیحاتی ئەو نەکات •**

هُوَ الأَوَّلُ وَالآخِرُ وَالظَّاهِرُ وَالْبَاطِنُ ، وَهُوَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ (٣) هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ

---

ئەوە یەکەمین‌و دواهەمین ، وە ئاشکراو پەنهان ، وە ئەو بەهەموو شتێك زانایە (٣) خوا ئەو خوایەیەکە ئاسمانەکان‌و زەویی دروست کردووە لە شەش ڕۆژا ،

---

ئنجا سیفەتێکی‌تری خوا باس ئەکات کە لە سیفەتەکانی پێشووی ووردترە ئەفەرموێ :

( هو الاول ) ئەوە لەپێش هەموو شتێکا ؛ واتە هەر هەبووە ( والاخر ) وە دواترینی هەموو شتێکە کە هیچی لێ دوا ناکەوێ ؛ واتە هەرئەمێنێ، ( والظاهر )وە ئاشکراو نمایانە بە کردەوەو شوێنەوار (اثار)ی (والباطن) وە پەنهان‌و نادیارە، واتە نە بە چاو ئەبینرێ، نەژیریی‌و بیر پەیی پێ ئەبات، بەڵام ئەو هەموو شت ئەبینێ وە ئاگای لە هەموو شتێکە، وەکو ئەفەرموێ : ( وهو بکل شیء علیم ) ئەو بەهەموو شتێك زاناو ئاگادارە •

لە دوای باسی زانایی خوا بە هەموو شتێك، ئنجا باسی گەورەیی‌و دەسەڵاتی ئەکات ئەفەرموێ : ( هو الذی خلق السماوات والارض فی ستة ایام ) خوا ئەو خوایەیە کە ئاسمانەکان‌و زەویی دروست کردووە لە شەش ڕۆژا •

مـــەبەس لـەم ڕۆژانە ڕۆژی ئەمـــڕۆ نی‌یە کەپەیدا ئەبێ لـــە سووڕانەوەی زەوی لە سـەر تەوەرە بە دەوری خۆیا لـە بەر تیشکی ڕۆژ کـە شـەوو ڕۆژێك ئەگرێتەوە، چونـکە ئەو زەوی‌یەی کـــە لە سووڕانەوەی بە دەوری خۆیا شەوو ڕۆژ پەیدا ئەبێ ئەوکاتە نەبووە ، کـە واتە مەبەس لەم شەش ڕۆژە شەش قوناغی تایبەتی‌یە کە بە ســـەر دروست کردنی ئاسمان‌و ز ویدا هاتووە تا گەڕاوون بەم ڕەنـــگە کـە ئێستا هــــەن •

ئەو قوناغەی کـە زەوی‌و ئاسمانەکان بڕیویانە وەك لە تەفسیری «منار»و « مەراغی » دەر ئەکەوێ لە سوورەی «اعراف»دا :

یەکەمیان : ئەوماوەیە بووە کـە زەوی لـە گەڵ ڕۆژو هـەموو ئەستێرەکانا شتێك بوون وەك دووکەڵ کە ئەمڕۆ لـە زمانی علمیدا پێی ئەڵێن «سدیم» کـە قورئان ئاماژەی بۆ ئەکات لە سوورەی « فصلت »دا بە ئایەتی : « ثم استوی الی السماء وهی دخان »(۱) •

زانایان ئەڵێن : ئەو دووکەڵە کـە پێی ئەڵێن «سدیم» پێك‌هاتووە لـە شتی زۆر ووردیلە ووردیلەی ئێجگار زۆر کە هەمووی لـــە جووڵەدا بوون، وە ئەم شتە ووردیلانە کەم کـــەم کۆ بوونەتەوە، وە بوون بـە کۆمەڵ کومەڵ، وەئەم کۆمەڵانەش بەرە بەرە بە یەکەوە نووساوون بـە هۆی هێزی کێشندەوە،وە لە دوای هەزاران هەزار ساڵ لە کۆبوونەوەی ئەم شتە ووردانە کۆمەڵێکی ئێجگار گەورە کۆ بۆتەوە، وە سووڕاوەتەوە

(۱) واتە : لە پاشان خوا ویستی ئاسمان دروست بکات کـــە لـــەو دەمەدا ئاسمان گازێکی تاریك بووە وەك دووکەڵ •

له سەر تەوەرە بە سووڕانەوەیەکی زۆر خێرا، وە لەو سووڕانەوەیەوە ئاگری تێبەر بووە، وە ڕووناکیو گەرمی‌یەکی داوەتەوە، وە ئەم کۆمەڵە گەورەیە کـــە پێی ئەڵێن ڕۆژ .

دووهەم : زەوی لـە گـەڵ ڕۆژو هەموو ئەستێرە گەڕۆکـەکانا پێکەوە بوونو بەیەکەوە نووساوون، لـە پاشـا زەویو هەموو ئەستێرە گەڕۆکەکانی‌تری لێ بچڕاوە، وەك لە سوورەی «انبیاء»دا ئەفـەرموێ : « أولم یر الذین کفروا ان السماوات والارض کانتا رتقا ففتقناهما »(١) .

هەرچی ئەستێرەی ئاسمان هەیە بەم دوو قۆناغە دروست بوون ، زەویش هـەر بەم دوو قۆناغە بووە بە ئەستێرە بۆ ئەوانەی کـــە لـە ئەستێرەیەکی ترەوە تەماشای ئەکەن، بەڵام بۆ ئەوەی کەببێ بە زەویو ئادەمی لـە سـەری بژی ، چـوار قوناغی تری ئەوێ کـــە بە دووقۆناغەکەی‌ترەوە ئەبن بە شەش قۆناغ .

زەوی کاتێك کـە لە ڕۆژ بچـــڕا ئەمیش وەك ڕۆژ گازێـــکی هەڵگیرساو بووە، لـە پاشا بە هەزاران هەزار ساڵ ئەم گازە هەڵگیرساوە بووە بە هەڵم ، چونـکە « ئۆکسجین »و « هایدروجین »و کـە ئاویان لێ دروست ئەبێ لـە بەر سووکیی خۆیان سـەر ئەکەوتن بۆ سـەرەوە، وە لە بەر ساردیی لای ژووروو ئەبوونەوە بە هەڵمو بە باران،بەڵام بارانەکە چـەند هـەزار ساڵێك لـە بەر گڕو کڵپەو بڵیسەی زەوی نەئەگەیشتە سـەر زەوی، بەڵـکو ئەبووەو بە هەڵمو ئەچووەوە بە ئاسمانا تا زەوی

(١) واتە : ئەی بێبڕواینە ! نازانن کە ئاسمانەکانو زەوی یەك کۆمەڵە بوونو لە یەکمان بچڕاندوون .

سارد بۆوە، وە ئاوی باران بەشی زۆری سـەر زەویی داپۆشی، وەك قورئان ئاماژەی بۆ ئەكات بە ئایەتی « وكان عرشه علی الماء »(١) .

لـە پاشا زەوی کـە سارد بووەوە پـەڵە پەڵە ووشکانیی لێ پەیدا بوو، ئنجا بە هەزاران هەزار ساڵ توێکڵێکی قایمی پەیدا کرد لـە گـەڵ تەپۆڵـکەو شاخ بە ڕەنگێکی وا کـە بەرگەی لافاوی گەورەو بوومەلەرزە بگرێ، دوای هەزاران ساڵ، ئنجا چڵە چڵە گیای لێ پەیدا بوو لە گـەڵ خەڵووزی بەردیی « فحمی حجری »و ماسی، دوای ماوەیەکی ئێجـگار زۆر گیـای داری سنەوبەرو وورده گیانداری لێ پەیدا بوو، کە هەموو لـە یەك ئەچوون، دوای ماوەیەکی ئێجگار زۆر گیانداری مەمكدارو ئەو گیاندارانەی کە بە کاری ئادەمی دێن پەیدا بوو، کە زانایان ئەم ماوەیە بە بیست ملیۆن سـاڵ دائەنێن .

زانایانی ڕۆژئاوا ئەڵێن : لـە پاشا زەوی پیرو بێهێزو تەواناتە بێ‌و ئەمرێ، وە لەم بۆشایی‌یە گەورەیەی کە لە ژوور سەرمانەوەیە تەنێزرێ، وەك قورئان ئەفەرموێ « اذا رجت الارض رجا . وبست الجبـال بسا . وكانت هباء منبثا »(٢) .

دوای ئەوەی کە خوا ئاسمانو زەویی دروست کرد، وە لە دوای نەبوون بوونەوەری هێنایە ڕوو، ئنجا خـوا حوکمڕانیی خـۆی ئاشـکرا کرد، وە ئەو دەستوورانەی کە دای‌نابوو لە هەموو بوونەوەرا بەراوردی

(١) واتە لەو ڕوژەدا حوکم ڕانیی خوا بە سەر ئاوا بووە .

(٢) واتە دەمێك کە زەوی هێنرایە لەرزە بـە لەرزینێکی توند . وە شاخەکان وورد کران ڕێزە ڕێزە ، وە بوون بە گەردو چوون بـە ئاسمانا .

ثُمَّ اسْتَوى عَلى الْعَرْشِ ، يَعْلَمُ ما يَلِجُ في الْأَرْضِ ، وَما يَخْرُجُ مِنها

له پاشا له سەر تەختی (حوکمڕانی) جێگیر بوو ، ئەزانێ چی ئەچێ به ناو زەویداو چیی لێ دەرئەچێ ،

کرد، وەکو ئەفەرموێ : ( ثم استوى على العرش ) واته له پاش دروست کردنی ئەم بوونەوەرە گەورەیە ـ که به هەزار ملیۆن ساڵی تیشك ئـەم پەڕو ئەو پەڕی ناکرێ ـ له سـەر تەختی حوکمڕانی جێگیر بوو، واتـه ئاگای له هەموو بوونەوەرەو، دەستی به سەریا ئەڕوات، وە هەموو لـه ژێر دەسەڵاتو چاودێریی ئەوان، کـه واته ئەم ڕسته «جملە»یە بریتی «کنایە»یە لەئاگاداریی‌و دەسەڵاتی خوا به سەر بوونەوەرا ، وە مـانای وانی‌یە کـه له پێش دروست کردنی بوونەوەرا له سەر تەختی حوکمڕانی نەبووە، بەڵێ به ڕێوە بردنی ووڵات لـه دوای دروست کردنی ووڵات دەست پێ ئەکات، که واته مەبەس لەم ئاسمانانە هەموو بوونەوەرە، نەك هەر کۆمەڵەی ڕۆژی[1] ئێمەیە •

ئنجا به کورتی باسی ئاگاداریی خۆی ئەکـات به سەر بوونەوەرا، ئەفەرموێ ( يعلم ما يلج في الارض ) ئەزانێ چی ئەچێ به ناو زەویدا لـه تۆو دانەوێڵەو، ئاوو گەرمی‌و، لاشەی مردوو، هەر وەك ئەزانێ چی لـه ناویا هـەیە ( وما يخرج منها )وە چیشی لێ دەرئەچێ لـه گیاو کشتو

(١) خوا لێخۆشبوو خۆی نووسیبووی : ( ڕۆژیی ) من به سەلیقـەی خۆم کردم به (ڕۆژی) • (م) •

وَمَا يَنْزِلُ مِنَ السَّماءِ ، وَمَا يَعْرُجُ فِيها ، وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَما كُنْتُمْ ، وَاللهُ بِما تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ ( ٤ ) لَهُ مُلْكُ السَّماواتِ وَالأَرْضِ ، وَإلى اللهِ تُرْجَعُ الأُمورُ (٥)

وە چی دێتە خوارەوە لە ئاسمانو چی بۆ سەر ئەکەوێ ، وە لە هەرکوێ‌یەك بن خواتان لە گەڵە ، وە خوا بینایە بە هەرچی بکەن (٤) خاوەندارێتی ئاسمانەکانو زەوی بۆ ئەوە ، وە هەموو کارێك هەر بۆ لای خوا ئەچێتەوە (٥)

کاڵو دانەوێڵەو، میوەو، کانیو نەوت .. ( وما ینزل من السماء )وە چی دێتە خوارەوە لە ئاسمان لە بەفرو بارانو تەرزەو هەورە تریشقەو تیشکی هەمە جۆرەی ڕۆژو، گازو، پارچەی ئەستێرەی کشاو « شهب ونیازك »و فریشتە ، ( وما یعرج فیها )وە چیی بۆ سەر ئەکەوێ لە نزاو پاڕانەوەو کردەوەی بەندەکانو، هەڵمو دووکەڵ ( وهو معکم اینما کنتم ) وە لە هەرکوێ‌یەك بن هەمیشە خواتان لە گەڵە ، ( والله بما تعملون بصیر )وە خوا بینایە بە هەر چی‌ئێوە بیکەن ، وە ئاگای لە هەموو شتێکە کە بە دڵتانا تێ‌پەڕێ ( له ملك السماوات والارض ) خاوەندارێتی هەموو ئاسمانەکانو زەوی بۆ ئەوە ( والی الله ترجع الامور )وە هەموو کارێك هەر بۆ لای خوا ئەگەڕێتەوە ، وە فەرمانی خۆی ئەدات لە ناویانا.

ئنجا خاوەنداریی خۆی بۆ ئاسمانو زەوی جێ گیر ئەکات بە بەڵگەیەکی ڕاستە قینە ، وە بە دەستوورێك کە دایناوە لە سووڕانەوەی

یُولِجُ اللَّیْلَ فِي النَّهارِ ، ویولِجُ النَّهارَ فِي اللَّیْلِ ، وَهُوَ عَلیمٌ بِذاتِ الصُّدورِ (٦) آمِنوا بِاللّهِ وَرَسُولِهِ وَاَنْفِقوا

دەمێك شەو ئەكات بە ناو ڕۆژاو دەمێك ڕۆژ ئەكات بە ناو شەوا ، وە ئەو ئاگادارە بە نهێنیی ناو دڵان (٦) بڕوابێنن بە خواو ڕەوانە کراوی خوا ، وە خەرج بکەن (لەڕێی خوادا)

---

ڕۆژانەو ساڵانەی زەوی ، وە بـە کلایی تەوەرەکەی ئەفەرموێ ( یولج اللیل في النهار ) دەمێك شەو ئەكات بە ناو ڕۆژا لە ئێوارانا لـە شـــەش مانـگەی هاوینو پایزا کەشەو درێژ ئەبێ ، وە هەموو ئێوارانێك شـــەو بە شێك لـە ڕۆژ داگیر ئەكات بۆ خـــۆی ( ویولج النهار في اللیل )وە دەمێك ڕۆژ ئەكات بە ناو شەوا لە بەیانیانا لـە شەش مانـگەی زستانو بەهارا کە ڕۆژ درێژ ئـەبێ ، وە هـەموو بەیانیانێك ڕۆژ بەشێك لە شەو داگیر ئەکـات بۆ خـــۆی ( وهو علیم بذات الصدور )وە ئەو بەنهێنیی ناو دڵان ئاگادارە هەر وەك بە کردەوەی ڕۆژانەیان ئاگادارە •

★ ★ ★

بە سەرەتای ئـــەم سوورەتە لە باسی گەورەیی‌و دەسەڵاتو تاكو تەنیایی خوادا زۆر دڵی ڕەقو تەقی هێنایە لەرزە، بە جۆرێك کە ئامـادە بێ بۆ وەرگرتنی هێندێ فەرمانانی قورس‌و گران لە بڕواهێنانو بەخت کردنی ماڵو دارایی لە ڕێی خوادا ، فەرمووی : ( آمنوا بالله ورسوله ) بڕوا بێنن بە خواو بە ڕەوانە کراوی خوا کە پێغەمبەرە (د،خ) (وانفقوا)وە

مِمَّا جَعَلَكُمْ مُسْتَخْلَفِينَ فِيهِ،فَالَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَأَنْفَقُوا لَهُمْ أَجْرٌ كَبِيرٌ (٧) وما لَكُمْ لا تُؤْمِنونَ بِاللهِ ، والرَّسولُ يدعوكم لِتُؤْمِنوا بِرَبِّكُمْ

لەو دارایی‌یەی کە خوا ئێوەی کردووە بە جێ‌نشینی پێشینان تیایدا، ئنجا ئەوانەتان کە بڕوای هێناوەو دارایی‌یان بەخت کردووە پاداشی گەورەیان بۆ هەیە (٧) ئێوە بۆ بڕوا بە خوا ناهێنن ؟ لە کاتێکا کە پێغەمبەر بانگتان ئەکات بۆ بڕوا هێنان بە پەروەردگارتان ،

بەخت بکەن لە ڕێی خوادا ( مما جعلکم مستخلفین فیه ) لەو دارایی‌یەی کە خوا بە سپاردە «امانة» داوێتیە دەستتان، واتە ئەو دارایی‌یەی کە هەتانە ماڵی‌خوایە، وەك لە سەرەتای ئەم سوورەتەوە فەرمووی «له ملك السماوات والارض » داوێتیە دەستتان بە سپاردە کە بۆخۆتانو ماڵو منالّتانی لێ خەرج بکەن بە بێ ئیسراف، وە لە ڕێی حەلالاً ، وە ئەویکەی تری لە ڕێی خوادا بەخت بکەن •

ئنجا هانە هانەی مەردوم ئەدات لە سەر ئەم بڕواو ماڵ خەرج کردنە ئەفەرموێ ( فالذین آمنوا منکم ) ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە لە ئێوە ( وانفقوا )وە ماڵی خۆیان بەخت کردووە بەزەکاتو دەست گیرۆیی هەژاران ( لهم اجر کبیر ) بۆ ئەوان هەیە لای خوا پاداشی گەوە •

ئنجا سەرکۆنەی ئەوانە ئەکات کە بڕوا ناهێنن لە گەڵ ئەوەی کە هەرچی بەهانەو بیانووش بێ بە دەستیانەوە نی‌یە، ئەفەرموێ ( ومالکم لا تؤمنون بالله ) ئێوە بۆ بڕوا بە خوا ناهێنن ؟ ( والرسول یدعوکم لتؤمنوا بربکم ) لە کاتێکا کە ڕەوانە کراوی خوا ــ کە پێغەمبەرە ــ لە

وَقَدْ اَخَذَ مِیثَاقَکُمْ اِنْ کُنْتُمْ مُؤْمِنِینَ (٨) هـو الـذی یُنَزِّلُ عَلی عَبْدِهِ آیاتٍ بَیِّنَاتٍ لِیُخْرِجَکُمْ مِـن الظُّلُماتِ الی النُّـورِ ،

---

وە خواش بێگومـان پەیمـانی بڕوای لێ وەرگرتـوون ، ئەگـەر باوەڕدارن (بەم پەیمانە) (٨) خوا ئەو خوایەیە کە ئەنێرێ بۆ بەنـدەی خۆی (کە محمدە) ئایەتانی ڕۆشنی قورئـان تـا بتانهێنێتـە دەرەوە لـە تاریکستانی ( نادانیو گومڕایی ) بۆ ناو ڕووناکی ،

---

ناوتانایەو بانگتان ئەکات بۆ بڕواهێنان بە پەروەردگارتان، ( وقـــد اخـذ میثاقکم )وە خواش بە ڕاستی پەیمانی لێ وەرگرتوون بەو بەڵــگانەی کـە بۆی داناوون لە سەر تاکو تەنیایی خوا لـە بوونەوەرا، وە لە خودی خۆتانا ( ان کنتم مؤمنین ) ئەگـەر بڕوادارن بە دەلیلی عەقڵیو نەقڵی ، واتە خوا پێغەمبەری بۆ ناردوون لە خۆتان بە بەڵگەو نیشانەی زورەوە ، وە پەیمانی لێ وەرگرتوون کە بڕوا بێنن بە خوا بە هۆی ئەو ژیری‌یەی کە بە سروشت داوینێ کە چەوتو ڕاستو پاکو پیسی پێ جیائەکەنەوە ، وە بەو ئایەتانی بوونەوەری‌یەی کە لە قورئانا بۆی باس کردوون •

ئنجا خوا منەت ئەنێ بە سەرمانا بە ڕەوانە کردنی حەزرەتی محمد، وە ئاماژە ئەکات بە گرنگیی ئەم پێغەمبەرە، ئەفەرموێ ( هو الذی ) خـوا ئەو خوایەیە ( ینزل علی عبده ) کـــە ئەنێریتە خوارەوە بە سرووش بۆ بەندەی خۆی کـــە پێغەمبەرە ( آیات بینات ) ئایەتانی ڕۆشنانی قورئان ( لیخرجکم من الظلمات الی النور ) تا ڕزگارتان بـکات لـە تاریکستانی

وَاِنَّ اللّٰهَ بِكُمْ لَرَؤُوفٌ رَحيمٌ (٩) وَمَا لَكُمْ اَلاَّ تُنْفِقوا في سَبيلِ اللّٰهِ ؟ وَلِلّٰهِ ميراثُ السَّماواتِ وَالأَرْضِ

وە بەڕاستی خوا دەربارەی ئێوە میهرەبانە (٩) ئەوە چیتانە کە وا هیچ بەخت ناکەن لە ڕێی خوادا ؟ لە کاتێکا (کە ئێوە ئەمرن‌و) کەلەپووری ناو ئاسمانەکان‌و زەوی بۆ خوائەمێنێتەوە

نادانی‌و گومڕایی بۆ ڕووناکـایی زانین‌و بڕوا ( وان الله بـکم لرؤوف رحیم)وە بە بێ‌گومان خوا دەربارەی ئێوە بە ڕەحم‌و میهرەبانە کە ژیریی‌و بیری داونێ تاوورد بنەوە لە خۆتان‌و دەورو بەرتان •

دوای ئەوەی کە سەرکۆنەی کردن لـە سەر بڕوا نەهێنان، ئنجـــا سەرکۆنەیان ئەکات لـــە ســـەر ڕژدی‌و چرووکی‌و دەستقووچان‌و ئەفەرموێ : ( ومالکم الا تنفقوا في سبیل الله ) ئەوە چیتانە کـە وا هیچ بەخت ناکەن لـە ڕێی خوادا ؟ ( ولله میراث السماوات والارض ) لـــە کاتێـکا کـە هەموو ئەمرن، وە خـــوا ئەبێ بە کەلەپوورگر «وارث»ی هەموو دانیشتوانی ئاسمانان‌و زەوی، واتە ئێوە ئەمرن وە دارایی‌کەتان لە پاش بەجێ ئەمێنێ، ئنجا سا یا کەستان نی‌یەو دارایی‌یەکەتان بێ‌خـاوەن ئەمێنێتەوە ، وە یا کەستان هـەیە بەڵام لە پاش چـــەند چینێك ئەوانیش دوابڕاو ئەبن‌و دارایی‌یەکەتان بێ‌کـەس ئەمێنێتەوە ، ئنجـــا ئەگـــەر دارایی‌یەکەتان بـــە سەرێنیی خۆتان بەخت بـــکەن لە ڕێی چاکـــەو

دەستگیرۆیی‌و بڵاو کردنەوەی ئایینی ئیسلاما قازانج ئەکەن، وە تووشی پاداشی گــەورەی ڕۆژی دوایی ئەبن، وە ئەگــەر بەختی نەکەن لـەو رێــگایەدا، دوای مردنتان ماڵەکـــەتان ئەڕوات بێ ئەوەی لـــە ڕۆژی دوایبدا بەهرەیەکی لێوەرگرن •

« سید قطب » « •• ئەفەرموێ ئەم سوورەتە ـ وەك دەرئەکەوێ لە شێوەکەیەوە ـ لە ناوەندی ساڵی چوارەمی کۆچی‌و دوای گرتنی شاری مەککە هاتۆتە خوارەوە بۆ چارە کردنی بارێـکی تازە کە ڕووی داوە ، ئەویش ئەمە بووە کە لە وە پێش کۆچکەران‌و یارمەتی‌دەران لــــە ڕێی خواو ئیسلامەتیدا سەروماڵی خۆیان بەخت ئەکرد، وە لە داراییەکەیان بەشی ژیانی خۆیانیان لێ گل ئەدایەوە، وە ئەویکەی تریان هەموو لـەو ڕێیەدا دائەنا لە بەردەمی پێغەمبەرا، با بە دیمەن کەمیش بووبێ، بەڵام ئەوی ئەیاندا بە خوا لە چاو داراییەکەیانا ئێجگار زۆر بووە » •

لەم پێنج شەش ســـاڵەدا مسڵمانەکان زۆر بوون، نەخوازەڵا دوای گرتنی شاری مەککە کــە لەهەموو لایەکەوە دەستە دەستە خەڵك ئەهاتن‌و مسڵمان ئەبوون، ئەم مسڵمانانە چونــکە وەك کۆچکەران‌و یارمەتی‌دەران دڵ‌گەرم‌و سەرگەرم نەبوون لــە دارایی خــەرج کردن‌و سەردانان لــە ڕێی ئیسلامەتیدا ، خوا بەم سوورەتە بانــگی ئەم تازە مسڵمانانەی کرد زۆر بە گەرم‌و گوڕی بۆ دارایی بەخت کردن‌و سەردانان لە ڕێی خواو بەرز کردنەوەی ئایینی ئیسلاما •

ئنجا بەراوردێك ئەکات لــە ناوەندی ئەوانەی کە لە پێش گرتنی شاری مەککەدا یارمەتی ئیسلامیان داوە‌و ئەوانەی لـــە دوای مەکــکە

لا يَسْتَوِي مِنكُمْ مَنْ أَنفَقَ مِن قَبْلِ الفَتْحِ وَقَاتَلَ ، أُولَئِكَ أَعْظَمُ دَرَجَةً مِنَ الذِينَ أَنفَقُوا مِن بَعْدُ وَقَاتَلُوا ،

وەك یەك نین ئەوانەتان کە لە پێش گرتنی «مەککە»دا ماڵی خۆیان بەخت کردو جەنگین ، ئەوانە پلەو پایەیان گەلێك گەورەترە لەوانەی کە لە دوای گرتنی مەککە جەنگینو دارایی‌یان بەخت کرد ،

یارمەتی‌یان داوە ئەفەرموێ : ( لا یستوی منکم من انفق من قبل الفتح وقاتل ) ئەو مسڵمانانەی کە لە پێش گرتنی مەککەدا دارایی خۆیان بەخت کردو لە ڕێی خوادا جەنگین، نابن بە هاوتای ئەوانەی کە لە دوای گرتنی مەککە دارایی خۆیان بەخت کردو جەنگین، چونکە پێش گرتنی مەککە مسڵمانەکان زۆر کەمو زەبوونو دەست‌کورت بوون ، هەموو دەرگایەکیان لێ داخرا بوو، تەنها دەرگای لای خوا نەبێ، وە هیچ پشتیوانێکیان نەبوو تەنها خوا نەبێ، وە هیچ هیوایەکیان نەبوو تەنها بە خوا نەبێ، لە بەر ئەوە هەر یارمەتی‌یەکیان دابێت هەر بۆ خواو لە ڕێی خوادا بووە، کەمی ئەوان لە زوری ئەمان لای خوا گرنگتر بووە ، بەڵام دوای گرتنی مەککە پێغەمبەرو مسڵمانەکان سەرکەوتن ، وە ئیسلامەتی بلاّو بۆوە بە هەموو عەرەبستانا ، وە مەردوم دەستە دەستە ئەهاتنو مسڵمان ئەبوون ، لە بەر ئەوە فەرمووی : (اولئك) ئەوانەی کە لە پێش گرتنی مەککەدا دارایی خۆیان بەخت کردو (اعظم درجة) پلەو پایەیان گەورەترە (من الذین انفقوا من بعد وقاتلوا) لەوانەی کەلە دوای گرتنی مەککە دارایی خۆیان بەخت کردو جەنگین •

وَكُلاًّ وَعَدَ اللهُ الحُسْنى ، واللهُ بِما تَعْمَلونَ خبيرٌ ( ١٠ )
مَنْ ذا الَّذى يُقرِضُ اللهَ قَرْضاً حَسَناً فَيُضاعِفَهُ له ؟ وَلَهُ أَجْرٌ كَرِيمٌ (١١)

وە بە هەردوولا خوا بەڵێنی باشی داوە ، وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن (١٠)
کێیە ئەو کەسەی قەرز بدات بە خوا بە قەرزێکی باش تا خوا بەزیادەوە بیداتەوە ؟ وەبۆ ئەوە پاداشی سوودمەند (١١)

بەڵێ ئەم دوانە نابن بە یەك وە پایەی یەکەمیان گەلێ بەرزترە لە پایەی دووهەم ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشا هەردوولا بە بەهەشت پاداش ئەدرێنەوە ، وەکو ئەفەرموێ : (وكلا وعد الله الحسنى) هەردوولا خوا بەڵێنی پاداشی پێداوون ، وە پاداشی هەردوو لایان ئەداتەوە بە باشی ، بەڵام پاداشی یەکەمیان بە گەورەتر (والله بما تعملون خبير) وە خوا ئاگادارە بەوەی کە ئەیکەن •

ئنجا بە شێوەیەکی بەتینترو گەرمو گوڕتر داوای دارایی بەخت کردن ئەکات لە ڕێی خوادا ئەفەرموێ : (من ذا الذي يقرض الله قرضا حسنا ) کێیە ئەو کەسەی قەرز بدات بە خوا بە قەرز دانێکی باش ، واتە ماڵی خۆی بەخت بکات لە ڕێی خوادا ، بەم ڕەنگە منەت نەنێ بە سەر ئەو کەسەی کە خێرەکەی پێ ئەکات ، وە بۆ خواو لە ڕێی خوادا بیدات ، وە لە ماڵی حەلاڵ ، وە بە دزییەوە بیدات تا هەژارەکە تەریق نەبێتەوە ( فيضاعفه له ) تا خوا زۆر بە زیادەوە بیداتەوە ، وە پاداشی بێبڕانەوەی پێ ببەخشێ ، وەکو ئەفەرموێ : (وله أجر كريم ) وە بۆ

يَومَ تَرى المُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ يَسْعى نورُهُم بَيْنَ أَيْديهِم وَبِأَيْمانِهِم بُشراكُمُ اليَوْم : جَنّاتٌ تجرى مِن تَحتِها الانهارُ خالِدينَ فيها ، ذلك هُوَ الفَوزُ العَظيمُ (١٢)

( ئەم پاداشەیان کە زیاد ئەکرێ ) لە ڕۆژێکایە کە تۆ پیاوانو ژنانی بڕوادار ئەبینیت کە ڕووناکیی (بڕوایان) لە بەردەمیانەوەو لە لای ڕاستیانەوە ئەڕوات (پێیان ئەووترێ) مژدەی ئێوە لەم ڕۆژەدا چوونە ناو بەهەشتانێکە کە جۆگە ئاو ئەڕوات بە بنکیانا ، تیا ئەمێننەوە بە ئێجگاری، هەر ئەوەیە مەبەستی گەورە (١٢)

ئەوە پاداشی سوودمەند •

دوای ئەوەی کە فەرمووی ئەوانەی کە لە ڕێی خوادا دارایی خۆیان بەخت ئەکەن خوا پاداشیان ئەداتەوە بە زیادەوە ، ئنجا باسی ئەو ڕۆژە ئەکات کە پاداشی بڕواادارانی تیا زیاد ئەکرێ ، ئەفەرموێ ( یوم تری المؤمنين والمؤمنات ) پاداشەکەیان زیاد دەکرێ لە ڕۆژێکا ــ کە ڕۆژی دوایی‌یە ــ کە پیاوانو ژنانی بڕواداران ئەبینیت ( یسعی نورهم بين أيديهم وبايمانهم) نووری بڕواو ڕێنموونی‌یان ئەڕوات لە بەردەمیانو لای ڕاستیانەوە ، وە ڕێگای بەهەشتیان بۆ ڕووناك ئەکاتەوە ، ئنجا لەو کاتەدا فریشتە بانگیان ئەکەنو پیان ئەڵێن ( بشراكم اليوم ) مزدەی ئێوە لەم ڕۆژەدا (جنات تجری من تحتها الانهار ) چوونە ناو بەهەشتێکە کە جۆگە ئاو ئەڕوات بە بنکی دارو درەختو باخاتیا (خالدين فيها) تیا ئەمێننەوە هەتایە (ذلك) ئەو نوورە کە لە ڕۆژی دوایيدا لە بەردەمیانەوە ئەڕوات وە ئەومانەوەیەیان لە بەهەشتا بە ئێجگاری (هو الفوز العظيم) هەر ئەوەیە مەبەستی گەورە •

يَومَ يَقولُ المُنافِقونَ والمُنافِقاتُ لِلَّذينَ آمَنوا انظُرونا نَقْتَبِسْ مِنْ نُورِكُمْ ، قيلَ ارْجِعوا وَراءَكُمْ فَالتَمِسوا نورا ،

ڕۆژێ پیاوانو ژنانی ناپاك ئەڵێن بەوانەی کە بڕوادار بوون : تەماشایەکمان بکەن تا لە ڕووناکیتان بەشێك وەرگرین ، ووترا : بگەڕێنە دواوە بۆ دنیا ، وە (ئێوەش) ڕووناکی بۆ خۆتان پەیدا بکەن ،

دوای باسی ئەحواڵی بڕواداران لە ڕۆژی دوایـدا ، ئنجا باسی ئەحواڵی ناپاکان ئەکات ، ئەفەرموێ ( یوم یقول المنافقون والمنافقات) ئەو ڕۆژەی کە پیاوانو ژنانی ناپاك ئەڵێن ( للذین آمنوا ) بەوانەی کە بڕوایان هێناوە ( انظرونا ) تەماشایەکمان بکەنو ئاوەڕێکمان لێ بدەنەوە ( نقتبس من نورکم ) تا لە نووری ڕووناکی ڕوخسارو ناوچەوانتان ئێمەش توزێك نوور وەربگرین ، بەڵام ناپاکان چۆن بەهرەمەند ئەبن لە ڕووناکیی بڕواداران ؟ لە کاتێکا کە ناپاکان هەموو ژیانیان هەر لە تاریکیی بێبڕواییو گومڕایدا بردۆتە سەر (قیل) ووترا ، واتە بڕواداران پێیان ئەڵێن (ارجعوا وراءکم) بگەڕێنە دواوە بۆ دنیا (فالتمسوا نورا) وە ئێوەش وەك ئێمە ڕووناکیو نوور بۆ خۆتان پەیدا بکەن ، بە بڕواهێنانتانو کردەوەی باشتان واتە خۆ ناتوانن بگەڕێنەوە بۆ دنیا ، کە واتە ڕووناکیو نوورتان دەست ناکەوێ ، دوای ئەوە خێرا بڕوادارانو ناپاکان لە یەك جیا ئەکرێنەوە تا ئەوڕووناکی‌یەی ناوچەوانی مسڵمانانەشیان لێ وون بێ ،

فَضُرِبَ بَيْنَهُمْ بِسُورٍ لَهُ بابٌ باطِنُهُ فِيهِ الرَّحْمَةُ وَظاهِرُهُ مِن قِبَلِهِ العذابُ (۱۳) يُنادونَهم : أَلَمْ نكن مَعَكُم ؟ قالوا بَلى ولكنّكُمْ فَتَنْتُم أَنفُسَكُم ،

( لەو دەمەدا ) خێرا ڕاكێشرا شوورەیەك كە دەرگایەكی تیایە ، دیوی ناوەوەی میهرەبانیو دیوی دەرەوەی ڕووی لە سزایە (۱۳) ناپاكەكان بانگی بڕوادارەكان ئەكەن (ئەڵێن) : ئایا ئێمە لەگەڵ ئێوەدا نەبووین ( لە نوێژو ڕۆژوودا ) ئەڵێن : بەڵێ لە گەڵمانا بوون ! بەلام ئێوە خۆتان فریبدا

وەكو ئەفەرموێ (فضرب بینهم بسور له باب) خێرا شوورەیەك ڕاكێشرا لە ناوەندی بڕواداران‌و ناپاكانا كە ئەو شوورەیە دەروازەیەكی تیایە ، بڕوادارانی لێ ئەچنە ژوورەوە بۆ بەهەشت (باطنه) دیوی ناوەوەی (فیه الرحمة) پڕە لە ڕەحمەت‌و میهرەبانیی خوا ، چونكە نزیكە لە بەهەشتەوە (وظاهره) وە دیوی دەرەوەی (من قبله العذاب) ڕووی لە دۆزەخ‌و سزایە ، ئنجا لەو دەمەدا كە بڕوا داران‌و ناپاكان لە یەك جیا ئەكرێنەوە (ینادونهم) ناپاكەكان بانگی بڕوادارەكان ئەكەن ، ئەڵێن : ( الم نكن معكم ؟ ) ئایا ئێمە لە دنیادا لەگەڵ ئێوەدا نەبووین ، هەموو بەیەكەوە نوێژمان نە ئەكرد بە جەماعەت ؟ وە لە گەڵتانا نەئەوێستاین لە كێوی «عەرەفات» لە حەجا ، وە لە گەڵتانا غەزامان نە ئەكرد؟ ئێستا بۆچی ئێوە جیا ئەكرێنەوە لە ئێمە ؟ ئنجا بڕوادارەكان وەلامیان ئەدەنەوە ، وەكو ئەفەرموێ (قالوا بلی) بەڵێ بە دیمەن لە گەڵمانا بوون ، (ولكنكم فتنتم انفسكم ) بەلام نەفسی خۆتانتان فریبدا وە لە ڕێی ڕاست لاتاندا (۱)

(۱) واتە ئێوە لەو كردارو ڕەفتارەتاندا ڕاست نەبوون بە دڵسۆزی‌و =

وَتَرَبَّصْتُمْ وَارْتَبْتُمْ ، وَغَرَّتْكُمُ الأَمانِيُّ حَتَّى جَاءَ أَمْرُ اللهِ وَغَرَّكُم بِاللهِ الغَرورُ (١٤) فَالْيَومَ لا يُؤخَذُ مِنكُمْ فِدْيَةٌ وَلا مِنَ الَّذينَ كَفَروا ،

---

وە چاوەڕوانی لە ناوچوونتـان ئـەکرد ، وە گومانتـان بوو لـەم ڕۆژەدا ، وە هەواو ئارەزووی نەفس فریبی‌دان ، تا فەرمانی خوا هـات (و ، مردن یەخەگیرتان بوو)وە (شەیتان) فریبی دان بە خـوای بووردە (١٤) ئەمڕۆ هیچ وەرناگیرێ نە لەئـێوە ، وە نـە لـە بێبڕوایـان بـۆ ڕزگاربوونتان ،

---

(وتربصتم) وە چاوەڕوانی ئەوەتان ئەکرد کە ئێمە لـە نـاو بچـین ، وە هاوبەش پەیداکەران بەسەرمانا زاڵ ببن‌و لە ناومـان ببـەن (وارتبتـم) وە گومانتان بوو لە زینـدوو بوونـەوەی ئـەم ڕۆژە (وغرتـکم الامـانی) وە ئارەزووی دنیا فریبی دان ، وە ئەتان ووت : خوا لێمان خـۆش ئـەبێ‌و سزامان نادات (حتی جاء امر الله) تا فەرمانی خوا هات‌و مردن یەخەگیرتان بوو ، وە دنیاتان بە جێهێشت بێ ئەوەی بڕوایـەکی بەڕاسـتی تیـابینن‌و کارێکی باشی تیابکەن بۆ خوا (وغرکم بالله الغـرور) وە هـەواو هەوەس فریبی دان بە خوای میهرەبانی بووردە (فالیوم) ئەمڕۆ دەرچوونتان نی‌یە، وە حاڵی ئێوەو بێبڕواکان وەك یەکە وەکو ئەفەرموێ (لایؤخذ منکم‌فدیة ولا من الذین کفروا) فدیە وەرناگیرێ نە لە ئێوەو نە لە بێبڕوایان بـۆ ڕزگار بوونتان ، چونکە هەلتان لە دەست دەرچوو، وە وەخت بە سەرچوو

---

= ئیخلاصەوە نەچووبوونە ژێر ئەو بیرو بڕوایەتانەوە ، تـا نەفسی خۆتان بە هیلاك برد · (م) ·

مَأْواكُمُ النَارُ هي مَوْلاكُمْ وَبِئْسَ المَصيرُ (١٥) أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذينَ آمَنوا أنْ تَخشَعَ قُلوبُهُمْ لِذِكرِ اللهِ وما نَزَلَ مِنَ الحَقِّ ،

جێتان ئاگری دۆزەخە ، ئەو ئاگرە شایستەتانە وە قوناغێـکی بەدە (١٥) ئایا کاتی ئەوە نەهاتووە بۆ بڕواداران کە دڵیان بترسـێ بە یـادی خواداو ئەو قورئانەی کە لەخواوە هاتۆتە خوارەوە ؟

(مأواكم النار) جێتان ناو ئاگری دۆزەخە (هي مولاكم) ئەو ئاگرە بۆ ئێوە لە هەموو شت شایستەترە (وبئس المصير) وە دۆزەخ قوناغێـکی ئێجـگار بەدە کە وا بۆی ئەچن •

★ ★ ★

ئەگێڕنەوە ئەڵێن : هاوڕێکانی پێغەمبەر تا لـە مـەککە بـوون زۆر ئەترسان لە بێبڕواکان ، وە زۆر دەست کورت بوون ، وە ژیانیان ژیانێکی زۆر زبرو کەمو کووڕ بوو ، بەڵام کە کوچیـان کرد بـۆ مەدینــە ، وە بوون بە برا لەگەڵ یارمەتی دەرانا ، وە دەستیان کرد بە هەڵسوورانو کسبو کار ، تۆزێ بووژانەوە ، وە ژیانیان لەزبری‌یەوە بووبە نـەرمو شلیو ، ماڵیان لە ساردو سڕی‌یەوە بووبە گەرمو گوڕ ، بـەم بۆنەیـەوە کەمێك سارد بوونەوە لە شەونوێژو خوا پەرستیو دەوری قورئانو یادی خواو خێرو ئیحسان ، ئنجا بەم بۆنەیەوە ئەم چەند ئایەتە هاتە خوارەوە بۆ ئەوەی بیانخاتەوە گەڕ فەرمووی ( ألم يان للذين آمنوا ) ئایا وەخـتی ئەوە نەهاتووە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە ( ان يخشـع قلوبهـم لذكر الله) کە دڵیان بترسێ بە یادی خودا (وما نزل من الحق) وە خوێندنەوەی

ئەو قورئانەی کە لە لای خواوە هاتۆتە خوارەوە بەڕاستیو دروستی •

خوا ئەیەوێ دەستەی مسڵمانان پەروەردە بکاتو پێیان بگەیەنێ بە ڕەنگێك کە ببن بە پێشەوای هەموو جیهانیان ، وە ئاینی ئیسلام ببەن بە دیاری بۆ هەموو کەنارو بیجاڕی سەرزەوی، وە ئەمە لە دەست هەموو گەلێك نایەت ئەوانە نەبێ کە پڕ بەدڵ لە خوا ئەترسن ، وە دڵیان ئاوەدانە بە یادی خواو فەرموودەی قورئان ، ئەوانەی کە بە پێکەنینو گاڵتەوە گەپەوە خەریکن ، یا لە دینەکەیانا سارد بوونەتەوە ، ئەوانە ئەم بارە قورسو گرانەیان پێ هەڵناگیرێ • بەڵێ شتێك لەمانە ڕوویدا لەمەدینە بە سەرێنیی پێغەمبەر لە ناو هێندی لە تازە مسڵمانەکانا ، تا بەم ئایەتە سەرکۆنە کران دوای پانزە شانزە ساڵێك لە هاتنە خوارەوەی قورئان •

لەم ئایەتەوە دەرکەوت کە خوا ئەیەوێ مسڵمانان هەمیشە سەرگەرمو دڵگەرم بن لە دینەکەیانا بەڕەنگێك کە لەگەڵ چەند ئایەتێك لە قورئان خوێندرایەوە ، چاویان بێتەگڵو دڵیان بێتەکوڵ ، لە سەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە وا بوون ، بۆیە قورئان ڕێی مێژووی گۆڕی ، وە ئیستاش ڕۆژ هەڵاتو ڕۆژئاوا سەرسامن لەو تینو تەوژمەی کە قورئان تواندوویەتی لە سەرەتای ئیسلامەتی‌یەوە ، وە ئیسلامەتی بڵاو بووەوە نە ئاسیاو ئەورووپاو ئەفریقادا ، هەموو شتێك با زۆر گەورەو گرنگو بەتینو تەووژمیش بێ کە ماوەیەکی زۆری بە سەرا تێپەڕی ، مەردوم هۆگری ئەبێو ئەوگرنگی‌یەی نامێنێ ، وەك ئەم ڕۆژو مانگو ئەستێرانەی کە بە هەزاران ملیۆنو بلیۆن بە ژوور سەرمانەوەن ، وە هەموو بە هێزی کێشندە وێستاوون ، وە هەر یەکەی بە جۆرێك لە سەر چەمەرەی خۆی

ئەسووڕێتەوە وە هیچیان پاش‌و پێش ناکەوون ، وە بە یەکا هەڵناتەقێن کە چی چونکە هۆگریان بووین و چاومان لێ‌یان پڕبوون ، لە بیرمان چوونەتەوە ، وە هیچ سەرنجێکمان ڕاناکێشن ، وە خوامان بیر ناخەنەوە، لە بەر ئەوە هەموو دینێك لە سەرەتاوە کە دێ زۆر بە گەرم‌و گوڕی دێ ، لە پاش ماوەیەك بەرە بەرە ئەو تین‌و تەووژمەی نامێنێ ، وەك دینی جوولەکەو گاوور ، کە تەورات‌و ئینجیلەکەیان لە سەرەتاوە لە دڵیانا زۆر بەتین بوون ، و لە هەموو گوناهێك گێڕانیەوە ، بەڵام لە پاش ماوەیەك کە بە سەریا تێپەڕیو، لە پێغەمبەرەکانیان دوور کەوتنەوە، وە هۆگریان بوون ، ئەوتین‌و تەووژمەی نەما لە دڵیانا ، وە ئەم سام‌و شکۆهەی بە سەرچوو ، وە دڵیان ڕەش بوو ، وە لە بەرد ڕەق‌تر بوو ، وەك قورئان ئەفەرموێ : « ثم قست قلوبكم من بعد ذلك فهي كالحجارة او أشد قسوة » (۱) .

ئنجا خوا مسڵمانەکان ئەترسێنێ لەوەی کە ئەمانیش وەك گاوورو جوولەکەکانیان لێ بێ ، وە دین‌و قورئانیان لە بیر بچێتەوە فەرمووی :

---

(۱) واتە لە پاشا دڵتان ڕەق بوو دوای ئەم موعجیزانەی کە نیشانتان درا ، وەدڵتان وەك بەرد بەڵکو زۆر ڕەق‌تر .

وَلا يَكونوا كَالَّذينَ أُوتوُا الكِتابَ مِنْ قَبْلُ ، فَطالَ عَلَيْهِمُ الأَمَدُ فَقَسَتْ قُلوبُهم وكَثيرٌ منهم فاسِقون (١٦) اعلَموا اَنَّ اللهَ يُحْيِ الأَرضَ بَعْدَ مَوْتِها ،

---

وە نەبن بەو (جوولەکەو گاوور)انـەی کە لـە مەپێش نـامەی ئاسمانی‌یان بۆ نێررا ، وە ساڵەهای ساڵیان بە سەرا تێ‌پەڕی وە دڵیان ڕەق بوو ، زۆر لە خاوەن نامەکان بەدکردارن (١٦) بزانـن کە خـوا زەوی زیندوو ئەکاتەوە دوای مردنی ،

---

( ولا يكونوا كالذين اوتوا الكتاب من قبل ) با نەبن بەوانەی کە لە مەپێش نامەی ئاسمانیان بۆ نێرراوە وەك تەورات بێ ( فطـال عليهم الامـد ) وە ساڵەهای دوورو درێژیان بە سەرا تێ‌پەڕی ( فقست قلوبهم ) وە دڵیـان ڕەق بوو ، کە دڵ ڕەق بوو ئنجا بێ‌موبالاتیی بە سەرا دێ ، دوای ئەوە ئنجا بەدکاریی بە دوا دا دێ بۆیە فەرمووی ( وكثير منهم فاسقون ) زۆر لە خاوەن نامەکان بەدکاران ( بەدکارن ـ م ) .

بە کورتی خوای گەورە جڵەوگیریی مسڵمانان ئەکات لەوەی کـە گوێ لە قورئان نەگرن‌و لێی وورد نەبنەوە ، واتە بۆ ئەوەی ئێوەش وەك گاوورو جوولەکەکانتان لێ نەیەت کە دینتان لە بیر بچێتەوە ، هەمیشـە دەوری قورئان بکەنەوە ، وە گوێی لێ‌بگرن‌و بیری لێ بکەنەوە ، چونکە قورئان بەهاری بیرو باوەڕە ، واتە بیرو باوەڕتان تـازە ئەکاتـەوە وەك زەوی‌یەك کە بارانی لێ نەبارێنێ ، چـۆن کە بـارانی لێ بـاری تـازە ئەبێتەوە ، وە گوڵو گوڵزارو لالەزاری لێ شین ئەبێ ، قورئانیش بـۆ دڵی مردوو وایە وەك ئەفەرموێ (اعلموا ان الله يحي الارض بعد موتها)

قَدْ بَيَّنَّا لَكُمْ الآيَاتِ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ (١٧)

بێ‌گومان نیشانەی زۆرمان بۆ هێنانەوە تا ژیر بن (١٧)

بزانن کە خوا زەوی زینـدوو ئەکاتـەوە دوای مردنـی بـە هـۆی بێ‌بارانی‌یەوە ، واتە چۆن زەوی‌یەك کە ساڵێك بـارانی لێ نەبـارێ وەك مردووی لێ دێ‌و هیچی لێ سەوز نابێ ، کە لەگەڵ بـارانیشی لێ بـاری زیندو ئەبێتەوە ، قورئانیش بو دڵی مردوو وایـە •

لـە لایەك خـوا ئامۆژگاریی هاوڕێـکانی پێغەمبەر بـکات‌و پێ‌یان ڵێ : ئێوە هیمەت‌و ئیرادەتان کز بووە لە کاتێـکا پێغەمبەر لـە ژیانا بووبێ، وە پانزە شانزە ساڵ بە سەرێتیی پێغەمبەرێتیی پێغەمبەردا تێ‌پەڕی بێ،ئەبێ ئێستاکە زیاتر لە سەدان ساڵ تێ‌پەڕیوە تا چ ئەندازەیەك هیمەت‌و ئیرادەی مسڵمانان کز بووبێ، وە تا چـەندە پێویست بن بە دەمـەزەرد کردنەوەی بیرو باوەڕیان‌و تازە کردنەوەی ئیمان‌و بڕوایان بـە نووری قورئان‌و بە خوێندنەوەی قورئان •

زۆر جـار خوا ئەم جۆرە نموونانەمان بۆ ئەهێنێتەوە تا بیـر بکەینەوەو ژیر ببین وەکو ئەفەرموێ ( قد بینا لـکم الآیات ) بەڕاستی بۆم ڕۆشن کردنەوە نیشانەهای ( نیشانەکان ، کۆی نیشانەیە، وشەکـە فارسی‌یە ــ م ) دەسەڵاتی خۆم ( لعلکم تعقلون)تا ژیر بن، وە ژیریی‌و بیری خۆتان بە کار بێنن •

★ ★ ★

اِنَّ الْمُصَّدِّقِینَ والمُصَّدِّقاتِ وَأَقْرَضُوا اللهَ قَرْضاً حَسَناً یُضاعَفُ لَهُمْ ولَهُمْ اَجْرٌ کریم ( ١٨ ) وَالّذینَ آمَنُوا بِاللهِ وَرُسُلِهِ ، أولئِكَ هُمُ الصِّدِّیقونَ وَالشُّهَداءُ عِندَ رَبِّهِمْ

بێ گومان پیاوانو ژنانێك کە لە ڕێی خوادا خێر ئـەکەنو قـەرز ئەدەن بە خوا بە قەرزێکی باش ، بە زیادەوە ئەیان درێتەوە ، وە پاداشی گەورەیان بۆ هەیە (١٨) ئەوانەی کە بڕوایـان هێنـاوە بـە خـواو بـە پێغەمبەرانی ، ئەوانە لای خوای خۆیان ڕاستگۆیانی جیهانیانو شەهیدانن

لە سەرەتای سوورەتەکەوە بە ئایەتی (١١،١٠،٩،٨،٧) دوای بڕوا هێنانو دارایی بەخت کردنی کرد لـە ڕێی خوادا، وە هــانە هـانەی مسڵمانانیدا لە سەریان، وا لێرەشا بە دوو ئایەتیتر، وە لە شێوەیەکیترا هانە هانەی بڕواداران ئەدات لە سەر یارمەتیو دەستگیرویی ئەفەرموێ ( ان المصدقین والمصدقات ) پیاوانو ژنانێك کە لە ڕێیخوادا خێر ئەکەنو دەستی هـــەژاران ئەگرن ( واقرضوا الله قرضا حسنا )وە قەرز ئەدەن بە خوا بە قەرزێـکی باش، بەم ڕەنـگە بە خۆشیو ناوچەوان ڕوونییان پارەی خۆیان ئەدەن بە هەژارانو لێ قەوماوانو کەفتەکاران، بێ ئەوەی منەتیان بـکەن بە سەراو بیدەنەوە بە چاویانا ( یضاعف لهم ) خوا بە دە چەندانە تا حـەوت سەد چەندانە پاداشیان ئەداتەوە ، ( ولهم اجر کریم ) وە بۆ ئەوان هەیە پاداشی گەورە •

( والذین آمنوا بالله ورسله ) ئەوانەی کـە بڕوایان هێناوە بە خواو پێغەمبەرانی ــ کە دواهەمینیان حەزرەتی محمدە ــ ( اولئك هم الصدیقون والشهداء عند ربهم ) ئەوانە لای خوای خۆیان وەك ئەو ڕاستگۆیانەن کە

لَهُمْ أَجْرُهُم وَنورُهُمْ ، والَّذينَ كفروا وكَذَّبوا بآياتنا أولئكَ اصحاب الجحيمِ (١٩) وعلَموا أنَّما الحيَاةُ الدّنيا لَعِبٌ ولَهْوٌ وَزينةٌ وتَفاخُرٌ بَيْنَكُمْ وَتكاثرٌ في الأَمْوالِ والأولادِ ،

به پاداشی کردەوەو نووری بڕوایـان ئەگەن ، وە ئەوانـەی کـە بێبڕوان، وەنیشانەی تاكو تەنیاییمان بە درۆ ئەزانن ئەوانە هاوڕێی ئاگری دۆزەخن (١٩)

بزانن کە ژیانی جیهان یاریی (منالآنە)و ڕابواردنێـکی بێهوودەو ئارایشێکی (ژنانە)و شانازیو لاف لێدانە بە دارایی‌و منالی زۆرەوە

لە بڕوا هێنانا پێش کەوتوون، وەك ئەو شەهیدانەن کە لەڕێی خـــوادا کوژراوونو سەری خۆیان داناوە ( لهم اجرهم ) بۆ ئەوان هەیە بە وێنەی پاداشی ڕاستگویانو ســەر دانەران ( ونورهم )وە بە وێنەی ئەوانـە کە ڕێی بەهەشتیان بۆ ڕووناك ئەکەنەوە •

لە دوای باسی پاکانو باسی پاداشیان ئنجـا باسی بێبڕوایان ئەکاتو ئەفەرموێ ( والــذین کفروا ) ئەوانەی کە بێبڕوان بە خوا ( وکذبوا بایاتنا )وە نیشانەی تاكو تەنیاییمان بە درۆ ئەزانن ( اولئك اصحاب الجحيم) ئەوانە هاوڕێی ئاگری دوزەخن لێی جیانابنەوە •

ئنجا بۆ پشتکردنە دنیـاو ڕوو کردنە ڕۆژی دوایی فەرمووی : ( اعلموا انما الحياة الدنيا ) بزانن ئەی ئادەمی کـــە زیندەگانیی جیهان (لعب) یاری‌یەکە وەك یاریی منـــالآن (ولهو)وە هەوڵدانێـــکی بێهودە (وزينة)وە جوانی‌یەکە مەردومی دنیا پەرست خۆی پێ ئارایش ئـــەدات ( وتفاخر بينكم )وە شانازی کردنە بە سەر یەکتریدا بە باوو باپیران، یـا بە دەستدارانو زۆر داران ( وتـــكاثر في الاموال والاولاد )وە لافو

کَمَثَلِ غیْثٍ أَعْجَبَ الـکُفّارَ نَبَاتُهُ ،ثُمَّ یَهیجُ فَتَراهُ مُصْفَرّاً ، ثم یَکونُ حُطاماً ،

و ك بارانێك وایە کە حاسلاّتەکەی کشتیار (ی دنیا پەرست) کەیف خۆش بکات ، لە پاشا ووشك ببێو بە زەردی بیبینێت ، ئنجا ببێ بە تێك شکاو ،

گەزاف لێدانە لە گەڵ یەکتریدا بە دارایی زۆرو کوڕانی زۆر .

ئنجا لە سەر ژیانی دنیا نموونەیەکمان بۆ ئەهێنێتەوە، نیشانمان ئەدات کە ژیانی دنیا وەك گوڵێکی جوانی بێدەوام وایە کە لە دوای چەند دەمێك سیس ببێو هەڵبوەرێتو ژێر پێ بکەوێ فەرمووی (کمثل غیث) بە وێنەی بارانێکە کە لە شوێنێکی تینوودا ببارێ ، وە ئەو تۆوەی کە چێنراوە بڕوێو ڕیشە داکوتی، وە لە ڕووی باشی‌یەوە ( اعجب الکفار نباته ) ئەوی ڕواوە بە بارانەکەو شین بووە، ئەوەندە سەوزو جوان بێ، وە باڵای بەرزبێ کشتیاری دنیا پەرستو سەرمەستو کەیف خۆش بکات، وە چاوەڕوانی هەموو خێرو خۆشی‌یەکی لێ بکات ( ثم یهیج ) لە پاشا ووشك ببێ ( فتراه مصفرا ) ئنجا بی‌بینێت بە زەردیی دوای سەوز بوونی وە کاتی دروێنەی بێ (ثم یکون حطاما) لە پاشا بی‌بینێت بە تێکشکاویی‌و ، کوتراویی‌و ووردیی لە ژێر پێدا بە جۆرێك کە با بیبا بە ئاسمانا .

ئنجا هەر کەسێك دنیا پەرست بێ، وە دنیا دەست خەڕۆی بکات بە ڕەنگێك کە تیا نوقوم ببێ، وە خواو ڕۆژی پرسینەوەی لە بیر بچێتەوە، ئەوا لەو ڕۆژەدا تووشی سزای خوا ئەبێ، وەکو ئەفەرموێ

وَفی الآخِرةِ عَذابٌ شَدیدٌ ومَغْفِرةٌ مِنَ اللهِ وَرِضوانٌ وما الحیاةُ الدنیا اِلاّ مَتاعُ الغُرورِ (٢٠)

لە ڕۆژی داوایدا سزای سەخت هەیە (بۆ دنیا پەرستان) ، وە لێخۆشبوونو ڕەزامەندیی خواش هەیە بۆ خواپەرستان ، وە زیندەگانیی جیهان (بەم ڕەنگە) هەر مایەی فریب خواردنە (٢٠)

( وفي الاخرة عذاب شديد ) لە ڕۆژی دوایدا سزای سەخت هەیە بۆ دنیاپەرستان، وە هەر کەسێکیش ڕۆژی دوایی لە بیر بێ، وە لە خوا بترسێو هەووڵ بدات بۆ ڕەزای ئەو، ئەوا بە بووردنو ڕەزای خوا ئەگات وەکو ئەفەرموێ ( ومغفرة من الله ورضوان )بۆ بڕواداران لێخۆشبوونو ڕەزامەندیی خوا هەیە، کە دنیا وەك بڵقی سەرئاو هیچو پووچە،واتە تاهەیە، پووچە، کە نەشما هەرئەبێ بە هیچ وەکو ئەفەرموێ ( وما الحياة الدنيا الا متاع الغرور ) زیندەگانیی جیهان بۆ کەسێك لە ڕێی ڕاست لابدات، ئەو زیندەگانیی‌یە هەرمایەی فریب خواردنو سەرکێشیو یاخی بوونە لە خوا •

سەعیدی کوڕی جوبەیر ڕەزای خوای لێ بێ ئەفەرموێ : « دنیا ئەگەر لات بدات لە ڕێی شەرع مایەی یاخی بوونە، وە ئەگەر ڕەزای خوای پێ بکرێت ئەوا باشترین شتە » •

مەبەست لەم ئایەتانە ئەوە نی‌یە کە مسڵمانان دەست لە دنیا داریی هەڵگرنو ، خواردنی خۆش نەخۆنو بەرگی جوان لە بەر نەکەنو، لە

سابقوا الی مَغْفِرةٍ من رَبّكُم وَجَنَّةٍ عَرْضُها كَعَرْضِ السَّماءِ والارضِ

دەست پێشکەری بکەن بۆ لێخۆشبوونتان لە لایەن پەروەردگارتانەوە ، وە بۆ بەهەشتێك کە پانی‌یەکەی وەك پانیی ئاسمانو زەوی‌یە ،

کۆشکی خۆشا دانەنیشنو ژنی جوان نەهێنن ، بەڵکو مەبەس ئەوەیە کە مەردوم نەبێ بە بەندەی دنیا، وە بۆ دنیا لە سنوور دەر نەچن، یەکێك پێویستانی‌دینی خۆی بەجێ بێنێ، وە لە ڕێگایەکی شەرعی‌یەوە کسبو کار بکات، وە حەلاڵو حەرام بزانێ، ئەوە خۆشەویستی خوایە ، وە کسبو کارەکەی بە خواپەرستی بۆ ئەنووسرێ •

دوای ئەو هێرشەی کە بردی‌یە سەر دنیا پەرستی، ئنجا باسی قازانجو سوودی دەست پێشکەری ئەکات لە ڕەزامەندیی خوادا، واتە ئەوی پێویست بێ بۆ ئادەمی لە ژیانیا ئەم دەست پێشکەری‌یەیە کە ئەفەرموێ ( سابقوا الی مغفرة من ربکم ) دەست پێشکەری بکەن بۆ ئەوکارانەی کە مایەی لێخۆشبوونتانە لە لایەن پەروەردگارتانەوە، وەك نوێژ کردنو ڕۆژوو گرتنو خێرو خزمەت کردنو دەستو دەمو دڵپاکی‌و بێ زیانی‌و خێر خواهی ئادەمی ( وجنة )وە بۆ گەیشتنتان بە بەهەشتێك ( عرضها کعرض السماء والارض ) کە پانایی‌یەکەی بە قەد پانایی ئاسمانو زەوی‌یە •

مەبەست لەم تەعبیرە قورئانی‌یە تەمسیلی گەورەیی‌و فراوانی

أُعِـدَّتْ لِلَّذِينَ آمَنُوا بِاللهِ وَرُسُلِهِ ذلِكَ فَضْـلُ اللهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشاءُ وَاللهُ ذو الفَضْلِ العَظيمِ (٢١)

ئامادە کراوە بۆ ئەوانەی کە بڕوایان هێناوە بە خواو فرستادەگانی ، ئەو بڕواهێنانە کەرەمێکی خوایی‌یە ئەیدا بە کەسێك کە خوا بی‌یەوێ ، وە خوا خاوەنی کەرەمی گەورەیە (٢١)

بەهەشتە هەر وەك ئایەتی « یوم نقول لجهنم هل امتلأت ؟ وتقول هـل من مزید »[1] تەمسیلی گەورەیی‌و فراوانیی دۆزەخە[2] (اعدت) ئـەم بەهەشتە ئامـادە کراوە ( للذین آمنوا بالله ) بۆ ئەو کەسانەی کـە بڕوایان هێناوە بە خـوا (ورسله) وە بە پێغەمبەرانی خوا ، ( ذلك ) ئەم بڕوا هێنانە[1] ( فضل الله ) کەرمێکی خوایی‌یە ( یؤتیه من یشاء ) ئەیدا بە کەسێك کە خوابی‌یەوێ ( والله ذو الفضل العظیم )وە خوا خـاوەنی

(١) لە ڕۆژێـکا بە دۆزەخ ئەڵێین ئایا پڕ بوویتەوە ؟ (لـەبێ‌بڕوایان‌و ناپاکان ) وە دۆزەخ ئەڵێ : هی‌تر ماوە ؟ واتە جێگام زۆرە ٠

(٢) ئایەتەکە ئەگەر لە سەر شێوەی تەمسیل نەبێ چی ئەبێ‌و چی‌ڕوو ئەدا ؟ ، پانی‌و فراوانیی بەهەشت بەدەقی ئایەتە پیرۆزەکە بـــە ئەندازەی پانیی ئاسمان‌و زەوی‌یە ، ئیتر هیچ پێویست ناکا لـــە مانای حەقیقـەتەوە ئایەتەکە لابدەین‌و ماناکـەی بخەینە قـاڵبی تەمسیلەوە ، خوای گـــەورە بە دەسەڵات‌و بەتوانایە ، بی‌یـەوێ هەرشتێك بکاو چۆنی بکا بە ئاسانی ئەیکاو بیروباوەڕی ئیسلامیش لاریی لەوە نییە ٠ (م) ئەردەلانی

(١) وشەی (ذلك) ئامازەیە بۆ ئەو وەعدەی کە لە مەفهوومی ( اعدت ) وەرئەگیرێ، واتە ئەو وەعدەیە کە خوا بە ئێوەی داوە ، بەڵام (ذلك) ئامازە بێ (بۆ بڕوا هێنان) وەکو دانەر ئەفەرموێ تاڕادەیەك دوورە (م) ئەردەلانی

ما أَصابَ مِنْ مُصیبَةٍ فِي الأَرضِ ولا في اَنْفُسِكُمْ الاّ في کتابٍ من قَبْلِ اَنْ نَبْرَأها ،

هیچ ڕەنجو بەڵایەك ڕووی نەداوە نە لە زەوی‌و نە لە خودی خۆتانا هەمووی لە عیلمی خوادایە ، پێش ئەوەی ئاسمانو زەوی دروست بکەین

میهرەبانی‌و کەرەمی گەورەیە دەربارەی مسڵمانان بە یارمەتی‌دانیان لـە دنیادا بۆ بڕوا هێنانو لە ڕۆژی دوایشا بە لێخۆشبوونیان •

★ ★ ★

دوای ئەوەی کە فەرمووی هەرچی مایەی ژیانی جیهان هـــەیە هەمووی دێت‌و ئەڕوات ، وە خۆشی‌و ناخۆشی تا ســەر نامێنێ، ئنجـــا ویستی نەختێك بەڵاو چورتم لە سەر بڕواداران سووك بکات، فەرمووی ( ما اصاب من مصیبة ) هیچ بەڵاو ناخۆشی‌یەك نەگەیشتووەو ناگات ( في الارض )نە لە زەوی ـ وەك گرانی‌و، بێ بارانی‌و، لافاوو بوومەلەرزەو، نەخۆشیی دارو درەخت‌و دەغڵو دان ( ولا في انفسکم ) ـ وە نە لـــە خودی خۆتانا وەك نەخۆشی‌و هەژاری‌و مردوو مردن ( الا في کتـاب ) هەمووی لە نامەی ئەزەلی‌دایە کە عیلمی خوایە، وە خوا ئاگای لێ‌یـە ( من قبل ان نبرأها ) پێش ئەوەی ئەرزو ئاسمان دروست بـکەین ، واتە ئەو خوایەی کە ئاسمانو زەویی دروست کردووە لـــە پێش دروست کردنەکەیانا ئەزانێ چی لە ناویانا ڕوو ئەدات ، وە ئەزانێ هـــەموو کەسێك کە هاتە دنیاوە بە ئارەزوو، وە بە ئیختیاری خۆی چی ئەکات ،

وە ئەنجامەکەی چی ئەبێ بۆ خۆی ، چاك ئەبێ یا خراپ ئەبێ پاداشی ئەبێ یا تۆڵەو سزا ئەبێ •

ئەی مسڵمانی بڕواداری دڵ ڕووناك بە چرای بیرو باوەڕ ! خۆت ئەزانیت : ئەندازیارێك کە ئامێر «ئالە»یێك دروست بـکات، ئاگای لـــە هـــەموو پارچەکانێتی ، بە ئاگاداریی‌یەکی تەواو ، وە ئەزانێ چـۆن ئەکەوێتە کارو چۆن کـــار ئەکات، وە تاچ ئەندازەیەك کار ئەکات ، وە هێزی لە چ ئەندازەیەکدایە، هەروا بیستووتە ئەوانەی کـــە مانـــگی دەستکرد دروست ئەکەن ئەزانن کەڕوو کردن « اتجاه» کـــەیان‌و خێرایی‌یەکەیان چۆنە، وە ئەزانن لە هەموو خولێکا ــ کـە بە دەوری زەویدا ئەسووڕێتەوە ــ چۆن ئەڕوات، وە بەچەند خولێك تەواو ئەکات وە بەسەر کوێدا ئەڕوات، وە ئەو شوێنانەی کـــە بە سەریانا ئەڕوات، ئەزانێ لە چ کاتێکا بەسەریانا تێ‌ئەپەڕێ، ئنجا لە لایەك ئەمە ئەندازەی زانینی ئادەمی‌یەکی زەبوونی بێ ئاگابێ لە خۆی، کە نازانێ دوای دوو خولەکی‌تر چیی بە سەردێت، چۆن بڕواناکەی بەمـــە کـە خوایەکی گەورەی ئاگـــاداری ئەندازیاری ئـەم بوونەوەرە ئاگـــای لـــە بوونەوەرەکەی خۆی نی‌یە، دیارە ئاگای لێ‌یەتی‌و هەر شتێکیش تیـایدا ڕوو بدات لێی یاخی نابێ لە گەڵ ئەمیشە کە زانینی ئادەمی زۆر کـەم‌و کووڕو کورت‌و کوێرە لـە چاو زانینی خوای گەورە کـە هـــەرچی سنوورو پایان بێ نی‌یەتی[1] •

---

(١) لەم جێگەیەداو لەم مەفهوومەدا مەولەویی نەمر چـــەند بەیتێکی هەیە ، ئەمە یەکێکیان :

عومەر خەیام لە چوارینەکانیا بە لای خۆیەوە گرێ‌کوێرە «مشکلە»یەکی هێناوەتە پێشەوە ئەڵێ : هەر گوناهێك لە ئێمە بوەشێتەوە، خوا لە ئەزەلدا زانیویێتی، ئنجا ئەگەر ئەو گوناهە نەکەین زانینەکەی خوا ئەبێ بە نەزانین، وەك ئەم چوارینەیەی کە ئەڵێ :

من می خورم‌و هەر کە چو من اهل بود
می خوردن من بنزد او سهل بود
می خوردن من حق ز ازل دانسته
گەرمی نخورم علم خدا جهل بود

واتە :

مەی ئەخۆم هەر کەس وەکو من ئەهلە
مەی خواردنەوەی من لە لای ئەو سەهلە
خوا لە ئەزەلدا خواردنەوەی زانیم
گەر نەیخۆمەوە عیلمی خوا جەهلە

بەم قسەیەی عومەر خەیامە زۆر کەس گومڕا بوون؟ وا ئەزانن کە ئەم قسەیە ڕاستە کە چی هەڵەیەکی ئەمەندە گەورەیە ، مـن بەش بەحاڵی خۆم بە دووری ئەزانم لەعومەر خەیامەوە، وە وا ئەزانم کـە

---

= کەنارەی سەحرای نادیاری‌یە
بینایی عقوول ئاومرواری‌یە
واتە سنوورو ئاسۆی دەشتی ناسینی خوا دیارنی‌یەو بێ‌پایانە ،
چونکە بینایی چاوی ژیریی تووشی دەردی (ئاوی مرواری)بووەو
دەرکی ئەم پەڕو ئەوپەڕی ناکات (م) ئەردەلانی •

نادانێك بە « عیلمی کـــەلام » ، ئـــەم چوارینەیەی بـــە دەم ئەوەوە هەڵبەستبێت •

موفتی زەهاوی ـ بە ڕەحمەت بێ ـ ئەم گرێیەی لە گەڵ چـەند گرێیەکی‌تردا بە نامیلکەیەکی فارسی کردۆتەوە کە ئێمە وەختی خۆی ئەو نامیلکەیەمان لە گەڵ تەرجەمەی کوردی‌یەکەیا بڵاو کردۆتەوە لـە داوێنی کتێبی « مفتی زەهاویی » مانا •

موفتی زەهاوی لە وەڵامی ئەمەدا ئەڵێ : « گومان نی‌یە کـە علم صورەتی معلومە ، وە معلوم خاوەنی صورەتەکەیە، وە صورەت‌و خاوەن صورەت ڕێـکی یەکن، وە لەم ڕێکی‌یەدا ئەصڵ خاوەن صورەتە، کـــە پێی ئەڵێن معلوم، وە صورەتەکە ـ پێی ئەڵێن علم ـ بێ‌گومان تابعی ئەوە•

لە پاشا موفتی زەهاوی نموونەیەك ئەهێنێتەوە ئەڵێ : « بۆ نموونە هەر وەك لە دیوارێك وێنەی ئەسپێك بکێشرێ، ئەو وێنەیە ڕێــــکی ئەسپەکەیە، وە تابعی ئەوە، وە دروستە بڵێم : ئەم وێنەیە بۆیـــە وایـە چونــکە ئەسپەکە وایە، کە وا بوو بەم پێیە دروستە بڵێم : بۆیە خـــوا لە ئەزەلدا «دلێر»ی بە بەدکار زانیوە چونــکە خۆی وا بووە کــە بـە ئارەزووی خۆی بەدکاربێ، وە کردەوەی بەد بکات، وە دروست نی‌یە بڵێم : بۆیە دلێر بەدکارە چونــکە خوا ئەوی بە بەدکـــار زانیوە، وە کرداری ئەوی بە خراپ بینیوە •• » ئنجا هەربەم جۆرە وەڵامی چوارینە فارسی‌یەکەی پێشووی خەیامم داوەتەوە ئەڵێم :

خیام ! جواب شبهأت سهل بود
علم ازلی هم تبع فعل بود

با قطع نظر ز علم هەر معلومی
واقع نشود علم کجا جهل بود ؟

واتـە :

جوابی شوبهەی تۆ خەیام ! ئاسانە
زانین لـــە شوێنی کردە ڕەوانە
تو واز لـــە زانین بێنە هەر چشتێ
گـەر نەبێ ، بۆچی زانین نەزانە ؟

واتە نەزانینە

بە کورتی قسەکەی خەیام ئەمەیە : کە عیلمی خوا بوو بە شتێك، ئەبێ ئەوشتە بێ، بە کورتی وەڵامەکەی موفتیش ئەمەیە : کە شتەکە لە خۆیا نەبوو، زانینی خواش بە بوونی نی‌یە، وەك خوا خۆی ئەفەرموێ لە سوورەی «یونس»دا بە هاوبەش پەیدا کەرەکان کـــە ئەیان ووت : « هؤلاء شفعاؤنا عند الله » واتە ئەم بتانە تـکا کارمانن لای خوا، ئنجـا خوا پێیان ئەفەرموێ « اتنبئون الله بما لا یعلم في السماوات ولا فـــي الارض » واتە ئایا خەبەر بە خوا ئەدەن بە شتێك کە ئاگای لـە بوونی نی‌یە نە لە ئاسمانو نە لە زەویدا •

بۆ ڕوون کردنەوەی قسەکەی موفتی زەهـاوی با نموونەیەکی‌تر بێنینەوە بڵێین : ئەگـەر زانایەکی ئاسمانی بە حسابێکی خۆی کە کردی زانی کە ڕۆژ دوای بیست ڕۆژی‌تر ئەگیرێت ، وە خەبەری دا ، وە دوای بیست ڕۆژەکە ڕۆژگیرا ، ئایا ئەم ڕۆژە کە گیرا بۆیە گـیراوە کە ئـەم

زانایە پێشەکی زانیوێتی کە لەو کاتەدا ئەگیرێ ؟ یا لە بەر ئەوە گیراوە کە لەو کاتەدا مانگ کەوتۆتە ناوەندی ڕۆژو زەوی‌یەوە ، وە مانگ سێبەری لە زەوی کردووە ؟ دیارە گیرانی ڕۆژ لە بەر ئەمـانەیە ، نـەك لـە بـەر ئەویکەی پێشوووە ، ئەو ڕۆژە کە گیراوە لە بەر هۆیەکی تایبەتی خـۆی گیراوە ، وە زانینی ئەو زانایە هیچ پەیوەندی‌یەکی لە گیرانی ڕۆژا نی‌یە، هـەر ئەوەندە هەیە ئەو زانایە بە زانینی تایبەتی خۆی زانیوێتی کە ڕۆژ لەو ساتەدا ئەگیرێ ، زانینی خواش بە هەرشتێك ببێ هەروایە •

یا خۆ بڵێین : خوا کە لە ئەزەلدا ئەزانێ ڕۆژ لە فلان‌کاتا ئەگیرێ لە بەر ئەوە کە لەو کاتەدا مانگ ئەکەوێتە ناوەندی ڕۆژو زەوی‌یەوە ، کە واتە گیرانەکەی ڕۆژ لە بەر ئەمەیە ، نەك لە بـەر ئەوەیە کە خـوا زانیوێتی ڕۆژ لەو کاتەدا ئەگیرێ ، جیـاوازیی ئەمـە لەگەڵ عـەرەق خواردنەوەکەی خەیاما ئەوەیە لە ڕۆژگیرانەکەدا هۆی گیرانەکە لـەبەر چاوە کە چی‌یـە ، بەڵام لە عەرەق خواردنـەوەکەدا هۆیـەکە ـ کـە ئارەزووی خواردنەوەکەیەتی ـ لە بەرچاو نی‌یە ، ئەگینا هەردووکیـان وەك یەکن •

جگە لەم قسانەی کە کران ، تۆ ئەی ئادەمی‌زاد ـ چووزانیت ئەو گوناهەی کە یەکەم‌جار ئەتـەوێ بێ‌کەیت ، لای خـوا نووسراوە کـە ئەیکەیت ، ئایا لەوحەی محفوظت خوێندەوە یا عیلمی غەیبی خوات بـۆ ئاشکرابوو ، ئنجا بچیت گوناهەکە بکەیت بۆ ئەوەی کە عیلمی خوا بـە جەهـل دەرنـەچێ ، هـەزار ڕەحمـەت لـە مەولـەوی کە لەعەقیـدە کوردی‌یەکەیا ئەڵێ :

اِنَّ ذلِكَ عَلَى اللهِ يسيرٌ (٢٢)

بێ‌گومان ئەوە لای خوا ئاسانە (٢٢)

جەوازی نی‌یە هەم مەنێرە سەر
« احتجاج »کردن بە قەزاو قەدەر

سبق في العلم بۆ وە دەستم برد
کتب في اللوح منیش ئەوم کرد(١)

دەفتەری علمو لەوحت لەبەر بوو ؟
خەمت هەر جەهلی خاوەن دەفتەر بوو ؟

گرفتاری نەفس ئەممارەی خۆتی
شەلو پەل ئەکەیت هەی شێتی پەتی ! (٢)

(ان ذلك على الله يسير) بێ‌گومان ئەوە بۆ خوا ئاسانە بڕوادار کە ئەمەی ووتمان بیرو باوەڕی بێ زۆر خەفەتبار نابێ بە بەسەرهاتی ڕۆزگار ، چونکە ئەزانێ کە چارە نووسە ، واتە ئەگەر تووشی زیانێك بێ بە قەد بێ‌بڕوایەك خەمبار نابێ ، وە ئەگەر خۆشی‌یەك ڕووی تێ بکات ، بە قەد بێ‌بڕوایەك کەیف خۆش‌و یاخی نابێ ، وەکو ئەفەرموێ :

(١) لە چاپەکەی عبدالکریم مدرس‌دا لە جیاتیی (ئەوم‌کرد) نووسراوە : بۆ وەم کرد ٠

(٢) سەیری ( عەقیدەی مەرضی‌یە)ی مەولەوی بکە بە قەڵەمی عبدالکریم مدرس‌و فاتح عبدالکریم ل:٧٨٩ ، چاپخانەی خلود ، بەغداد ١٩٨٨ز ـ ١٤٠٧ك ٠ (م) ئەردەڵانی ٠

لِكَيْلا تَأْسَوْا عَلى ما فاتَكُمْ ، ولا تفرَحوا بما آتاكُمْ ، واللهُ لا يُحِبُّ كُلَّ مُخْتالٍ فَخورٍ (٢٣)

(ئەمەبزانن) تا خەفەتبار نەبن بەوەی کە لە دەستتان ئەچێ ، وە کەیفخۆش نەبن بەوەی کە دەستتان ئەکەوێ ، وە خوا هیچ خۆ بە گەورەگرێکی شانازیی‌کەری خۆش ناوێ (٢٣)

( لكيلا تأسوا على مافاتكم ) تا زۆر خەفەتبار نەبن بەوەی کە لە دەستتان ئەچێ ، وە وا بزانن ئیتر خۆشی ڕووتان تێ ناکاتو نائومێد ببن بە ئیجگاری، ( ولا تفرحوا بما اتاكم ) وە زۆر کەیف خۆش نەبن بەوەی دەستتان ئەکەوێ ، وە وا بزانن کە ئیتر خراپە ڕووتان تێناکاتو یاخی ببن کە یاخی‌گەرێتی لای خوا زۆرخراپە وەکو ئەفەرموێ : ( والله لايحب كل مختال ) خوا هیچ خۆ بە گەورەگرێکی خۆش ناوێ ، کە بە هۆی گەورەیی‌یەوە دەستدرێژی بکات بۆ ئەمو ئەو ( فخور ) بنازێو شانازی بکات بە سەر مەردوما •

لێرەدا مەبەست لەم ئایەتە ئەوە نی‌یە کە مەردوم نابێ هەرگیز کەیفخۆش ببێ ، یا هەمیشە خەمبار بێ ، چونکە خەمو خۆشی بە سروشت لە ئادەمیدا هەنو هەر ئەبن ، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ناخۆشی نەگاتە ئەندازەی نائومێدی ، وە خۆشی نەگاتە یاخی‌گەری •

ئنجا باسی هەندێ لە سیفەتی خۆ بە گەورەگر ئەکاتو ئەفەرموێ :

الذین یَبْخَلوُنَ ویأْمرُونَ الناسَ بِالبُخلِ ، وَمن یَتَولَ فَاِنَّ اللهَ هُو الغَنِیُّ الحَمیدُ (٢٤)

ئەوانەی ڕژدی‌و بەخیلی ئەکەن ، وە فەرمان ئەدەن بە بەخیلی ، ئەو کەسەی پشت هەڵکات بێ‌گومان خوا بێ‌نیازێکی شایستەی ستایشە(٢٤)

( الذین یبخلون ) ئەوانەی کە بەخیلی ئەکەن لە ماڵی خۆیانـاو هیچی لێ بەخت ناکەن لە ڕێی خوادا ( ویأمرون الناس بالبخل ) وە لـە گەڵ بەخیلیی خۆیانا فەرمانی بەخیلیش ئەدەن بە مەردوم ( ومن یتول ) ئەو کەسەی پشت هەڵکات لە دەست‌گیرۆیی هـەژاران‌و لێقەومـاوان ( فان الله هو الغني الحمید ) بێ‌گومان خوا بێ‌نیازو شایستەی ستایشە ، پێویستی بە دەست‌گیرۆیی کەس نی‌یە ، ئەگەر داوای دەست‌گیرویی‌تان لێ بکات ئەوە بۆ قازانجی خۆتانە ، وە بۆ ئەوەیە کە دەستوورو ڕژیـمی ژیانتان تێك نەچێ ، ئەو دەستوورەی کە پڕە لە حیکمەت‌و فەلسەفە ، وە بۆ قازانجی هەموانە بە تێك‌ڕایی ، ئەودەستوورەی کە مایەی ئەوەیـە لە کۆمەڵەدا دەوڵەمەندو هەژار ببێ ، ئنجا فەرمانی داوە بە دەوڵەمەند کـە دەستی هەژار بگرێ‌و یارمەتیی بدات ، وە یەکتری یەکتری هەڵسووڕێنن لە ئیش‌وکاری خۆیانـا ، هەریـەکە بـە جۆرێـك ، وە هـەر یـەکەی بەڕەنگـێك •

ئەم ئایەتانە بیرمان ئەخەنەوە شەهید بوونی هێندی لەجەنگاوەران‌و تێکۆشەرانی ڕێگای خوا ، یا دووچار بوونیان بە هێندێ بەڵای قـورس‌و

لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ ، وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ

بەڕاستی ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ڕەوانە کرد بە نیشانەی زۆری ڕووناکەوە ، وە نامەی ئاسمانیو ترازووی دادمان لە گەڵا ناردن

گران لە بەر دریغی هێندێ کەس لە یارمەتی دانیان بە دارایی یا بە نەفس ، یا کۆتایی‌یان لە بەجێ‌هێنانی فەرمانی سەرکردەیان ، ئنجا بەم ئایەتانە دەرمانی دەردی مسڵمانانو تیماری برینی دڵیانی کرد ، وە تێی‌گەیاندن کە دنیا چەند ڕۆژێکی کورتە ، ئەوە ناهێنێ کە قیامەتی بکەیت بە قوربان وە پایەی خێر کەرانو یارمەتی‌دەرانو شەهیدانی بەرز کردەوە ، وە هەڕەشەی کرد لە بەخیلانو ئەوانەی کە فەرمان ئەدەن بە بەخیلی •

★ ★ ★

چەند ئایەتێك لە مەپێش فەرمانی‌دا بە بڕواهێنان بە خواو پێغەمبەرانی خوا ، فەرمووی : « والذين آمنوا بالله ورسله اولئك هم الصديقون » ئنجا وا لێرەدا مەبەست لە ڕەوانەکردنی پێغەمبەرانو نامەیان باس ئەکاتو ئەفەرموێ :

( لقد ارسلنا رسلنا ) بێ‌گومان ئێمە پێغەمبەرانی خۆمانمان ڕەوانە کرد ( بالبينات ) بە بەڵگەو نیشانەی زۆری ڕووناکەوە بۆ بانگ کردنی مەردوم بۆ ڕێی ڕاستو قازانجو سوودی دینو دنیایان ( وانزلنا معهم الكتاب ) وە نامەی ئاسمانیمان لە گەڵا ناردن تاڕێی ڕاستیان نیشان بدەن لە بابەت بیرو باوەڕو ڕەوشتو خووەوە ( والميزان )وە ترازووی دادمان

لِيَقُومَ النَّاسُ بِالقِسْطِ ،

تا مەردوم بە دادو یەکسانی کار بکەن لەگەڵ یەکتریدا ،

بۆ ناردن لە ناو ئەو نامانەدا ، واتە ئەحکامو شەرایعی ناو ئەو نامانە وەك ترازووی داد وانە بۆ مەردوم نایەڵێ هیچ لایەك لاسەنگ ببێ ، وە مافی هیچ کەسێك بە لای هیچ کەسێکا بچێ ( لیقوم الناس بالقسط ) تا مەردومان لەگەڵ یەکتریدا کار بکەن بە دادو بە یەکسانی ، وە کەس لا نەدات لە ئەحکامی ئەو نامانە ، تا هەموو کەسێك مافی خۆی وەرگرێ بە بێ زیادو کەم .

جا لەبەر ئەوەی کە ئادەمی بەشی زۆریان سەرچەوتو دڵڕەقن ، بە کوتەكو بە شیر نەبێ نایەنە سەر ڕێی شەرعو یاسا ، شەرعو یاساش ئەبێ پاسەوانێك چاودێری بکاتو بیپارێزێ ، کە ئەو پاسەوانەش دەوڵەتو لەشکرە ، لەشکریش کاتێ پاسی پێ ئەکرێ چ لە ناوەوەو چ لە دەرەوە کە پڕ چەك بێو هەموو جۆرە چەکێکی ببێ، تا هەرستەمکارێك سەری یاخیگەرێتی بەرز کردەوە بدات بە سەریا ، وە هەر دوژمنێك دەست درێژیی کرد بۆ خاکی بچێ بە گژیا ، وە تا کەڵەمەی ئەکات(١)،

(١) دەوڵەت بۆی هەیە ــ لە هەموو چەرخێکدا ــ ئاڵای جەنگ هەڵکاو ستەمو ستەمکاران نەهێڵێو ، بەربەستی هەموو دەسدرێژییەك بکا .. ، بەڵام ئەو جەنگە دەبێ لە سنوورو یاسای شەریعەتی ئیسلام نەچێتە دەرەوە ، ئەو جەنگە دەبێ بۆ بەرز کردنەوەی وتەی ( لا اله الا الله )بێو بۆ هێنانە دیی حەقو مافی ڕەوابێو ، بۆ =

وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ ،

---

وە ئاسنمان دروست‌کرد کـە هەرچی هێزی سەختی جەنگیی هـەیە بەوە ، وە قازانجێـکی زۆری هەیە بۆ مەردوم ،

---

چەکیش لە ئاسن دروست ئەکرێ ، کە واتە ئاسن هەزار جار لە زێـرو زیو گرنگ‌ترو بە کەڵك ترە ، بۆیە فەرمووی ( وأنزلنـا الحدیـد ) وە ئاسن‌و پۆلامان بۆ دروست کردوون تـا تـۆپ‌و تەفەنـگ‌و دەمـانچەو ئوتومبیل‌و پاپۆڕی زرێدارو دەبابەو ژێر دەریایی «غواصە»و گەلێ شتی گرنگتری لێ دروست بکەن ، هەر وەك جاران شیرو تیرو خەنجـەرو ڕم‌و زرێی لێ دروست کراوە ، ( فیە بأس شدید ) لە ئـاسنا هەیە هێزی جەنگیی زۆر سەخت ، چونکە هەرچی چەکی جەنگی هەیە هەمـووی هەر لە ئاسن دروست ئەکرێ ، بەڵکو ئاسن هێزو دەسەڵاتە لە جەنـگ‌و لـە ئاشتیدا ، وە هەر بە ئاسن لووتی ستەم‌کار ەشکێنرێ‌و ستەم لێکراو ئەپارێزرێ ، وە هەر بە ئاسن مەردوم ئەهێنرێتە سەر ڕێی ڕاست ، وە پاسی دین‌و ڕەووشت‌و خوو ئەکرێ ( ومنافع للناس ) وە لە ئاسنایە سـوودو قازانجی مەردومان بە ڕەنگێك کە هەرچی شارستانێتی هەیە لەم ڕۆژانەدا هەمووی بەستراوە بە ئاسنەوە ، وە هەرچی ببینین یا لـە ئاسـنە ، وەیا

---

=

پەیداکردنی عەدل‌و دادو مەبادیئی مرۆڤایەتی بێ • دەبێ دەوڵـەت تۆڵە لەتاوان باران بسێنێ‌و پەلاماری ئافرەت‌و پیاوانی بێدەسەڵات‌و گۆشەگیران نەدات ، دارو درەخت‌و کشت‌وکـاڵ نەسووتێنێ ...

(م) ئەردەڵانی

بەشێکی لە ئاسن تیایە ، وەك بەلەمی ماسی گرتن‌و ڕێی شەمەندەفەرو ئامێری جووت‌و دروێنەو گێرەو ڕستن‌و چنین‌و دیوار دروست کردن‌و چاپ‌و کشت‌وکاڵ‌و گەلێ شتی‌تر •

خوا لەم ئایەتەدا منەت ئەنێ بە سەر ئادەمی‌دا بە دروست کردنی ئاسن ، کە چی منەتیان بە سەرا نانێ بە زێڕو زیو ، چونکە ئاسن بە کەڵکترەو زۆرترو ، دەست کەوتنی ئاسانترو هەرزانترە ، لە میهرەبانیی خوایە لەگەڵ بەندەگانی خۆیا هەر شتێك تا ئادەمی زۆرتر پێویستیی بێ بێ لە ژیانیا ، وەك ئاوو هەوا ، خوا لە هەموو شتێکی زۆرترو دەست‌کەوتنی ئاسانتر کردووە ، وە تا شت بە نرختر بێ بۆ ژیان ئاسانتر دەست ئەکەوێ ، ئەبێ کەڵکی ئەڵماس‌و گەوهەرو بەردی بە نرخ چی بێ لە چاو گەنم‌و جۆدا ؟ •

لە جەنگی دووهەمی جیهانا ــ کە ئەڵمان ڕووخاو بەرلین گیرا ــ ڕووسەکان دەستیان کرد بە ئاسن فڕاندن ، ئینگلیزەکان‌و ئەمریکانی‌یەکانیش دەستیان کرد بە زێڕوزیو فڕاندن ، دوای ئەم فڕان فرانە ئنجا ئێمە تێگەیشتین کە ئاسن چەند بە نرخە ، وە بۆچی خوا لە قورئانا بەم جۆرە ناوی ئاسن ئەبات ، کە چی ناوی زێڕو زیو نابات ، وە بۆچی سوورەتێك لە قورئان ناو ئەنێ بە «ئاسن» کە چی سوورەتێکی ناو نە ناوە بە زیڕ یا بە زیو یا بە ئەڵماس •

بە کورتی ئایەتەکە ئەوەیە کە خوا پێغەمبەرانی ناردووە بە نامەی ئاسمانی‌یەوە ، وە ئاسنی بۆ دروست کردوون بە زۆری ، بو ئەوەی هەموو جۆرە چەکێکی لێ دروست بکەن ، بۆ ڕاگرتنی دادو ، ڕێك

وَلِيَعْلَمَ اللهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ
بِالغَيْبِ ، إِنَّ اللهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ (٢٥)

وە (خوا ئەمانەی کرد) تـا ببینێ ئـەو بڕوادارەی کە بـە چـەك یارمەتی دینی خواو پێغەمبەرانی ئەدات
بێگومان خوا خۆی تواناو زاڵە (پێویستی بە یارمەتی کەس نی‌یە)(٢٥)

خستنی دادی کۆمەڵایەتی لە جیهانا لە سەر بنیاتی ئەو نامانەو پاراستنیـان بە تەخت کردنی هەموو کۆسپێك لـە ڕێیانا ( ولیعلم الله ) واتە خـوا ئەمانەی هەموو کرد تا ببینێ (من ینصره ورسله) ئەو کەسەی کە یارمەتی دینی خواو پێغەمبەرانی خوا ئەدات بە هەڵگرتنی چەكو ، جەنگین لە ڕێی پاراستنی دینا ، ئەمەش کە ئەکەن ( بالغیب ) بە هۆی ئیمانو بڕوایانەوە بەو شتانەی کە لە مەردومەوە وونو نادیارن ، وەك بڕوا بـە ڕۆژی دوایی‌و پرسینەوە بێ لەو ڕۆژە دا •

دوای ئەوەی کە باسی یارمەتی‌دانی خواو پێغەمبەرانی خوای کرد بە هۆی بڕوا بە غەیب ، ئنجا مانای یارمەتی‌دانی خوامـان بۆ ڕوونـاك ئەکاتەوە بەم ڕەنگە کە مەبەست یـارمەتی‌دانی ئـەو دینـەیە کە بـۆی ناردوون • وە ئەو دەستوورەیە کە بۆی داناوون ، نەك یارمەتی خـودی خوایە ، چونکە خوا خۆی پێویست بـە هیـچ یارمەتی‌یـەك نی‌یـە وەك ئەفەرموێ ( ان الله قوي ) بێگومان خوا خۆی بە توانـایە لە سـەر لـە ناوبردنی دوژمنان ( عزیز ) زاڵو دەستدارە لە حوکمڕانی خۆیدا •

وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نوحاً وَإِبْراهيمَ
وَجَعَلْنا في ذُرِّيَّتِهِما النُّبُوَّةَ والكِتابَ فَمِنْهُمْ مُهْتَدٍ ،
وكثيرٌ مِنْهم فاسِقونَ (٢٦)

وە بە بێ‌گومان نووح‌و ئیبراهیم‌مان ڕەوانە کرد (بۆ سەر مەردوم) وە پێغەمبەرێتی‌و نامەی ئاسمانیمان دانا لە نـاو نەوەیـاندا ، ئنجـا هێندێك لەوان ڕێ‌نموونی‌یان کرد ، وە زۆریشیان بـەدکار بوون (٢٦)

لە دوای باسی ناردن‌و ڕەوانە کردنی پێغەمبەران ، ئنجا باسی ئەوە ئەکات کە بەشی زۆری گەلانی ئەو پێغەمبەرانە بڕوایان نەهێناوە ، نە بـە پێغەمبەرەکان‌و نە بە نامەکانیان ئەفەرموێ ( ولقد ارسلنا نوحا ) بەڕاستی ئێمە نووح پێغەمبەرمان نارد بۆ گەلەکەی ، وە ماوەیـەکی ئێجـگار زۆر لە ناویانا مایەوە ( وابراهیم ) دوای ئەو ئنجا ئیبراهیمی خەلیل‌مان نـارد کە لە نەوەی حەزرەتی نووحە ، وە ئەم دوانە بە باوکی پێغەمبەران ناویان دەرکردووە ، وە هەر پێغەمبەرێك کە لە دوای ئەوان هاتوون هەموو لـە نەوەی ئەوانن وەکو ئەفەرموێ : (وجعلنا في ذریتهـم النبوة والکتـاب )ـ وە پێغەمبەرێتی‌و نامەی ئاسمانیم گێڕا لە ناو نەوەی نووح‌و ئیبراهیما ، وە هـەر چوارنـامە بـە ناوبانـگەکان کـە «تـەورات»و «زەبـوور»و «ئینجیل»و «قورئان»ە لە نەوەی نووح‌و ئیبراهیم بـە دەرنی‌یـە ، بۆیـە لێرەدا هەر ئەم دوانەی بە یەکەوە باس کرد ، بەڵام ئەم نەوانـە کە ئەم هەموو پێغەمبەران‌و نامانەیان بۆ هاتووە هەموو وەك یەك نەبوون ، وەکو ئەفەرموێ (فمنهم مهتد) هێندێك لەوان ڕێ‌نموونی‌یان کرد ، وە دوای پێغەمبەرو نامەی اسمانی کەوتن ( وکثیر منهم فاسقون ) وە زۆریشیـان

ثُمَّ قَفَّيْنا عَلى آثارِهِمْ بِرُسُلِنا ، وقَفَّيْنا بِعيسَى ابْنِ مَرْيَمَ وآتَيْناهُ الانْجيلَ ،

لە پاشا دوا بەدوای ئەوانیش دیسان ڕەوانـە کراوانی خۆمانمـان نـارد وە ئنجا عیسای کوڕی مەریەمیمان نارد ، وە ئینجیلمان دایە ،

یا لەدین دەرچوون ، یا بە ناو لەو دینەدا مانەوە کە بۆیـان چووبـوو ، بەڵام هەموو جۆرە گوناهو بەدکاری‌یەکیان ئەکرد ( ثم قفینا علی اثارهم برسلنا ) لە پاشا دوای نووحو ئیبراهیمو گەلانی ئەوان ڕەوانـە کراوی خۆمانمان نارد ، وە بەم ڕەنگە لە دوای نووح «هود»و «صالح»و لە دوای ئیبراهیمو ئیسماعیلو ئیسحـاقو یەعقـوبو یوسـفمان ڕەوانـە کـرد ( وقفینا بعیسی ابن مریم ) لە پاشا پێغەمبەر لە دوای پێغەمبەر ناردمانن تـا زنجیرەی پێغەمبەرانی بەنی ئیسرائیلمان داکوژانـد بە عیسـای کوڕی مەریەم (وآتیناه الانجیل) وە ئینجلمان دایـە ، ئـەو ئینجیـلەی کە بـە سرووش بۆمان ناردووە ، کە شەریعەتی عیساو ئامۆژگاریی نەرمو شلی ئەوی تیایە ، وە ئەو ئینجیلە لە لایەکەوە تـەواوکەری کەمو کووڕیـی تەوراتو لەلایەکی‌ترەوە ئەو ئەحکامی قورسو گرانانەی کە لە سـەر جوولەکە دانرابوون لە تۆڵەی ئەو پەیمانانەی کە شکاندبوویـان ، ئـەو ئەحکامانەی لە سـەر سـووك کردبوون ، وەك قورئـان ئەفـەرموێ : «فبظلم من الذین هادوا حرمنا علیهم طیبات احلت لهم» (١) .

(١) واتە بە هۆی ستەمی جوولەکەکانەوە ئێمە زۆر نازو نیعمـەتی پاکیزە کە لەوەپێش بۆیان حەڵاڵ بوو لێمان قەدەغە کردن .

وَجَعَلْنا في قلوبِ الَّذينَ اتَّبَعوهُ

رَأْفَةً وَرَحْمَةً ، وَرهبانِيَّةً ابْتَدعوها ،

وە لە دڵی پەیڕەویی کەرانی ئەوا میهرەبانیو دڵنەرمیمان دانا ، وە ڕەبەنی (و ، دەست لە دنیا هەڵگرتن)یان داهێنا ،

لێرەدا ئنجا باسی سیفەتێکی ئاشکرای ئوممەتی حەزرەتی عیسا ئەکات ئەفەرموێ ( وجعلنا في قلوب الذين اتبعوه ) گێڕامان لە دڵی ئەوانەی کە دوای عیسا کەوتوونو بڕوایان پێ هێناوە ( رأفة ) میهرەبانی لەگەڵ یەکتریدا ، بە جۆرێك کە ئازار لە یەك دوور بخەنەوە ( ورحمة )[1] وە دڵ نەرمیو بەزەیی هاتنەوە بە یەکتریدا ، بە جۆرێك کە چاکەو خۆشیی یەکتریان بوێ ، بەڵام ئوممەتەکەی حەزرەتی عیسا دوای ئەوەی کە زۆر دارانو ستەمکاران دەستیان کرد بە ئازار دانو سزادانیان ، گۆشەگیرییو ڕەبەنییان لە سەر خۆیان نەزر کرد ، وە دەستیان کرد بە خوا پەرستی لە ناو دێرو ئەشکەوتو چۆڵو بیابانا ، وە جلو بەرگی زبریان ئەپۆشیو خواردنی زبریان ئەخواردو ژن هێنانیان لە خۆیان قەدەغە کرد ، وەکو ئەفەرموێ (ورهبانية ابتدعوها)[2] وە گۆشەگیرییو

(١) ئەم رأفەتو ڕەحمەتەی کە حەزرەتی عیسا فەرمانی پێ داوەو داوای کردووە لە ئوممەتەکەی لە کاتێکا کە لە ژێر باری توندو تیژییو ئێشو ئازاری جولەکەو ڕۆمانەکانا ئەیاننالاند ، ئێستا کوا ئەونەرمییو بەزەیی هاتنەوەیە لە ناو داگیرکەرانا ، بەڵکو بە پێچەوانەی ئەوە ، بوون بە شەیتان بۆ هەموو دانیشتوانی سەر زەوی .

(٢) وەك ئەم ڕە(هبانێتە) وایە کە خوا زەمی ئەکات ، زۆر شت کە لە ئیسلامەتیدا نینو زیاد کراوون لە دین .

ما كَتَبْناها عَلَيْهِمْ اِلاّ ابْتِغاءَ رِضْوانِ اللهِ فَما رَعَوْها حَقَّ رِعايَتِها فَآتَينا الَّذينَ آمَنوا مِنْهُمْ

ئێمە ئەوەمان لە سەردانەنابوون ، بەڵام خۆیان دایانهێنا بۆ ڕەزامەندیی خوا ، ئنجا وەك پێویست بوو ئاگاداریی ئەو ڕەبەنی یەیان نەکرد ، ئێمەش بەخشیمان بەوانەی کە بەڕاستی بڕوایان هێنابوو لەوان

ڕەبەنی یەك کە خۆیان دایانهێنابوو (ماكتبناها علیهم) ئێمە ئەو گۆشەگیری یەمان لە سەر دانە نابوون ( الا ابتغاء رضوان الله) بەڵام بۆ ڕەزامەندیی خوا ڕێی ئەم گۆشەگیری یەیان گرت ، وە نەزریان کرد لە سەر خۆیان ، کە بەمە ئەو گوشەگیری یە پێویست بوو لە سەریان ، ئنجا ئەمانە تا پێشینانەکانیان بوون ئاگاداریی ئەم گۆشەگیری یەیان ئەکرد بە پاکی ، وە بەڕاستی بە جێیان ئەهێنا ، بەڵام لە پاشا کە دوورکەوتنەوە لە سەرچاوەی دینەکەیان ئەو ئاگاداری یەیان نەکرد ، وە گوشەگیری یەکەیان بوو بە ڕووپامایی و چاوەی مەردوم «ریاء» وەکو ئەفەرموێ (فما رعوها) ئاگاداریی ئەو گۆشەگیری و ڕەبەنی یەیان نەکرد (حق رعایتها) بەو جۆرەی کە پێویست بوو ، واتە دوو گوناهی گەورەیان کرد •

یەکەم : گۆشەگیریی لە دینەکەیانا نەبوو، ئەوان لێیان زیاد کرد لە خۆیانەوە، بێ ئەوەی کە خوا فەرمانیان پێ بدات •

دووهەم : ئەوی خۆیان لە سەر خۆیانیان نەزر کرد ـ کە ئەبوو بە پاکی بی کەن ـ نەیان کرد، کە ئەمە بێموبالاتی نیشاندانە بە دینەکەیان ( فاتینا الذین آمنوا منهم ) ئێمەش بەخشیمان بەوانەی کە بەڕاستی

أَجْرَهُمْ وَكَثِيرٌ منهم فاسِقونَ (٢٧)
يا أَيُّهَا الَّذينَ آمَنُوا ، اتَّقُوا اللهَ وَآمِنوا بِرَسُولِهِ ،

---

پاداشی خۆیان ، وه زۆریشیان بەدکارن (٢٧)
ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە ! لە خوا بترسن‌و بڕوابێنن بە ڕەوانە کراوی خوا ـ کە محمدە ـ

---

بڕوایان هێنابوو لەوان، وه دینەکەی خۆیان تێك نەدابوو، وه لایان نەدابوو ( اجرهم ) پاداشی خۆیان ( وكثير منهم فاسقون )وه زۆریشیان بەدکارن کە وا زۆر شتی هیچ‌و پووچیان لە دینەکەیان زیاد کرد، وه زۆر گرنگیشیان لێ شاردەوە •

★ ★ ★

ئنجا زۆر بە جوانی ، وه لە پەردەدا گەیاندی کە زۆر لە گاوورەکان دەستیان داوەتە تێك‌دانی دینەکەیان، بە لێ زیاد کردن‌و لێ‌وون کردنی، وه ئادەمی پێویستن بە ئاینێکی تازەی پاك‌و تەمیز ـ کە ئیسلامە ـ وه وەختی ئەوە هاتووە ئەو پێغەمبەرەی کە عیساو مووسا مژدەیان داوە بە هاتنی ـ کە حەزرەتی محمدە ـ بنێرێ بۆ تازە کردنەوەی شەریعەتی خوا، فەرمووی ( یا ایها الذین آمنوا ) ئەی ئەو کەسانەی کە بڕواتان هێناوە بە مووساو بە عیسا، وه بەتەورات‌و ئینجیل ( اتقوا الله ) لە خوا بترسن ( وآمنوا برسوله )وه بڕوابێنن بە ڕەوانەکراوی خوا کە حەزرەتی محمدە، وه کار بەشەریعەتەکەی بکەن وه لێی لامەدەن

يُؤْتِكُمْ كِفْلَيْنِ مِن رَحْمَتِهِ ، وَيَجْعَلْ لَكُمْ نُوراً تَمْشُونَ بِهِ ، وَيَغْفِرْ لَكُمْ ، وَاللهُ غَفُورٌ رَحِيمٌ (٢٨)

---

تا دوو بەشتان بداتێ لە میهرەبانیو بەخشایشی خۆی ، وە ڕووناکی‌یەکتان بداتێ کە ڕێنموونی پێ بکەن ، وە تا لە گوناهتان خۆش بێ ، وە خوا خۆشبووی میهرەبانە (٢٨)

---

( یؤتکم کفلین من رحمته ) تا دوو بەشتان بداتێ لە ڕەحمەتو میهرەبانیی خۆی ، بەشێکتان بەرانبەر بەوەی کە بڕواتان هێناوە بە پێغەمبەرانی پێشوو، بەشێکیشیان بەرانبەر بە بڕواهێنانتان بە حەزرەتی محمد ، ( ویجعل لکم نورا )وە ڕووناکی‌یەکتان بداتێ لە ڕۆژی دوایىدا ( تمشون به ) کەڕێ نموونی پێ‌بکەن ، وەڕێی بەهەشتی پێ بدۆزنەوە ( ویغفر لکم ) وە تا لە گوناهانی پێشووتان خۆش بێ ( والله غفور رحیم )وە خوا لێخۆشبوو میهرەبانە .

خاوەن نامەکان وایان ئەزانی کە خۆیان گەلێکی هەڵبژاردەی تایبەتین، وە کوڕی خواو خۆشەویستی ئەوون، وەك قورئان لە زبان ئەوانەوە بۆمان ئەگێڕێتەوە بە ئایەتی « نحن ابناء الله واحباؤه »(١) وە هەر ئەوان ئەچنە بەهەشت، وەك قورئان ئەم بیرو باوەڕەیانمان بۆ ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێ « وقالوا لن یدخل الجنة الا من کان هودا او

---

(١) واتە : ئێمە کوڕانی خواو خوشەویستی ئەوین .

لِئَلاَّ يَعْلَمَ أَهْلُ الكتابِ أَلاَّ يَقْدِرونَ على شَيْءٍ مِـــن فَضْلِ اللهِ

( بەڵێنەکەی پێشوومان دا) تا ئەو خاوەن نامانەی (کە بڕوایان بــە محمد نەهێناوە) تێبگەن کە ئەوان هیچ بەخشش‌ێـکی خوایـان دەسـت ناکەوێ ( تا بڕوا بەو نەهێنن )

نصاری »[٢] وە بەو هــەر ڕەنــگە لایان وابوو کە هەر گەلی جوولەکـە پێغەمبەری تیاهەڵ ئەکەوێ، وە لە هیچ گەلێکی‌ترا هــەڵ ناکەوێ، ئنجا خوا ئەم گومانەی بردنە دواوە، وە بە ئایەتی پێشوو بانگی ئەوانەی کرد کــە بڕوایان بـــە پێغەمبەری ئیسلام نەهینا بوو، بۆ ئەوەی پێیان بڵێ : لە خوا بترسن‌و بڕوا بە پێغەمبەری ئیسلام بێنن، تا خوا پاداشتان بداتەوە بەو پاداشانەی کــە لـــە ئایەتی پێشوودا باس کران، ئنجا بەڵێنەکــەی پێشوومان دا بەو گاوورو جوولەکانەی کە بڕوا بە پێغەمبەری ئیســـلام بێنن بە ئایەتی « یوتکم کفلین من رحمته ، ویجعل لکم نورا تمشون به ویغفر لــکم » ( لئلا یعلم اهل الکتاب )تا خاوەن نامەکان لــەو گاوورو جوولەکانەی بڕوایان بە حەزرەتی محمد نەهێناوە ـ تێبــگەن[١] ( الا یقدرون علی شیء من فضل الله )کە ئەوان هیچ میهرەبانی‌و فەضلێــکی

(٢) واتـــە جوولەکەو گاوورەکان ووتیان کـــەس ناچێتە بەهەشت جوولەکە یا گاوورنەبێ ، واتە جوولەکە ئەی‌ووت : هەرجوولەکە ، گاوور ئەی‌ووت : هەرگاوور ئەچێتە بەهەشت .

(١) بەم‌تەفسیرە دەرکەوت کە (لا) لە (لا یعلم)دا زیادە .

وَأَنَّ الفَضْلَ بِيَدِ اللهِ يؤتيه مَنْ يَشاءُ ، والله ذو الفَضْلِ العَظيمِ (٢٩)

---

وە هەرچی بەخشش هەیە بەدەست خوایەو ئەی‌بەخشێت بە هەر کەسێك کە خۆی بی‌یەوێ ، وە خوا خاوەنی بەخشش‌و میهرەبانیی بێ‌پایانە (٢٩)

---

خوایان دەست ناکەوێ تا بڕوا بە محمد نەهێنن، وە بڕوای جارانیان بە مووساو بە عیسا کەڵکیان ناگرێ بە بێ ئەم بڕوایە ( وان الفضل بيد الله )وە هەرچی فەضڵو نیعمەت هەیە هەمووی بە دەست خوایە ( يؤتيه من يشاء ) ئەی بەخشێ بە هەرکەسێك کە خۆی بێ‌یەوێ، وە هەرگیز کورتی هەڵناهێنێ لە سەر گەلێك، یا لە سەر دەستەیەك ( والله ذو الفضل العظيم )وە خوا خاوەنی فەضلو میهرەبانی بێ‌پایانە، خوا لە بەخشش‌و میهرەبانیی خۆی بێ‌بەشمان نەکات •

**تەواو**

(١)

مەلا ئەحمەد مەحموود حەمدی خاوەنی کتێبخانەی (هدی ـ هودا) لە سلێمانی پیاوێکی دڵساف‌و سادەو ساکارو ڕەواگۆیە ، بۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام « ئیخلاص »و دلسۆزیی تیا بەدی ئەکرێت • جا بۆ بەدی هێنانی ئەندازەیێ قازانج‌و دەستکەوتێکی مادیی دنیایی لە ڕێگای «مەشروع»ەوە ، وە بۆ سوودی سەد چەندانەی لایەنی خوایی ، چاکی مەردانەی کرد بە لاداو ـ لە پاش ڕێکەوتن‌و پێکهاتنی لەگەڵ بنەماڵەی (خاڵ)ی خوالێخۆشبوودا ـ لەسەر ئەرکی خۆی دەستی دایە بڵاو کردنەوەی ئەم تەفسیرە • ئەویش وەکو دۆستێکی دێرینەسال‌و میانەیی ڕابوردوومان ، بۆ سەرپەرشتی کردنی چاپەکەی پەناو هانای بۆ هێنام ، بەو هیوایەی کە بیگرمە ئەستۆی‌خوم‌و ، بە جوانترین شێوەو وێنە بیرازێنمەوە ، بۆ ئەوانەی کە وزمو تەوژمی خواپەرستی‌یان تێدایەو ، عاشق‌و شەیدای قورئانی پیرۆزن ، منیش بۆ جێ بە جێ کردنی داواکەی‌و بۆ بەدی‌هێنانی هیواکەی بەڵێنم دایە ، ئەوەتا وەك ئەی‌بینی سوپاس بۆ خوا بە باشترین دیمەن‌و ، بە بێ هەڵەو خواریی‌و چەوتی کەوتە بازارەوە •

ئەپاڕێمەوە لە خوای گەورە بە میهرەبانیی خۆی بمانخاتە سەر ڕێگای ڕزگاری‌و ئەنجامی دنیامان بە باش بگێڕێ‌و لە دەریای بەخشندەیی خۆی بێ‌بەشمان نەکات « ولیس ذلك علی الله بعزیز » •

## (٢)

خوێنەری بەڕێز !

دانەری ئەم تەفسیرە پیرۆزو بەنرخە بە شێخ محمدی خاڵ بە ناوبانگەو ، کوڕە زای شێخ ئەمینی (خاڵ)ە ، ئەم بنەماڵە ڕەوشت بەرزو ئایین پەروەرە لە سەرەتای دروست بوونی شاری سلێمانی‌یەوە تیایدا نیشتەجێ بوونو ، هەر لــە کۆنەوە ئەوشوێنەی ئێستایان بووە بە ئارامگایان .

زنجیــرەی بنەماڵەکەیان لــەو پەڕی نەژادپاکی‌و بێ‌گـەردی وشکۆمەندی دایەو ، بە ڕەگ‌و ڕیشە ئەچنەوە ســەر عەللامەی بــە ناوبانگ مەلا «ابو بکر»ی «مصنف» .

ئەم زنجیرە تانو پۆ ڕەسەنە لە ڕۆژگارانی دێرینەیانەوە پشــتاو پشتو چیـــن لــە دوای چینیان ، بە زانینو تەقواو خوا پەرستی‌یەوە ناسراون ، لە هەموو سەردەمێکدا لە بەر بەرزێتی پلەو پایەی ئایینی‌و دنیایی‌یان بە شانازی‌یەوە پەنجەی ڕیزیان بۆ درێژ کراوەو ، بە لوتــکەو ســەرتۆپ کەوتوونەتــە بەرچـــاو ، جێـــگای بڵـندی‌کۆمەڵایەتی‌یانو شوێنەواری بەرزی ڕۆشنیان بە زەقی دیارە .

شێخی (خاڵ) ـ بە ڕەحمەتو میهرەبانیی خـــوا شادبێ ـ لـــە سەرەتای ژیانی‌و سەردەمی منالیدا باوکی بەڕێزی بە گەنجی کۆچـــی

دوایی‌و ماڵاوایی ئیجگاری لە ژیان ئەکاو ، ئەمیش هەتیو ئەکــەوێ ، بەڵام شێخی باپیری زۆر بە سۆزو بە بەزەیی‌یەوە ئەیگرێتە خــۆی‌و ، دڵنەوایی ئەکاو نایەڵێ هەتیویی‌و بێ‌نازی بێ باوکێتی پێوە دیار بێ ، بە چــاودێریی ڕاســتەو خــۆی‌و لە کــۆشی نازو ڕێــزو خۆشــەویستیدا پەروەردەی ئەکاو پێی ئەگەیەنێ‌و لە خەم ئەڕەخسێ •

(خاڵ) هــەر بە منداڵی ـ بە پێی یاساو ڕەوشتی بنەماڵەکــەی ـ عەشق‌و شەیدای خوێندن‌و زانین ئەکەوێتە مێشکی‌یەوە ـ بە ماوەیەکی کەم یا زۆر ـ بە سەرکەوتووانەو بە پلەی باڵاو «ئیمتیاز» هەمە بابەتەکانی ئەو سەردەمە تەواو ئەکــا ، لە ئەنجامدا ، لای عەللامەی بە ناوبانگ شێخ عومەری قەرەداغی ڕەزای خوای لێ بێ ئیجازە وەرئەگرێ •

خوای گەورە لــە دنیــادا بە میهرەبانیی خۆی لە گۆشەی ژیان‌و کۆمەڵایە تیدا بەرێزو بڵندی‌یەوە ـ بە ئاشکرا ـ ئاوڕی لێ دایەوە ، فەڕو خێرو بەهرەی دنیــایی بە ســــەردا ڕشت‌و خستی‌یە ســــەر ڕێــگای بەختەوەری‌و شکۆمەندیتی‌و ، پلەو پایەی بەرزێتیی پێ ڕەوا بینی‌و پێی بەخشی ، هــــەتا سەرەتای هەشتاکان ، نەیزانی بێ‌نەوایی‌و نەدارایی چی‌یە ، دوور بوو لە هەموو کۆسپ‌و کۆستێکی دنیــایی ، لــــە توێی ئارامی‌و خۆش‌بەختیدا بەوپەڕی مــــەزنایەتی‌و ڕێزو شکۆوە دنیــــای تێپەڕان ، بەڵام لە هەشتاکاندا هــەتا ڕۆژی لە دنیا دەرچوونی خــوای گــەورە تووشی بێ‌بینایی کردو چــاوە گەشە جوانەکانی سۆمــــایی‌و ترووسکایی‌یان نەماو ، دەردو بەڵا پەی دەر پەی دەرگای پێ گرت‌و ئازاری زۆری بە خۆیەوە دی‌و ماوەیەکی زۆر لە سەر جێی کەساسی مایەوە •

لەدوای تەواو کردنی پلەکانی خوێندنی‌و ئیجازە وەرگرتنی ، میری

ڕووی لێ ناو بووبه سەرۆکی دادگای «شەرعی»و بە قازیو « حـاکمی »
ئەو دادگایە •

خوالێخۆشبوو هەتا لە دنیادا بوو مزگەوتەکەی باپیری بەجــێ نەهێشت ، هەمیشە هاتو چۆکەرانی کۆمەڵ کۆمەڵ وەکو پەروانە لــە حوجرەی مزگەوتەکەدا لە دەوری چرای ڕوخساری کۆ ئەبوونەوە • بـە نەرمیو بە وردیو بە هێواشیو بە ئارامی بە شنەی وتەی وەك گەوهەرو مرواری دڵو دەروونی دانیشتوانی دەوری خێنك ئەکردەوە ، نەیئەزانی تورەییو هەڵەشەیی چییە ، هەرگیز بە ناوهێنانی هیچ کەسێك بــە خراپە دەمی نەکردۆتەوە ، بەم دەمپاکیو دەستپاکیو گیانپاکییە ژیانی بردە سەرو ، بە سەربەرزی لەم دنیایەیدا ڕۆژگارانی پێچایەوە ، لــە ماوەی ئەم ژیانەیدا نەلایەنی خوایی بەرداو ، نە وازی لــە گــەلو نیشتمانەکەی هێنا ، لە پێنـاوی بەرژەوەندیی تـایبەتی خـۆیدا بـیرو باوەڕی دنیاییو وخوایی نەفرۆشتو نەچوە کۆشی هیچ ناڕەواییەکەوە هەزاران هەزار ڕەحمەتی خوای لێ بێ بە سەربەزی دنیای بردەسەرو ، بە سەربەستی ژیاو بە بێگەردی ئێمەو بنەماڵەکەی بەجێ هێشت ، تا لە ڕێـگای « گردی سەیوان »ەوە لە ١٩٨٩ز دا بەرەو تەختی پەروەردگار ڕۆییو لەوێدا خێوەتی ئارامگای هەڵدا ( سلام عليه يوم ولد ويوم يموت ويوم يبعث حيا ) •

خوالێخۆشبوو هەمیشە لە ژیانیدا کۆڵی نەدا لە نووسین ، لــە هەمەبابەتەکانو بوارەکانی دینیو دنیــایی ئەنووسیو بە سەرلاپەڕەی ڕۆژنـامەو گۆڤـارەکانەوە بــە مەردومانی ڕاتـەگەیاند ، «تەئلیفات»و دانراوەکانی زۆر زۆرە ، بە داخــەوە لێرەدا لەبەر تەسکیی مـەودامان زنجیرەی کتێبەکانی نەنووسرانەوە •

بریار بوو بەڕێز شێخ خالیدی کوڕی نووسینێکی باوکی کــە لــە ژیانی خۆیو بنەماڵەکەیدا نووسیبووی ، لەگەڵ نووسینێکی خۆیکە لــە ســـەر ژیانی باوکی خوالێخوشبووی نوسیبووی بۆم بنێرێو ، منیش لێرەدا بڵاوی بکەمەوە ، ئەویش بە دەوری خۆی دابوونی بە مەلا ئەحمەد کە ئەویش بیــانێرێ بۆ بەغــداو لەم تەفسیرەدا بڵاویــان بــکەمەوە ، بە داخەوە نەهاتو نەهات .

خوێنەری بەڕێز ئەم تەفسیرە هەر بەو شێوەیەو بەو ئیملایەو بەو نووسینە کـــە دانــەری خوالێخوشبوو نووسیبوونی بـــە بێگۆڕانو دەستتێخستنی کـــەوتە بە ردەستتان ، بەڵام ناو بە ناو لـــە ناوەندی تەفسیرەکەدا وە یا لە دامێنەکەیەوە بەپیتی (م)ی تەنیا وە یا : بەنــاوی (م ـ ئەردەڵانی)یەوە کە ڕەمزە بۆ ناوی من ، پەراوێزم لە سەر نووسیوە ، واتە هــەر پەراوێزێك لــەم تەفسیرەدا گۆتایی بــەو ڕەمزە هاتبێت ئەوە پەراوێزی منە ، ئەویکەی پەراوێزی دانەرمو هی خۆیەتی .

زۆر تێکۆشاومو ڕەنجم دا بۆ ئەوەی بە بێ هـــەڵە بـــکەوێتە کتێبخانەکانەوە . سوپاس بۆ خوا لەم ڕووەوە سەرکەوتنم بەدی هێنا .

محەمەد ئەمین حەبیب سەعید
ئەردڵانی
٣ـ١١ـ١٩٩٠

## (٣)

له پێشەوە باسی ئەوەم کرد کـە بە تەما بووم دوو نووسینەکەی کوڕو باوك ( شێخ خالیدو خاڵی خوالێخۆشبووی باوکی ) بگاتە دەستمو لـە سەرەتاوە بنووسرێنو جێـــگای سروشتیی خۆیان وەرگرن ، بـە داخەوە کاتی هاتنیان بـــە هۆی کۆتایی کارەکەمانەوە مـــەودای بڵاو کردنەوەیان نەما بوو ، له ئەنجامـــدا بـە هـــەرچۆنێ بوو ڕێـــگای تێهەڵکێشێکم بۆ کردنەوەمو هەریەکەیان بە کورتەیەك لـــە کتێبەکەدا ڕوخساریان هەڵهێنا ٠

یەکـــەم :

ـ خاڵی خوالێخۆشبوو ـ وەکو بە قەڵـــەمی خۆی نووسیویەتی زنجیرەی نەژادی بە نۆ پشت ئەگاتەوە سەر عەملامەی بە ناوبانگ مەلا ( ابو بکر )ی (مصف ) ، کە لە ساڵی (٩٩٤ك) لە دنیـــا دەرچـــووە ٠

ـ ناوی باپیری سێهەمی شێخ محەممەدی خاڵەو ، خوا لێخۆشبوو بە ناوی ئەودوە ناو نراوە ٠

ـ لە ساڵی (١١٩٩ك ـ ١٧٨٤ز) لە گەڵ بنەماڵەی باباندا ـ کاتی بونیات نانی شاری سلێمانی ـ باپیری پێنجەمی (شێخ موستەفا) دێ بۆ ئەم شارەو بەکارو باری تەدریسەوە تیایدا نیشتەجێ ئەبێ ٠

ـ خاڵی خوا لێخۆشبوو لە ساڵی (١٣٢٢ك ١٩٠٤ز) لـــە دایك بووەو لە تەمەنی نۆساڵیدا شێخ عەلیی باوکی لە دنیا دەرئەچێ ، شێخ

ئەمینی باپیری پەروەردەی ئەکاو نازی ئەداتێو لای مەلا بە ناوبانگەکانی سلێمانی هەموو بابەتەکانی ئەو ڕۆژو ڕۆژگارە ئەهێنێتە کۆتایی ٠

ـ لە (١٣٥٠ك ١٩٣١ز) باپیری لە دنیا ماڵاوایی ئەکات ، لە لایەن ( احمد توفیق ) بەگی پارێزەری ئەو سەردەمەی سلێمانی لـــە شوێنی باپیریا بـــە ڕەسمی ئەیــکا بە جێنشینیو ، بە مـــەردانەو پیـــاوانە کاروباری مزگەوتو ئاوەدان کردنەوەی ئەخاتە ئەستۆی خـۆیو بـــە تەدریسەوە خۆی خەریك ئەکا ٠

ـ خوا لێخۆشبوو دەست ئەکا بە موتاڵاو لێکۆڵینەوەی هەمـــە بابەتەکانی ئایینی مێژوییو کۆمەڵایەتی ٠٠

وتەکانی محمد عبدەو شێخ ڕەشید ڕەضاو (جمال الدین)ی ئەفغانی کاریان تێ ئەکاو پەیرەوی ئاراکانیان ئەکاو ڕێبازی ڕۆشنبیریی خۆی ئەگۆڕێ ، بەوشێوەیەی بگونجێ لە گەڵ بیری نوێدا ڕێگای ئیبـــداعو داهێنان ئەگرێو کۆنی پواو لائەباو تازە ئەخاتە شوێنەکەی ٠

دەست ئەداتە قەڵەمو لە هەموو ڕوویەکەوە بە تازەترین تـــەرز ئاوڕ لە ئایینو کوردستانەکەی ئەداتەوە ، وەکو ڕۆڵەیەکی بـە وەفـاو ڕەسەن لە ڕێـگای نووسینو وتارو گوفتارەوە دەیان کـــەڵێن ئەگرێو ناوچەکە پڕ ئەکا لـــە عیلمو هونـــەرو داهێنان ، تەئلیفاتەکانی وەکو ئەستێرە بە ئاسمانی کوردەوارییەوە ئەدرەوشێنەوە ٠

لە ١٩٣٩دا لە دادگایەکی دادگاکانی عیراقدا کرا بە قاضی ، لـــە هەڵەبجەو چەمچەماڵو سلێمانیو کەرکوك دەوری وەزیفەی بینێ ، ئنجـا بووبە ئەندامی ئەبخومەنی دادگای تەمیز لـــە بەغـــداداو لە ١٩٦٧دا لەوەزیفە کەنارەگیر بوو ٠

له ١٩٥٤دا له كوڕى زانياريى عيراقدا كرا به ئه‌ندام .

له سالانی سی‌یه‌كانه‌وه به نووسینی هه‌مه‌چه‌شنه‌و هه‌مه‌بابه‌ته‌وه سه‌رگه‌رم‌بوو ، نه‌ی‌ئه‌زانی كوڵدان چی‌یه .

له‌و سه‌رده‌مه‌دا نووسینی كوردی زۆر ناته‌واوو كاڵو كرچ بوو ، له موصطه‌له‌حات‌و زاراوه‌ی زانستی‌یه‌وه دوور بوو ، به دڵسۆزی توانی بنه‌ڕه‌تی بۆ دابنێ‌و ، به كارامه‌یی‌و وه‌ستایانه زه‌مینه‌ی بۆ سازان‌و ، نووسینی كوردیی خسته قاڵب‌و قه‌واره‌یه‌كی پێشكه‌وتوانه‌وه ، توانی ئه‌ده‌بی كوردی له كه‌م‌وكووڕی ڕزگار بكاو خه‌وشی نه‌هێڵێ .

له سالانی ١٩٤٣ز ده‌ستی داوه‌ته ته‌فسیر كردن له قورئانی پیرۆز ، كه دواهه‌ڵقه‌ی زنجیره‌یان ئه‌م ته‌فسیره‌یه به داخه‌وه مه‌رگ ده‌ستی نایه بینی‌و نه‌ی‌هێشت زنجیره‌ی ته‌فسیره‌كه‌ی ته‌واو بكا .

ته‌ئلیف‌و نووسینی ئیجگار زۆره ، له ژیانی خۆیدا زۆری لێ بڵاوكردنه‌وه‌و ، هه‌ندێكیشیان چاپ نه‌كراون ، ئومێده‌وارم به ڕێز شێخ خالیدی كوڕی به چاپیان بگه‌یه‌نێ‌و نه‌هێڵێ ببنه خوراكی مشك‌و مورانه .

ده‌رباره‌ی نووسینه‌كه‌ی كاكه شێخ خالیدی خاڵ مه‌ودای نووسینی نه‌بوو بڵاوی بكه‌مه‌وه ئه‌بێ به میهره‌بانیی خۆی ببوورێ لێم ده‌لگیر نه‌بێ .

محمد امين ـ ئه‌رده‌ڵانی
١٢ـ١١ـ١٩٩٠

# مصادر

## سەرچاوەکانی تەفسیری خاڵ


١ ـ تەفسیری « منار » هی سید ڕەشید ڕەزا ٠

٢ ـ تەفسیری شێخ محمد عبده ٠

٣ ـ تەفسیری سید قطب ٠

٤ ـ تەفسیری شێخ أحمدی مەراغی ٠

٥ ـ تەفسیری جمال الدین قاسمی ٠

٦ ـ تەفسیری محمد عزه دروزه ٠

٧ ـ تەفسیری قورئانی پیرۆز ، نووسینی
( محمود محمـــد حمزه ،
حسن علوان ، محمد أحمد برانق ) ٠

٨ ـ تەفسیری عبدالقادر مغربی ٠

٩ ـ تەفسیری ئەحمەد مظهر العظمة ٠

١٠ـ گۆڤاری نورالاسلامی جامع الازهر ٠

# ناوەرۆكی جزمی «ذاريات»

| لاپەڕە | بابەتەکان |
|---|---|

| لاپەڕە | بابەتەکان |
|---|---|

★ ★ ★

## تکایە پێش خوێندنەوەی ئەم هەڵانە ڕاست بکەرەوە

| لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاست |
|---|---|---|---|
| ٧ | ١٤ | ولآت | ولآتو |
| ٩ | ٧ | دەسووتێزین | دەسووتێنرێن |
| ١٩ | ٦ | هەلبژێری | هەلبژێرێ |
| ١٩ | ١١ | بەمەستێکی | بە مەبەستێکی |
| ٢٥ | ١٣ | هەرشتێا | هەرشتێکا |
| ٣٨ | ٢ | نیرو | نێرو |
| ٤٦ | ٦ | پشەی | پیشەی |
| ٦٥ | ٤ | پەروەردگاگاری | پەروەردگاری |
| ٦٥ | ٩ | بەم | بەمو |
| ٦٦ | ٥ | بێهێنێ | بی‌هێنێ |
| ٩٦ | ٢٠ | کەسێ | کەسی |
| ١٠٦ | ٤ | ئەم دێڕە بە تەواوی پیشوودا بوایە · | ئەبوایە لە لاپەڕەی |
| ١١٥ | ١٥ | یەیی | پەیی |
| ١٢٣ | ١٦ | کراوندا | کراواندا |
| ١٣٠ | ١٩ | قدردا | قەدەردا |
| ١٥٤ | ٥ | زوی | زەوی |
| ١٦٠ | ١٤ | (١) | (٢) |
| ١٦٩ | ١٩ | حسن | حسان |
| ١٩٠ | ٦ | تەوای | تەواوی |
| ١٩٣ | ١٥ | لعلکم | لعلی |
| ٢٥٠ | ٣ | ما | یا |

# لەم تەفسیرەدا

هەموو لاپەڕەیەك چەندەی قورئان بەربكەوێ ، ئەوەندە لە سەری لاپەڕەكەوە نوسراوە ، ئنجا خـەتێك كێشراوە ، وە وەرگێـڕاو « تەرجـەمە »كەی لەژێرا نووسـراوە ، دوای ئەوە خەتێكی‌تر كێشراوە تەفسیرەكەی نووسراوە .

هەموو ئایەتێك سەرەتایەكی وای بۆ نوسراوە كە مەبەس لە ئایەتەكە ڕوون ئەكاتەوە ، بەجۆرێكی وا كە هەموو خوێندەوارێك تێ‌بگات كەچی ئەفەرموێ ، وە پەیوەستیی چی‌یە لەگەڵ ئایەتی پێشوودا .

لەهەمووی جوانتر ئەوەیە كە تەفسیرەكە لەگەڵ قورئانەكەدا جۆش‌دراوە ، هەروەك تەفسیرەكە خۆی لەگەڵ خۆیا جۆش‌دراوە، لەگەڵ ئەمیشمە كە بەكوردی‌یەكی پەتی ڕەوانی وا نوسراوە كە هەمووكەسێك تێی‌بگات .

جا كەوابوو ئەی كوردی مەرد تەفسیری قورئانە پیرۆزەكەت بەووردیی بخوێنیتەوەو دڵی بۆ بكەرەوە ، وە تا تەفسیری ئەم جزمە ئەخوێنیتەوە ـ خوا یاربێ ـ جزمێـكی ترت بۆ لەچـاپ ئەدرێ ، وە جزم بە جزم پێشكەشت ئەكرێ .

نرخی : پێنج دینارە



چاپخانەی (الحوادث) ـ بەغدا ـ ١٩٩٠ ـ ت ٤١٥٢٦٨٥